

* ناوی گۆڤار: ئەکادیمی.
* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی.
* سەرپەرشتیی هونەری و بەرگ: عوسمان پیرداود.
* ڕێکخەری بابەتەکان: شیلان جەلال.
* پیت چنین: عەبدولحەمید عەزیز ڕەسوڵ - ظاهر عمر ولی.
* هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.
* تیراژ: ٥٠٠ دانە.
* چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر ٢٠٠٩

## ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
## لە گۆڤاری (ئەکادیمی) کوردی دا

گۆڤاری ئەکادیمی گۆڤارێکی وەرزییە. لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستانی عێراق، بڵاو دەکاتەوە. بەگوێرەی ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە، لێکۆڵینەوەکان بۆ پلەی زانستیی سوودمەند دەبن. بۆیە پێویستە لێکۆڵینەوەکان گرفت و ئاریشەکی دیاریکراو یان پێشبینی کراو، چارەسەر بکەن و، بیرو هزرێکی ڕەسەن یان تازە لە خۆ بگرن، یان لایەنێکی زانستی بدۆزنەوە. نابێت لێکۆڵینەوەکان لە هیچ گۆڤارێکی دیکە بڵاو کرابنەوە یان پەسەندی بڵاوکردنەوەی لەسەر درابێت.

## ڕێنماییەکانی تایبەت بە شێوە و ناوەڕۆک و پێکهاتووی لێکۆڵینەوە

(١) لێکۆڵینەوەکە، بە چوار دانە، لەسەر کاغەزی سپی پێوانە (A4)، بە مەرجێک لە هەر چوار لاوە، دووری (٢,٥)سم بەجێ هێشترابێت، دەنێردرێت. ژمارەی گشت لاپەڕەکانی لێکۆڵینەوەکە، بۆ زانستە ڕووتەکان و پراکتیکییەکان لە (٢٠) لاپەرە تێپەڕ نەکات و، لێکۆڵینەوە زانستە مرۆییەکانیش، بە وێنە و خشتەکانیانەوە، لە (٢٥) لاپەڕە پتر نەبێت.

(٢) لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچێک هەبێت، ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە و ناو و شوێنی کارکردن و پلەی زانستی و کار و وەزیفەی لێکۆڵەر، لە خۆ بگرێت.

(٣) زمانی بڵاوکردنەوە، زمانی کوردییە، بەڵام لێکۆڵینەوە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاو دەکاتەوە. کورتەی لێکۆڵینەوەکەش **Abstract**، بە هەر سێ زمان دەبێت.

(٤) ناوەڕۆک و پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە بەم جۆرە دەبێت:

أ) ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە، بە شێوەیەکی کورت و پوخت و گشتگیر، لە ناوەڕاستی سەرووی لاپەڕەی یەکەم، دادەندرێت.

ب) کورتەی (**Abstract**) لێکۆڵینەوەکە، بە دوو زمانەکەی تر دەبێت، کە لێکۆڵینەوەکەی پێ نووسراوە، بەمەرجێک لە (١٥٠) وشە تێپەڕ نەکات و ئەو ئامانج و ئەنجامە لە خۆ بگرێت، کە لێکۆڵەر پێی گەیشتووە.

(ج) پێشەکی و ناوەڕۆک و ئەنجام.

(٥) شێوازی سەرچاوەکان لە پەراوێزدا:

أ) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە کتێب وەرگیرا، ناوی نووسەر یان دانەر بەبێ پاش و پێش، ناونیشانی تەواوی کتێبەکە، ناوی بڵاوکەرەوە، چاپ (جگە لە چاپی یەکەم)، شوێن و ساڵی چاپکردن، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

ب) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە لێکۆڵینەوە وەرگیرا، ناوی لێکۆڵەر، ناونیشانی لێکۆڵەر، ناوی گۆڤار، ژمارەی گۆڤار، شوێن و ساڵی چاپ، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

(٦) ئەگەر لێکۆڵینەوەکە ساغکردنەوەی دەستنووسێک لەخۆ بگرێت، پێویستە ڕێوشوێنی بنەما و پرۆگرامی زانستی لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچ بکرێت.

(٧) بەرەچاوکردنی بیرۆکەی بنەڕەتی لێکۆڵینەوەکە، دەستەی نووسەران، ئەو مافەی هەیە دەستکاری هەندێ لایەنی دارشتن بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ شێوازی بڵاوکردنەوەیدا، بگونجێت.

(٨) وا باشە لێکۆڵینەوەکە لەسەر (CD) تۆمار کرابێت و چوار دانەی ڕاکێشراویش لەگەڵیدا هاوپێچ بکرێت.

(٩) لێکۆڵینەوەکە، نیشانی سێ شارەزای پسپۆری بابەتەکە دەدرێت، ئەگەر پەسەند کرا، ئەوا لەلایەن دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە، ڕەزامەندی لەسەر دەدرێت.

(١٠) ئەو لێکۆڵینەوانەی گۆڤاری ئەکادیمی بڵاویان دەکاتەوە، دەربڕین لە بیرو بۆچوونی نووسەر دەکەن، پێویستییەتی دەربڕینی گۆڤارەکە، ناگەیەنن.

**دەستەی نووسەران**

# تعليمات النشر
# في مجلة (الأكاديمي) الكوردية

المجلة مجلة فصلية. ينشر فيها النتاج العلمي من داخل وخارج اقليم كوردستان– العراق. وتكون البحوث مستوفية للتعليمات الخاصة بالنشر وتخضع للتقويم العلمي. ويتعين ان يتضمن البحث حلا لمشكلة قائمة أو متوقعة، أو يتضمن فكرة أصيلة أو جديدة أو اكتشافاً علمياً، على ان لايكون منشوراً أو مقبولاً للنشر في مجلة أخرى.

# التعلميات الخاصة

# بالشكل وترتيب البحث

١ـ يرسل البحث بأربع نسخ على اوراق بيضاء من قياس (A4) مع ترك مسافة ٥ , ٢سم من الجهات الاربعة، على ان لايزيد عدد الصفحات الكلية للبحث عن (٢٠) صفحة لبحوث العلوم الصرفة والتطبيقية وعن (٢٥) صفحة لبحوث العلوم الانسانية بضمنها الاشكال والجداول.

٢ـ ترفق بالبحث ورقة تتضمن عنوان البحث وإسم الباحث ومركز عمله، ومرتبته العلمية ووظيفته.

٣ـ لغة النشر هي اللغة الكوردية، ولامانع لنشر بحوث باللغتين العربية او الانكليزية. وتوضع الملخصات **Abstracts** باللغات الثلاث.

٤ـ يرتب البحث على النحو التالي:

أـ عنوان البحث: يتوسط أعلى الورقة الاولى، ويفضل ان يكون قصيراً وشاملاً.

ب ـ يوضح الباحث الهدف من البحث والنتائج والتوصيات المهمة التي توصل اليها.

ج ـ المقدمة والمتن والنتائج.

٥ـ اسلوب ترتيب المصادر في الهوامش.

أ ـ إذا كان الإقتباس من كتاب: يدون اسم المؤلف. بدون قلب الاسم، عنوان الكتاب بالكامل، الناشر، الطبعة، (عدا الطبعة الاولى)، مكان وتاريخ الطبع، الصفحة.

ب ـ إذا كان الإقتباس من بحث: يدون اسم الباحث، عنوان البحث، اسم المجلة الناشرة، رقم المجلة أو العدد، مكان وتاريخ النشر، الصفحة.

٦ـ حين يكون البحث تحقيقاً لمخطوطة تتبع القواعد والمناهج العلمية المعروفة، وترفق بالبحث ست صفحات من المخطوطة.

٧- تحتفظ هيئة التحرير بحقها في أن تحذف أو تعيد صياغة بعض الالفاظ، بما يتلاءم مع اسلوبها في النشر، مع مراعاة المحافظة على الفكرة الأصلية دون المساس بها.

٨- يستحسن ارسال البحث على **CD** وارساله برفقة النسخ المذكورة.

٩- يعد البحث مقبولاً للنشر، ويزود الباحث بقرار هيئة التحرير بقبوله بعد عرضه علي ثلاثة محكمين (خبراء) من ذوي الاختصاص.

١٠- ماينشر في المجلة يعبر عن وجهة نظر الباحث، وليس بالضرورة تعبيراً عن وجهة نظر المجلة.

**هيئة التحرير**

IRAQI KURDISTAN REGION
MINISTRY OF HIGHER EDUCATION
& SCIENTIFIC RESEARCH
UNIVERSITY OF SALAHADDIN - Erbil
Vice President Office
For Scientific Affair



هەرێمی کوردستانی عێراق
وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی سەڵاحەددین/ هەولێر
نوُ ئێسی یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی

ژمارە: ٢/ ٨٩٢٩

مێژووی زاینی: ٢ / ٥ / ٢٠٠٨
مێژووی کوردی: ١٠ / ٢ / ٢٧٠٨

**بۆ/ ئەکادیمیای کوردی/ بەڕێز سەرنووسەری گۆڤاری ئەکادیمی کوردی**

**ب/ رەزامەندی**

**سڵاو و رێز.............**

ئاماژە بە نووسراوتان ژمارە /٣٥٤ لە ٢٠٠٧/١١/١٩ .

دەربارەی رەزامەندی ئەنجومەنی زانکۆکەمان لەسەر ئەوەی کە گۆڤارەکەتان ببێتە گۆڤارێکی ئەکادیمی/ زانستی و پشتی پێ ببەسترێت بۆ بلاْوکردنەوەو بەرزکردنەوەی پلەی زانستی ، دوای ئەوەی کە خرایە بەردەم ئەنجوومەنی زانکۆ لە دانیشتنی کۆنووسی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی زانکۆمان ژمارە (٨) رۆژی سێشەممە لە رێکەوتی ١/ ٤/ ٢٠٠٨ بەسترابوو . وە ئاماژە بە نووسراوی وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی ژمارە ن / ٢٣٥ لە ٢٠٠٨/٥/١٧ بە پەسند کردنی بریارمان دا بەرازی بوون و پەسندکردنی وەکو گۆڤارێکی زانستی / ئەکادیمی لەگەڵ رەچاوکردنی چەند تێبینی یەکی بچووک .......... **لەگەڵ رێزدا**

**هاوپێچ//**

- تێبینیەکان

**د. محمد صدیق محمد**
**سەرۆکی زانکۆ**

**وێنەیەك بۆ//**

- نووسینگەی بەرێز سەرۆکی زانکۆ / لەگەڵ رێزدا
- نووسینگەی بەرێز یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی/ لەگەڵ بەراییەکان
- لیژنەی ناوەندی بەرزکردنەوەی پلەی زانستی لە سەرۆکایەتی زانکۆ
- دەرکردە

| | | |
|---|---|---|
| *Kurdistan Regional Government*<br>*Presidency of Ministers Council*<br>*Ministry of Higher Education and Scientific Research*<br>*Presidency of University of Koya*<br>*Office of President* |  | حکومەتی هەرێمی کوردستان<br>سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران<br>وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی<br>سەرۆکایەتی زانکۆی کۆیە<br>نووسینگەی سەرۆك |

ژمارە: ٧ / ٢٩ / ٢٧٨٩  بەروار: ٢ / ٦ / ٢٠٠٨

**﴿فەرمانی زانکۆیی﴾**

بابەت / ناساندنی گۆڤار

ئاماژە بە خاڵی (١) تەوەرەی سێ یەم کاروباری زانستی لە کۆنووسی چواردەمین کۆبونەوەی ئەنجومەنی زانکۆ لە ٢٠٠٨/٥/٢١ وە دوای هەڵسەنگاندنی گۆڤاری ئەکادیمی کوردی بڕیار درا بە :-
ناساندنی ئەم گۆڤارە وەك گۆڤارێکی ئەکادیمی و زانستی بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان و وەك گۆڤارێکی ئەکادیمی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت .

پ. د. خدر مەعصوم
سەرۆکی زانکۆ

وێنەیەك بۆ:
- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ
- بەڕێزان یاریدەدەرانی سەرۆکی زانکۆ
- راگرایەتی گشت کۆلیجەکان
- دۆسیەی دەرچوو

www.koyauniversity.org dnya

**ناوەڕۆک:**

# ڕەخنەی درامی لە ڕۆژنامەوانیی کوردیدا
# (باشووری کوردستان ١٩٨٠ - ١٩٨٦)*

**پ. ی. د. هیمداد حوسێن بەکر**
**م. ی. کەیفی محەمەد عەزیز**
**بەشی کوردی - کۆلێژی پەروەردەی مرۆڤایەتی**
**زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر**

**ناوەرۆک:**



**پێشەکی:**

ڕەخنەی درامی و شانۆیی لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی کوردیدا پشکی زۆر کەمی بەرکەوتووە، لە پانتایی ئەدەبی کوردیدا زۆرتر باس لە دەقی شیعر و هونەرەکانی پەخشان کراوە، کەچی بە پێچەوانەوە، مێژووی شانۆ لە قۆناغەکانی بەرەوپێشەوەچوونی بیرو هزری مرۆڤایەتییدا ڕۆڵێکی کاریگەرو بەرچاوی بینیوەو بەرلەوەی نووسین و خوێندنەوە و چاپەمەنی دابێت، وەکو هۆکارێکی سەرەکی لە هۆشیارکردنەوەی خەڵکیدا بەکارهاتووەو ویژدانی خەڵکی هەژاندووە.

---

* ڕێکەوتی وەرگرتن ٢٠٠٩/٦/١٤

### ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ؟

هەڵبـــژادرنی ئەم بابەتە لەوەوە دێت وەکـــو پێـــویست نەخـــراوەتە بەرباس و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی و بە تایبەتییش رەخنەی شانۆیی لە ئەدەبی کوردیدا جێگەی خاڵییە، بۆیە ئەم هەوڵەم بۆ ئەم بوارە تەرخان کردووە.

رۆژنامەوانیی کوردی، هەر لە سەرەتاوە سەرچاوەی یەکەمی رۆشنبیریی و هزریی ئێـمە بووەو بە هۆی نەبوونی چاپخـانە و دواکـەوتوویی و نەخـوێندەواری و هەژاری کـۆمـەڵی کـوردەواری جێگەی کـتـێـبی گـرتبـووەوە. ئەمـڕۆیش رۆژنامـەوانی کـوردی تۆمارێکی زیندووی کلتووری کوردەوارییە، لە بواری دراما و رەخنەی شـانۆییـشـدا درێغی نەکردووە.

### گیروگرفتەکان:

گـیـروگـرفـتی سەرەکی ئەوە بوو دەسکەوتنی ئەم هەمـوو رۆژنامـەو گـۆڤـارانە، بەم هەمـوو هەوراز و نشێوییەی پێیدا تێپەڕیون، هەروا نەبوونی بیبلۆگرافیـاو ئیندێکسی تایبەت بەو رۆژنامـەو گۆڤارانە کـارێکی ئاسان نەبوو، ئەمـە سـەرباری ئەوەی هەندێک لەو رەخنانە تەنیا سەرنج و تێبینی زۆر میزاجی و کەسیی بوون و لە رێباز و بەهاکانی رەخنەی ئەدەبی بە دوور بوون.

سنووری لێکۆڵینەوەکەمان، لە چوارچێوەی بزووتنەوەی شـانۆیی لە رۆژنامـەوانی باشووری کوردستاندایە، رەنگە دەستڕاگەیشتن بە بزاڤی شانۆیی و درامای بەشەکانی دیکەی کـوردسـتـان لە سـایەی بارودۆخی ئەوێدا کـارێکی سـانا نەبێت. ئەم قـۆناغـەی هەڵـمـانبـژاردووە ١٩٨٠ - ١٩٨٦، مـاوەیەکی پڕ لە جـمـوجـۆڵ و چالاکـیی درامی و رەخنەی درامی سەر رووپەڕی رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەیە.

مـیـتـۆدی لێکۆڵینەوەکـەمـان، شـێـوازی وەسـفـی - شـیـکاریی لەبەرگـرتووە و بۆ ئەم مـەبەسـتەیش زۆربەی کـات زنجیـرەی مێژووییـمـان لەبەرگرتووە و ئەو ماوەیەمـان بەسـەر چەند قـۆناغـێکدا دابەش کردووە و لە روانگەی رێبـازە رەخنەییـە دیارەکـانەوە بۆچوونە رەخنەییەکانمان شی کردۆتەوە.

بنـیـادی لێکۆڵینەوەکـەمـان، بەسـەر پێـشـەکـیـیـەک و سێ بەش و ئەنجـام و سەرچاوەکاندا دابەش کردووە.

لە پاژی یەکەمدا، بە کورتی رێبازە رەخنەییە دیارەکـانی شانۆمـان باس کردووە و لە پاژی دووەمدا هەوڵە رەخنەییـەکانی سەرەتاکانی شانۆ و درامای کوردیمان لە رۆژنامـەو گۆڤاره بەراییـەکـان و قەڵەمە دیارەکانی رەخنەگرانی ئەو سەرەدەمە ئاماژە پێکردووە. ئەنجام و سەرچاوەکانمان لە کۆتاییدا دیاری کردووە.

**پاژی یەکەم : کورتەیەک لە بارەی ڕێبازە ڕەخنەییەکانی دراما**

بو تێگەیشتن لە کلاسیزم (لە تەکیا دراما) سەرەتا دەبێ لە پرەنسیپەکانی ئیستاتیکاوە، کە بەپرەنسیپی کلاسیزم دادەنرێت دەست پێبکەین، ئەمەش لەئەنجامی ئەو پێشکەوتنە دوورو درێژەی لەکاری شانویی و گفتوگویی ڕەخنەییەوە هاتووە، بنەما سەرەکییەکانی ئەم ڕێبازە لە شانوگەرییە کونەکانی یونانی و ڕومانەکاندا بەشێوەیەکی پیروز ماوەتەوە و بە زمانێکی مەزن دەنووسرا، کە تیایدا عەقڵ پایەیەکی بەرزی داگیرکردووە، بەو پێیەش لە هونەری کلاسیزمدا سیستەم (نظام) یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی بێت بو ئەوەی بتوانێ ئاراستەی هونەرەکەی لەژێر کونترولدا بێت. ئەرستو (٣٨٤ - ٣٢٢ پ.ز) لە کتێبی (هونەری شیعر) یەکەم کەس بووە یاسای بو دراما داناوە، ئەو بنەما و یاسایانەی ئەرستو ئاماژەی پێکردوون ڕێبازێکی هێنایە کایەوە، کە ئێستا بە درامای کلاسیزم ناودەبرێت.

**١-١: ڕەخنەی کلاسیزم: (یونان، ڕومان)**

**١- سێ یەکەکە:**

- **یەکەی ڕووداو (بابەت):** بریتییە لەوەی، کە ڕووداوی زیاد و لاوەکی تێکەڵ بە ڕووداوی بنچینەیی نەبن، بابەتەکە یەک بابەت بێت و سەربەخویی خوی هەبێت. بویە ئەرستو دراما دەکات بە دوو بەشەوە ؟تراژیدیا، کومیدیا ؟«جیاوازی نێوانیان تەنها ڕووداوە، تراژیدیا بابەتەکەی کارێکی بەرزە و جەرگ برە، کومیدیا بابەتەکەی گاڵتە جارییە و ڕووداوەکانی لەژیانی ڕوژانەی خەڵکەوە وەرگرتووە.»[1].
- **یەکەی کات:** بو ڕوودانی کاتی ڕووداوەکانی دراما نابێ لەماوەی خولانەوەی شەو و ڕوژێکدا تێپەڕ بکات.
- **یەکەی شوێن:** زوربەی شانوگەرییە یونانییەکان لاسایی کارێک دەکەنەوە و لە تەنیا یەک شوێندا ڕوودەدەن، بەمەش شوێنی زوربەی ڕووداوەکان لە کوشکێک یاخود سنووری شارێک دەرناچێت یەکەی شوێن هیچی دەربارەی نەزانراوە تا ئەو کاتەی (ف. ماجی) لە ساڵی ١٥٥٠ زاینی باسی کرد و دواتر شلیگڵ دووپاتی ئەم ڕاستییەی کردەوە لە ساڵی ١٨٠١ کاتێک لە وانە وتنەوەکانیدا بەراوردی نێوان کلاسیک و ڕومانسیەتی دەکرد »[2].

**قەزاو قەدەر:** پێویستە تەوەرەی ڕووداوەکان بن و ئەو دەستە شاراوە و نهێنی و نەبیندراوەیە، کە بەبێ ئەوەی مرۆڤ ئارەزووی لەسەر بێت دەیجوولێنێت و واشدەکات زەمینە خۆشکەر بێت بۆ هاتنەکایەی تراژیدیا بەبێ ئەوەی پاڵەوان هەستی پێبکات و «ڕۆڵی باڵی گێڕاوە لە ڕووداوەکانی درامای یۆنانی و

ڕۆمانییەکان وەکو لە دراماکانی ئۆدیب و هیپۆلێت و میدیاو ئەفجینیا»[٣]، بەڵام دوای سەردەمی یۆنانی و ڕۆمانییەکان بە تایبەتی لە سەردەمی کلاسیزمی نوێدا لادان لە یاسای قەزاو قەدەری دراما ڕووی دا، بەمەش دراما ماناکەی قووڵتر بوو لە «لە تراژیدیادا تاک دەوری سەرەکی هەیە، هەر کەسێک ئەنجامی کارەکەی خۆی وەردەگرێ وەک درامای (ڤیدرا)ی ڕاسین، پاڵەوانی تراژیدیا سۆزەکەی سەردەکەوێ بەسەر کارەکەیدا دەبێتە قوربانی گوناهەکەی»[٤]، بۆیە لە سەردەمی کۆرنێ و ڕاسین «فراوان بوونێک لە تێگەیشتن بۆ (هامارتیا) ڕووی دا، چونکە پاڵەوان ئاگادارە لە هەموو کردەوەکانی خۆی»[٥].

**٢- گەورەیی زمان (عظامية اللغة):** لەدراما کلاسیزمەکاندا ئاخاوتنێکی ئاست نزم دەرنابڕدرێ، کە نەگونجێ لەگەڵ مەزنی کەسایەتییەکان بۆیە دەبێت زمانەکە لەتەک ئاستی هۆش و تاقیکردنەوەی ژیانی کەسایەتییەکانی ناو دراماکەدا بگونجێ. پێویستە تراژیدیا بەشێوەیەکی شیعری بەرز بنووسرێت و گوزارشت لە چینی باڵی کۆمەڵ بکات، پاراو و ڕەوان بێ و ژیری بدوێنێت و نابێ زمانی دەقە تراژیدییەکان کاری زەخرەفەیی تێدا بکرێت.

٣- تراژیدیا دەبێت چارەسەری کێشەی کۆمەڵ بکات بەگشتی نەوەک چارەسەری کێشەی تاکێک، بایەخدان بەگشت و بە کۆمەڵ بنچینەیەکی دیاری کلاسیزمە، بۆیە پاڵەوانی تاکڕەو زۆر کەم و بەدەگمەن دروست دەکەن، بەدەگمەن سەرگوزشتەو چیرۆک و کارەساتی خۆیی یان هی تاکە کەس دەگێڕێتەوە، بۆیە لە بەرهەمە شانۆییە کلاسیزمەکاندا تراژیدیا، تراژیدیای کۆمەڵێک خەڵکە یان هی میللەتە نەک هی تاکە کەسێک، بۆ نموونە لای (یۆرپیدس) لە درامای (ئەڤجینیا لە یۆلیسس) کێشەی شانۆ نامەکە پەیوەندی بە بەرژەوەندی و شەرەفی گشت یۆنانەوە هەیە، یاخود لە ئۆدیپۆس بە پاشایی شاکارەکەی سۆفۆکلیس، پەیوەندی بەنەفرەتێکی یەزدانییەوە هەیە کە گشت خەڵکەکەی خستۆتە گێژاوێکەوە، یان شانۆنامەی (سوار)ی ئەسخیلۆس پەیوەندی بە شکۆداری و بەرگری گشت نەتەوەکەیەوە هەیە[٦]. کۆمیدیاش دەبوو چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتی و ڕامیارییەکانی بکردایە، زۆربەی جار کۆمیدیا ڕووکەشانەو بازاڕییانە باسی کێشەکانی دەکرد و هەندێک جار دەگەیشتە ئاستی شەرمەندەبوون.

**٤- یەکێتی بابەت و یەکێتی ئاواز:** کاتێک تارمایی ترس و بەزەیی باڵی بەسەر کەش و هەوا تراژیدیاکەدا دەکێشا، لای یۆنانییەکان بۆ هێورکردنەوەی مێشکی بینەر کۆراڵ، سروود و سەماو گۆرانییان دەچڕی، چونکە دیمەنە

شانۆگەرییەکان دەبوو جۆرێک لە هاوگونجانی لەگەڵ جۆری ئاوازەکەدا هەبێ. بۆیە کلاسییزمەکان لەگەڵ ئەوەدا نەبوون دیمەنی کوشتن و توندو تیژی لەسەر شانۆ نمایش بکرێ، بەمەش «لای یۆنانییەکان دراما دابەشی سەر سێ بەش یان چوار بەش دەکرا بەڵام لای ڕۆمانییەکان دراما دابەشی پێنج بەش دەکرا و بەدرێژایی ماوەی کلاسیکییەت هەر بەم شێوەیە مایەوە»[٧].

**٥- مەزنیی کەسی شانۆیی (عظامیة الاشخاص المسرحیة):** لای یۆنانی و ڕۆمانییەکان لە نێو دراماکانیاندا بە تایبەتی لە تراژیدیادا «ئەو کەسایەتییەی بە ڕۆڵە سەرەکییەکە هەڵدەستا دەبووایە مرۆڤێکی خانەدان و خاوەن شکۆ بێت یان شا و شاژن یان میرو گەورە پیاوانی ئاینی بن، لە کۆندا ئەوان سەرچاوەی دەسەڵات بوون»[٨] بەڵام لە کۆمیدیادا «کەسایەتییەکان لە چینی ناوەڕاست یاخود ڕەش و ڕووتی خەڵک بوو، بۆیە کۆمیدیا نابێ سنوورە کێشراوەکەی خۆی ببەزێنێ »[٩]، بەڵام لەسەردەمی دوای یۆنانی ڕۆمانییەکان بۆ تێگەیشتن لە چەمکی کەسایەتییەکانی ناو دراما لادان ڕووی دا، لە سەردەمی ڕێنیسانس یاساکانی (ئەرستۆ و هۆراس) دارشتنەوەیەکی نوێی بۆ کرا، ئەم دارشتنەوەیە لە لای (ماکیاڤللی و ئەرستۆ و ئەریتنۆ) خۆی نواند، بۆیە ماکیاڤیلی ڕێنمایی ئەریتنۆ دەکاو دەڵێ: (من وێنەی خەڵک دەکێشم وەکو هەیە، نەوەک وەکو پێویستە هەبێ) ئەمەش دەست پێکردنی هێڵێکی درامی نوێ بوو لە کۆتاییدا گەیشتە بن بەست لەلای کلاسیکییە نوێیەکان و ڕێبازەکانی دواتری، کە توانییان لەناو شانۆگەرییەکانیاندا پاڵەوانی وەها دروست بکەن دەربڕی ناخی سەردەمەکەی خۆی بێت[١٠] کریستۆفەر مارلۆ بەدرامای (د. فاوس)، تۆماس کید بە درامای (تراژیدیای ئیسپانی) شکسپیر بە درامای (هاملێت) گۆڕانکارییان بەسەر ئەم یاسایەی درامای کلاسییزمدا هێنا و هەست و ناخی دەروونی پاڵەوانیان دەخستە ڕوو چونکە لە کلاسییزمدا «عەقڵ پایەکی بەرزی هەیە لەبری سۆز، هۆکاری عەقل هێزێکی زۆری لە هونەری کلاسییزمدا هەیە، دەبێت سیستم (نظام) یەکێک بێت لە تایبەتمەندییەکانی بۆ ئەوەی بتوانێ ئاراستەی هونەرەکەی لەژێر کۆنترۆڵی دابێت»[١١].

**سیما و ڕواڵەتەکانی کلاسییزمی نوێ**

١- ڕێگەدان بەهەبوونی گرێیەکی لاوەکی یان پتر، بەمەرجێک کە گرێ سەرەکییەکە لاوازو بێ هێز نەکات.

٢- ئەگـەر هاتوو یەکـەی کـات درێژتر کـرایەوە لە دەورەیەکی تەواوی خـۆر (٢٤ کاتژمێر) تێپەڕی کرد، ئەوا زیانبەخش نییە بەڵکو دەتوانرێ بۆ سێ دەورە درێژ بکرێتـەوە (سێ ڕۆژ) هەرچەندە راسین کـاتەکـەی کەم دەکـردەوە لە دوو یان سێ کاتژمێر پتر نەبێت.
٣- یەکـەی شـوێن ئەگـەر مـاوەیەکـەی و سنوورەکـەی فـراوانـتـرو درێژتر بکرێتـەوە ڕێگەگرییەک لەگۆڕێدا نابێت بەجۆرێک شارێک هەموو بگرێتەوە یان کۆشکێک سـەرانسـەر..... ئەگـەر هاتـوو شـوێن گـۆڕدرا ڕووداو لەسنووری شـارێک یان کۆشکێک نەچێتە دەرەوە.
٤- کـلاسـیـیـزمی نوێ: کـۆراڵ و سنوور گـرتن لەخـۆ ناگـرێت و خـۆشـەویسـتی و ئارەزووەکـانی دەروون، جـێگەی قـەزاو قـەدەری یۆنانی دەگـرێتـەوەو تەوەرێک دەبێت هەمـوو ڕووداوەکـان لەدەوری خـۆی کـۆدەکـاتەوە[١٢] لەکـۆی هەمـوو ئەو لادانانەی، کـە لە بنەمـاو ڕێسـاکـانی درامـای یۆنانی و ڕۆمـانیـیـەکـان و دواتر کلاسـیـزمی نوێ ڕووی دا کە لەسەرەوە ئامـاژەمـان پێدا ڕێبـازێکی تر پەیدابوو شوێنی کلاسییزمی گرتەوە و بە ڕێبازی ڕۆمانسییزم ناوزەد کرا.

### ٢-١: ڕەخنەی ڕۆمانسییزم:

یەکێک لە گرنگـترین پرەنسـیـپەکانی درامـای ڕۆمـانسـیـزمی، سەربەستی و ئازادییە «لە کۆت و پێوەند و کلێشەی ئامادەکراو، لەگشت داب و ڕەسم و نەریت و یاسایەکی کـلاسـیـزمانە و کۆن، ئازاد بوون لەگشت بەربەست و سنوور و کۆتێکی کۆمەڵایەتی، بەرەڵڵابوون پڕ بە گیانی ئارەزوو»[١٣]، بەمەش شانۆ ئازاد بوو لەو سێ یەکێتییەی، کە کلاسییزمەکان وەکو یاساو ڕێسایەک پابەند بوون پێیەوە، چونکە درامانووسانی سەر بە ڕێبازی ڕۆمانسییزم پێیان وابوو ئەم سێ یەکێتییە سنووری دراماکانیان بەر تەسک دەکاتەوەو لەهەمان کاتدا ئەم سێ یەکێتییەیان دەگەڕاندەوە بۆ بنەماکانی کلاسییزم و ئەرستۆ، هەرچەندە (شکسپیر) پێش هاتنی سەردەمی درامای ڕۆمانسییزم ئەم سێ یەکێتییەی لە دراماکانی خۆیدا تێک شکاند، دواتر درامـانووسـانی سـەر بە ڕێبـازی ڕۆمـانسـیـیـزم شکسـپـیـریان کـردە بنەمـایەک لە بنەمـاکـانی نووسـینی دراماکـانیـان، بۆیە ڕۆمـانسـیـیـزمەکـان وەکـو شکسـپـیـر «لە دراماکانیاندا جگە لە گرێ سەرەکییەکە چەند گرێیەکی لاوەکییان باس دەکرد، چەند چیرۆکێک لە دراماکانیاندا کۆ کراوەتەوە، چیرۆکی لاوەکییان خستۆتە نێو چیرۆکی سەرەکـیـیـەوە بۆ ئەوەی لە بینینیـاندا چێژ وەربـگیـرێ»[١٤] تێکەڵکردنی ئەم گرێ و

چیرۆکە لاوەکییانە، بە گرێ و چیرۆکە سەرەکییەکان دەبووە هۆیەک بۆ دروستکردنی کەشێکی وا لە دراماکانیاندا، کە لە ناخۆشترین ساتی دراماکەدا دەخاتە پێکەنین بەهۆی گیانی نەرمونیانی یاخود بەهۆی گاڵتەجاڕی. هەرچەندە سەردەمەکەی شکسپیر سەردەمی ڕۆمانسیزم و درامای ڕۆمانسی نەبوو، بەڵام ئەم کارەی (شکسپیر) بۆ بلیمەتی و لێهاتوویی خۆی دەگەڕێتەوە، کە دواتر هێزو تینی بەخشییە درامای سەردەمی ڕۆمانسیزم، چونکە دوای سەدەیەک ئینجا بەرهەمەکانی شکسپیر بە ئەوروپا ئاشنا کرا، ئەمەش هەوڵێک بوو لەلایەن ڤۆڵتیرەوە درا بۆ مەبەستی چەسپاندنی بنەماکانی درامای ڕۆمانسیزم «یەکەم لاپەڕە کە من خوێندبێتمەوە دەربارەی (شکسپیر) وای لێ کردم ببمە دیلێک تا هەتایە....... بۆم بەدەرکەوت، کە یەکەی شوێن زۆر هیلاکە، بەڵام یەکەی ڕووداو و کات کۆتێکی گرانەو تەنها خەیاڵ کەلەبچەی دەکات»(١٥). چونکە شکسپیر بە شێوەیەکی ڕێک وجوان توانیویەتی دەروونی کەسایەتییەکانی ناو چیرۆکەکانی شی بکاتەوە، بۆیە ڕۆمانسییزمەکان بەرهەمە شانۆگەرییەکانی شکسپیریان بە پیرۆزو نەمر دەزانی لە هەمان کاتیشدا ڕێگە خۆشکردنێک بوو بۆیان بۆ ئەوەی زیاتر پڕوپاگەندە بۆ ڕێبازی دراماکانیان بکەن، چونکە «تێڕوانینی ڕۆمانسییەت بۆ چەمکی شانۆ زنجیرەیەک دیمەن و ڕووداوە لە کات و ساتی جیاوازدا، نووسەری شانۆی ڕۆمانسی خۆی بە ئازاد دەزانێ لە دیاریکردنی دەق و چۆنیەتی پێشکەشکردنی بەشێوەیەک کە لە سەردەمی کلاسیکییەتدا نەبووە»(١٦) هەربۆیە ڕۆمانسییزمەکان دراماکانیان بە شێوەی پەخشان دەنووسییەوە لەبری بە شیعر نووسین، چونکە پەخشان بەبیر و ڕای ڕۆمانسییزمەکان زیاتر کاریگەرترە لە شیعر «لە دیدگای ڕۆمانسییەکان پەخشان زیاتر دەتوانێت چارەسەری کێشەکانی ژیان و کاروباری کۆمەڵگا بکات»(١٧) بۆ ئەم مەبەستەش بابەتەکانیان دەربڕی ساتە وەختییەکان بوو، هەر بۆیە درامانووسانی ڕۆمانسی پێیان وابوو نووسین بەپەخشان مەودای فراوانترە و دەتوانرێ بە سەربەستی بە ڕەهایی گوزارشت بکەی لە ڕووداوەکان، خەیاڵ داڕشتن لە پەخشان ئاسانترە وەکو لەشیعری کلاسییزم، کە کردبوویانە بنەمایەک بۆ داڕشتنی دراماکانیان. لە شیعردا کۆت و بەندی قافیە و سەروا لەمپەرە لەبەردەم داڕشتنی بابەتەکانیان «بابەتەکانی ژیانی ڕۆژانەیان لەگەڵ شیعر نەدەگونجا و نووسینی دراما بۆ جەماوەرێکی کەم نییە، بەڵکو ئاراستەی جەماوەرێکی فراوان دەکرێ لەچینی ناوەند و چینی گشتی خەڵک، کە دەیەوێ لەخۆی تێ بگاو خۆی بناسێ»(١٨) لەگەڵ شێوازی پەخشان بۆ نووسینی دراماکانیان،

جۆرێک لە درامایەکی تر پەیدابوو، کە پێی دەوترێت (میلۆدراما)(*) بەمەش تێکەڵ یەک بوو«لە سێ یەکێتییەکەی سەردەمی کلاسیبیزم، کە بەهۆیەوە درامایەکی میللی تێکەڵ لە کۆمیدیا و تراژیدیا دروست دەبێت و شێوازێکی پەخشانی میللی لەخۆ دەگرێ»[19]. لەسەردەمی ڕۆمانسیبیزم درامای شیعری بە شێوەیەکی بەرچاو ڕووی لەکزی کرد و زۆربەی نووسەران بۆ نووسینی دراماکانیان پەخشانیان بەکاردەهێنا، چونکە «هەرکەسێک توانای نووسینی هەبێت دەتوانێت دراما بنووسێت بێ ئەوەی شاعیر بێت، بۆیە پەخشان پێگەیەکی بەرزی لە داهێنانی ئەدەبدا داگیر کرد»[20]، بۆ ئەوەی بە شێوازی نووسینی پەخشان زیاتر بتوانن ڕووی ڕاستەقینەی ژیان دەربخەن و خۆیان لە زمانی ڕۆژانەی خەڵک نزیک بکەنەوە بتوانن زیاتر کێشەو گیروگرفتەکانی چینی ناوەند دەربخەن، چونکە گونجاندنی ئەم کێشەو گیرو گرفتانە لەگەڵ شیعر تارادەیەک زەحمەتی تێدابوو. بەمەش پاڵەوانی درامای ڕۆمانسیبیزم ئاوێنەیەک بووە بۆ ڕەنگدانەوەی کەسایەتی نووسەرەکەو ئەو بابەت و باسانەی، کە لەلایەن نووسەرەوە ئاراستەی کۆمەڵگا کراوە، توانییان لە ڕێگەی پاڵەوانی ناو شانۆگەرییەکانیاندا ئەو هەست و سۆزو بیرەی لەلای درامانووس هەبووە بیگەیەنێتە بینەر، بۆیە سروشتی نووسینی ئەو جۆرە باسانە وای پێویست دەکرد بابەتی یەکەی کات و شوێنی کلاسیبیزمەکان فەرامۆش بکرێ، بەڵکو باسەکانی نێو شانۆگەری ڕۆمانسیبیزم پەیوەندی بە کات و شوێنی ئەو وڵاتانەوە هەبوو کە ڕووداوەکانی لێ وەرگیراوە، لەپاڵ ئەمەشدا مەبەستیان وێنەکێشانی لایەنی ڕەوشت و نەریتەکانی سەردەم بووە بەمەش شانۆگەریەکانیان جۆرێک لە مۆرکی ناوچەیی پێوە دیار بووە، چونکە ڕۆمانسیبیزمەکان بێزار ببوون «لە وەرگرتنی بابەتە کۆنەکانی یۆنان و ڕۆمانییەکان، بۆیە بانگەوازیان هەڵدا بۆ بەکارهێنانی مێژوویی هاوچەرخ لە بابەتەکانیان، چونکە پێیان وابوو بابەتە کۆنەکانی یۆنانی و ڕۆمان لەگەڵ کێشەی سەردەمەکەیاندا نایەتەوە»[21].

### ٣-١- ١: ڕێبازی ریالیزم و شانۆی داستانیی (بریخت)ی:

قۆناغی پێش پەیدابوونی ریالیزم، ڕۆمانسیبیزم بوو، ئەمیش لە ڕوانگەیەکی دەروونییەوە دەیڕوانییە گشت بارودۆخەکنی ژیان. ڕۆمانسیەت پێی وابوو هەست و سۆزی مرۆڤ سەرچاوەو کانگای هەموو ڕاستی و دروستییەکە، بۆیە گرنگییان زۆر بەلایەنی ژیری نەدەداو خۆیان نوقمی خەیاڵ و ئەندێشە کردبوو، بەم جۆرە کارە ئەدەبی و هونەرییەکانیان دەڕازاندەوە دواجار بووە هۆکارێک بۆ ئەوەی لەناو خەڵک

متمانەو ڕەواجی خۆیان لەدەست بدەن. بۆیە نووسەران بۆ نووسینەکانیان هەوڵیان دا جۆرە ڕێبازێکی تر پەیڕەو بکەن، کە بتوانێ گیرو گرفتەکانی ڕۆژانەی خەڵکیان بۆ چارەسەر بکات، لەگەڵ ئەمەشدا دوای شکستی ناپلیۆن لە شەڕی واترلۆی ساڵی ١٨١٥ و بڵاوبوونەوەی فەلسەفەی پۆزەتیڤیزمی (ئۆگست کۆنت) ڕێگا خۆشکەر بوون بۆ ئەوەی ڕێبازێکی تر سەر هەڵبدات بەناوی ڕیالیزم «لە ڕووی ئیستاتیکاوە ئەوەیە کە هەر شێوەیەک لە شێوەکانی هونەر، کە دژی ئایدیالیزمی واقع بێت، واتا بەرپەرچدانەوەی ئەو شێوانەیە، کە واقع بەلای خەیاڵ و سۆز دەبەن، هەوڵ و کۆشش دەکات شتەکان وەکو خۆی پیشان بدات»[٢٢] یەکێک لەنووسەرە هەرە دیارەکانی بواری درامای سەر بەم ڕێبازە (ئیپسن)ی نەرویجییە، بەتایبەتی دوای بڵاوبوونەوەی مانفێستەکەی (کارل مارکس) دەرکەوتنی تیۆری (داروین) لەبارەی دروستبوونی مرۆڤەوە، هەموو ئەو بیرو ڕایانەو ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەم لە نووسینەکانی (ئەپسن)دا ڕەنگی دایەوە بە تایبەتی لە بەرهەمەکانی (ماڵی بووکە شوشە ١٨٧٩)، (تارماییەکان ١٨٨١)، (دوژمنی گەل ١٨٨٢)، (مراوی کێوی ١٨٨٤) بەتەواوی پەیڕەوی ڕێبازی ڕیالیزمی کردووە. بۆیە نووسەرانی سەر بەم ڕێبازە ویستوویانە کاتێک خوێنەر بەرهەمەکانیان دەخوێنێتەوە یان سەیریان دەکات دەبێ هەست بەوە بکا، کە بەشێکە لە ژیان. شانۆی ڕیالیزمی نایەوێت بەشێوەیەکی ئەندێشەیی بچێتە سەر تەختەی شانۆ بۆ مەبەستی وروژاندنی هەست و سۆزی خەڵکی، بەڵکو زۆربەی شانۆنامە ڕیالیزمییەکان باسی مرۆڤایەتی دەکەن و داوای خۆشی و بەختیاری بۆ خەڵکی دەکەن. «گرنگییان دەدا بەوێنە کێشانی واقعی ژیان و تۆمارکردنی و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی گیرو گرفتە کۆمەڵایەتییەکان»[٢٣]، چارەسەری کەم و کورتییەکانی ناو کۆمەڵ دەکەن و هەستی مرۆڤایەتی و هونەری خەڵک زیاد دەکەن، بەمەشەوە دەچنە قووڵیی گیروگرفتەکانی کۆمەڵگاوەو کەسایەتی نێودەقی دراماکانیان لە ناوجەرگەی ڕووداوە واقعییەکانی نێو کۆمەڵگاوە وەردەگرن بەشێوەیەکی سادەو ساکار کەسایەتییەکانیان دەردەخست جا ئەو کەسایەتییانە لە هەر چینێک و ئاستێکدا بن، واتا وەکو خۆی چۆنە لە واقع بەهەمان پێوەری ئەو واقیعە دەیان خستە بۆتەی دەقی دراماکانیانەوە«ڕیالیزم موژدەی هیچ شتێک نادات و بانگەشە بۆ ڕەفتارێکی تایبەتی ناکات، بەڵکو هەموو ئامانجی تێگەیشتنی واقیعی ژیانەو لێکدانەوەی بەو جۆرەی کە دەیبینێ»[٢٤]، لەبەرئەوەی درامانووسی ڕیالیزمی زیاتر باسی خۆی ناکات، بەڵکو خۆی لەبیر دەکات و لەبارەی گواستنەوەی ئەو

ڕاستییانەی وەری دەگرێت بێلایەن دەبێت، بۆیە کرۆکی شتەکان وێنە دەکێشێ و گرنگی نادات بە شتە لاوەکییەکان، کە تەنیا بەرێکەوت دەردەکەون، بەمەش هاوکێشەی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و کۆمەڵگا بەرجەستە دەکات و بێ ئەوەی نووسەر دەستکاری یا ڕاستەوخۆ تێکەڵاوی هەست و سۆزی خۆی بکات. بەو پێیە بە سەرنجدانمان لە بەرهەمە درامییەکانی سەر بەو ڕێبازە ئەم ڕاستییانەی سەرەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە. لەوانە بەرهەمەکانی ئیپسن (بازنەی گەچینی قەوقازی)[*] یاخود لە شانۆگەری (تارماییەکان)دا دەبینین بە تەواوی کاریگەری بارودۆخە زانستییەکەی سەردەمی خۆی بەسەرەوەیە و باسی نەخۆشی سێکسی و بۆماوەیی دەکات، کە بریتییە لە پراکتیزەکردنی ئەو وتەیەی، کە دەڵێت: «گوناهی باوکەکان بۆ منداڵەکانی دەگەڕێتەوە»[٢٥]، کە بەشێوەیەکی تراژیدییانە پێشکەشی کردووە.

### ٢-٣-١: شانۆی داستانیی (برێخت):

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا برێخت بەهۆی بەرهەمەکانییەوە توانی شێوەو شێوازێکی تر بە درامای سەردەمەکەی خۆی ببەخشێت، بەمەشەوە توانی گۆڕانێک لە ڕوخساری شانۆ بەدەست بهێنێ. ئەم درامایە بووە هۆیەک بۆ چەسپاندنی بیرو بۆچوونی سۆشیالیستی، ئەو ڕێڕەوەی برێخت گرتیە بەر ناونرا شانۆی داستانی، چونکە داستان خۆی لە خۆیدا گێڕانەوەی ئەو ڕووداوە ئەفسانەییانەیە، کە حەزو ئاواتی مرۆڤە دێرینەکانی لەشێوەی چیرۆک یاخود لە شێوەی درامایەک، کە بەئەفسانە هۆنرابێتەوە دەخستەڕوو، بۆیە ڕووداو و کارەساتەکان بە شێوەی گێڕانەوە دەخاتە ڕوو، بۆ ئەم مەبەستەش ناونانی شانۆی داستانی لەلایەن برێختەوە مەبەستی خۆی هەبووە، بۆ ئەوەی بینەر بتوانێ بە ئاسانی جیاوازی لە نێوان شانۆ باوەکانی (کلاسیزم، ڕۆمانسیزم، ڕیالیزم.....هتد) بکات. چونکە شانۆی داستانی کۆڵەگەی سەرەکی لەسەر ئەو دیالۆگ و شێوە گێڕانەوەیەی کە لە ناو دەقە درامییەکاندا هەیە وەستاوە بەمەش زۆربەی جار کەسیەتییەکان وەکو حیکایەتخوانێک وان و ڕووداوەکان بە شێوەی گێڕانەوە دەگێڕنەوە. شێوەی گێڕانەوەکەش دەبێ هەمان خاسیەت و تایبەتمەندی سەردەمە دێرینەکەی خۆی پێوەبێت، وەنابێت بەشێوەیەک بێت نووسەر تێک هەڵکێشی سەردەمەکەی خۆی بکات. بۆیە هەرسێ یەکێتییەکە (کات و شوێن و ڕووداو) تێک دەشکێنێ و گوێیان پێ نادات، ئەم مەبەستەی برێخت لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە بتوانێ بینەری شانۆگەرییەکان تێکەڵ بە ئەتمۆسفێری نمایشە شانۆییەکان بکات و ببێتە

بەشێکی کاریگەری نمایشی شانۆگەرییەکە «ئەم هەڵوێستەی بینەر یەکێکە لەو گۆڕانکارییەی کە درامای داستانی هێنایە کایەوە»[٢٦] چونکە گێڕانەوەی ڕووداوەکان و دروستکردنی ڕوحی چاودێری کردن لای بینەرو وروژاندنی مێشکی بینەر و هاندانی بۆ ئەوەی بەرامبەر بەو بابەتە لێکدانەوەیەکی عەقڵی لا دروست ببێت و پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرێ «بەشێوەیەک بینەر هەست بەوە بکات، کە ئەمە شانۆگەرییە بۆ ئەوەی لێی نەشێوێ و نەکەوێتە قووڵیی گومانکردنەوە»[٢٧] بۆئەم مەبەستەش نووسەر ڕووداوەکان مۆنتاژ دەکات و وای لێدەکات گۆڕان لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر لەبری هەڵچوون و سۆز بەکاربهێنێ بۆ دەرخستنی ئەم لایەنەش نووسەرانی سەر ئەم ڕێبازەش پێیان وابوو کە نابێت شانۆ بابەتەکانی بەشێوەیەکی مێژوویی بکاتە کەرەسە بۆ چارەسەرکردنی گیرو گرفت و ڕووداوەکانی سەردەم، بەڵکو ئەو ڕووداو و ململانێیەی کە شانۆی داستانی نیشانی ئەدا ئەبێ بەچاوی بینەرانەوە نامۆو سەرسوڕهێنەر بێت، چونکە لە شانۆکانی بەر لەبرێخت وا باو بوو بینەر ملکەچی کەسایەتییە درامییەکان دەبوو ئەوانیش جۆرێک لەلاسایی کردنەوەیان پەیڕەو دەکرد، بەڵام لە شانۆی برێختدا «مافی بیرکردنەوەی بەبینەر دەدات و ملکەچی کەسایەتییە درامییەکان نابێت ئاکامەکەشی بەئاگا هێنانی هۆشی بینەر بووە بۆ ئەوەی ڕەخنە بگرێ»[٢٨] بەمەش بینەر نابێتە ئامرازێکی میکانیکی و بکەوێتە ژێر کارتێکردنێکی ڕووت بەڵکو دەبێت بەچاوێکی ڕەخنەگرانەوە سەیری ڕووداو و دیمەنەکان بکات لەو نامۆبوونەی لە ڕووداوی دراماکەدا هەیە بینەر تێی بگات بەمەش تەختەی شانۆ دەگۆڕێت بۆ پانتایی کێشمەکێش و کێبڕکێ لە پێناو بەشداری پێکردنی بینەر و بە دەستهێنانی سەرنج وەرگرتنیان بۆ مەسەلە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی و ڕامیارییەکان، ئەکتەر لەم شانۆیەدا گۆڕاوە بۆ پارێزەرێک، کە دیالۆگی لۆژیکی بە بەڵگەو پاساو بەکاردەهێنێت، بۆیە ئەرکی ڕۆشنبیرکردن و شۆڕشکردنە دژی کۆت و بەندە باوەکانی کۆمەڵگاو هاندانیان بۆ گۆڕان لە ئەستۆ دەگرێت، بۆیە لەم شانۆییەدا ئەکتەر تێکەڵ بە ڕۆڵی کەسایەتییەکەی نابێت و دوور دەکەوێتەوە بۆ ئەوەی بۆ بینەری ئاشکرا بکات، کە ئەو تەنها نمایش دەکات، بەمەش دوور کەوتنەوەی ئەکتەر لە ڕۆڵەکەی بەنامۆ بوون (تغريب) دادەنرێت.

**پاژی دووەم: ڕەخنەی درامی کوردی ١٩٨٠- ١٩٨٦:**

- ساڵی ١٩٨٠ : تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی لە سلێمانی درامای (گوڵە

مێخەک)ی پێشکەش کردووە، کە لە نووسینی (سمکۆ ناکام)ەو کەمال سابیر بۆ شانۆ دەری هێناوە. پوختەی دراماکە بەم شێوەیەیە، کە لە قەزایەکدا قوتابخانەیەک دوو مامۆستاو بەڕێوەبەرێکی هەیە، یەکێک لە مامۆستاکانی قوتابخانەکە زیرەکە و شاعیرە و ڕۆشنبیرە، بەڵام مامۆستاکەی تر هەردەم لە پۆلدا خوماری شەوەو چاو باشقاڵەو لە کۆڵانەکاندا بەدوای ئافرەتدا دەسووڕێتەوە. بەڕێوەبەریش پیاوێکی دووڕوو و ترسنۆکەو هەر خەریکی مەراییکردنە لەبەردەم ئەو قایمقامە تازەیەدا، کە بە خۆی و ژنێکی سفووری جوانەوە هاتۆتە قەزاکە و سەر لە قوتابخانە و شوێنە گشتییەکان دەدات و گرنگی بە باخچەی گشتی دەدات، دواتر باخچە گشتییەکەی بۆ خێزانەکەی تەرخان دەکات. منداڵەکان شوێنی کۆشش کردنیان نامێنێ و بۆیە ڕۆژێک مامۆستا خومارەکە بە درۆ دەخەنەوە، کە کاتێک باسی ئەرکەکانی دەزگای دەوڵەت و باخچەی گشتییان بۆ دەکات، مامۆستاکە دەزانێ باخچەکە ژنی قایمقامی تیایە، بۆیە ئەچێت بۆ سەیرکردنی بە بیانووی ئەوەوە، کە لە قسەی قوتابییەکانی دڵنیابێ، کە دەیانوت باخچەکە قۆرخ کراوە، لە ئەنجامدا لەگەڵ قایمقام دەبێ بە شەڕیان چونکە قایمقام بەسەردا دێت و دەبینێ مامۆستاکە سەرەتاتکێ لەگەڵ ژنەکەی دەکات، لە ئەنجامی شەڕەکەدا مامۆستاکە لە وەزیفەکە دەردەکرێت و دەڕوات ئەو ناوچەیە بەجێ دەهێڵێ، منداڵەکانیش تۆی گوڵە مێخەکی پێشکەش دەکەن چونکە مامۆستاکە کاتی خۆی گوڵەمێخەکی خۆش دەویست و لەیەخەی خۆی دەدا[٢٩]. پاڵەوانی سەرەکی ئەم شانۆگەرییە مامۆستاکەیە، کە کاتێک لەگەڵ قایمقامدا دەبێتە کێشەیان لەسەر باخچەکە، ململانێی نێو ئەم درامایە ململانێیەکە لەنێوان دەسەڵات و خەڵکدایە. گرێیەکە بریتییە لە داگیرکردنی باخچەیەک، کە هێمایە بۆ خاکی کوردستان، بە ڕزگارکردنی ئەم باخچەیە لە دەست قایمقام و ژنەکەی مانای ڕزگارکردنی خاکی کوردستانە لە دەست داگیرکەرەکانی. دەربارەی ئەم درامایە دوو وتاری ڕەخنەیی نووسراوە، یەکێکیان (یاسین قادر بەرزنجی) لەژێر ناونیشانی (گوڵە مێخەک لە گولزاری پێشڕەودا) نووسیویەتی و دووەمیان (ئەحمەد محمد ئابلاخی) لەژێر ناونیشانی (گوڵە مێخەک لەنێوان نووسین و ئامادەکردن)دا نووسیویەتی. هەر یەکێک لەم دووانە کۆمەڵێک ڕەخنەیان ئاراستەی ئەم درامایە کردووە، ڕەخنەگری یەکەم (یاسین قادر بەرزنجی) بە چەند خاڵێک ڕەخنەی ئاراستەی ئەم درامایە کردووە و تیایدا دەڵێت:

«١- کارەکتەری ئیجابی و دۆستە ئازاکانی میللەت، لەم دەقەدا زۆر کەمن، نووسەر زیاتر نموونەی خەڵکی سلبی و دوژمن بە میللەتی پێناساندین.

٢- مامۆستا هەر لە سەرەتاوە گوڵە مێخەکێکی لە یەخەی داوە، بینەر وا هەست دەکات، کە ناوی شانۆگەرییەکە لەو کردارەوە ناو نرابێ، کەچی ئەبینین لە کۆتاییدا تۆوەکە دێنن و بەهای مێخەکەکە لەوێدا زۆر باش دەرئەکەوێت»[٣٠].
ڕەخنەگری دووەم (ئەحمەد محمد ئابلاخی) بەشێوەیەکی وردتر سەرنجەکانی خۆی دەربڕیوە پێی وایە ئەم دەقە هەمان دەقی چیرۆکەکەی (ئەدمۆن سەبری)یە، بەناوی (باخچەی گشتی)یە. دەقی چیرۆکەکەی (ئەدمۆن سەبری) گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەیە، کە نووسەر بینیویەتی لە کاتی قوتابیەتیدا و ئێستا لای بۆتە چیرۆکێکی خۆش، (ئەدمۆن سەبری) یەک بەیەک باسی مامۆستاکانی کردووە، یەکێکیان نەخۆش و لاوازو بێتاقەتە، یەکێکی تریان هونەرمەندو لێهاتوو و قسە خۆشە، بەڕێوەبەری قوتابخانەکەش هەر یەک قەوانیان بۆ لێ ئەداتەوەو باسی دەزگاکانی دەوڵەت و باخچەی گشتییان بۆ ئەکات. بەڕێوەبەری ناحیە بەخۆی و ژنەکەیەوە دێتە ناو ناحیەکەو گرنگی ئەدات بە باخچەکە، بەڵام ئەیکات بەشوێنێکی تایبەتی بۆ ژنەکەی، کە ئافرەتێکی شۆخ و شەنگە. کاتێک بەڕێوەبەر باسی باخچەی گشتی و گرنگی پێدانی پێ ئەکات قوتابییەکان بە گژیا ئەچنەوەو پێی دەڵێن ئەوەنییە نایەڵن بۆ گەل بێت و تایبەتە بۆ ژنەکەی بەڕێوەبەری ناحیە، بەڕێوەبەر لەمە زۆر بێزار ئەبێت و بۆ باخچەکە ئەچێت تا ڕاستی مەسەلەکە بەچاوی خۆی ببینێت، لەوێ لەگەڵ بەڕێوەبەری ناحیە ئەبێ بەشەڕیان و لە ئەنجامدا بەڕێوەبەری قوتابخانەکە لە کار دوور ئەخرێتەوە[٣١]. دەبووایە (سمکۆ ناکام) ناوی لە دەقەکەی نابا ئامادەکردن نەک نووسین، چونکە بیرۆکەکەی لە ئەدمۆن سەبرییەوە وەرگرتووە هەرچەندە هەندێک دەستکاری کەمی کردووە، لە دەقەکەی ئەدمۆن سەبری بەڕێوەبەری قوتابخانەکە شۆڕشگێڕە و بەگژ بەڕێوەبەری ناحیەکەدا دەچێت بەڵام لە دەقەکەی سمکۆ ناکامدا مامۆستایەکە شۆڕشگێڕە، لەم بارەیەوە ڕەخنەگر دەڵێت: «سمکۆ ناکام بینووسیایە ئامادەکرن نەک نووسین، چونکە ئاشکرایە هەر دەقاودەقی چیرۆکەکەی ئەدمۆن سەبرییە، ئەمەیان هیچ ئەمانەتێکی ئەدەبی تیا نییە چونکە سوود وەرگرتن ئەوەیە کە سوودی لە شێوە نووسین یا شەخسیەتێکی لە پاڵەوانەکان وەربگرتایە بۆ دروستکردنی پاڵەوانێکی تر یا دامەزراندنی شێوە نووسینەکە، بەڵام ئەم کارەی سمکۆ ناکام سوود وەرگرتن نییە بەڵکو گواستنەوەی چیرۆکەکەیە بەوەرگێڕانێکی حەرفی و فاریزەو نوقتەوە»[٣٢] لەبارەی کەسایەتییە سەرەکییەکەی نێو دەقی دراماکەی سمکۆ ناکام، کەسایەتییەکی لاوازە، چونکە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ قایمقام لەسەر تەماشاکردنی ژنەکەی قایمقام بووە نەک لەسەر هەڵوێستی

داگیرکردنی باخچەکە، لەم بارەیەوە ڕەخنەگر دەڵێت: «ئەو شەڕەی سمکۆ کردوویەتی بەتووشی مامۆستا، بووە بە هۆی بێ هێزی دەقەکەی، بەپێزی کورتە چیرۆکەکەی ئەدمۆن سەبری لەوەدایە کە مامۆستا چوو شەڕی لەگەڵ بەڕێوەبەری ناحیە کرد لەسەر قوتابییەکانی بوو، بەڵام مامۆستاکەی سمکۆ مێ باز و چاو بەئەشقەڵە بەبیانووی قوتابییەکان و سەیرکردنی وەزعەوە چوو تا سەیری ژنی قایمقام بکات»[٣٣].

- ساڵی ١٩٨٣: تیپی نواندنی هەولێر ساڵی ١٩٨٣ لەسەر شانۆی هۆڵی گەل لە هەولێر (لاس و خەزاڵ)یان پێشکەش کردووە، نازم دڵبەند چیرۆکی شانۆگەریەکەی نووسیوە و (سەباح عبدالرحمن)یش بۆ سەر شانۆ ئامادەی کردووەو دەری هێناوە. چیرۆکی ئەم شانۆگەرییە لە کتێبەکەی ئۆسکارمان (تحفة المظفرية) وەرگیراوە، تیایدا چیرۆکی خۆشەویستی نێوان لاس و خەزال دەگێڕێتەوە، ئەم چیرۆکە ڕەگێکی فۆلکلۆری هەیەو زۆربەی پیرە بەتەمەنەکانی کورد ئەم چیرۆکە بەشێوەیەکی ڕەوانی دەزانن، شوێنی ڕووداوەکانی چیرۆکەکە خاکی کوردستانە و تیایدا لاسی کوڕی ئەحمەد خانی باڵەکی، خۆشەویستی خەزاڵی مەلا نەبیان دەچێتە دڵەوە، بەمەش لاس سەری خۆی هەڵدەگرێ و دەچێتە خزمەتی مەلا نەبیان و دەبێتە خزمەتکار، پاش چەند ڕۆژێک چاوی بە خەزاڵ دەکەوێت و شێت و شەیدای دەبێت. لاس دەبێتە شوانکارەیەکی دڵسۆز و ئازای ماڵە دلبەرێ و لەکاتی مەڕ لەوەڕاندنیدا لە مێرگی نابەڵەدان بۆرە سوارێکی ناوچەکە لەسەر پاوانێ دەگەڵی دەکاتە شەڕو گێچەڵی پێدەکات، بەڵام لاس جوامێرانە ڕووبەڕووی دەوەستێتەوەو پێی دەڵێ ئەم چیاو دۆڵە موڵکی کەس نییە و منیش شوانی ماڵی خەزاڵی مەلا نەبیانم، کەس ناتوانێ مەڕی من لە لەوەڕێ بکات، لە ئەنجامدا لاس ناچار دەبێ کەپەنەکی شوانی فڕێ بدات و خۆی تێ ڕوو دەکات و بەعەردیدا دەدات، بەو گۆچانەی بەدەستییەوە بووە گیانی لەبەر دەردێنێت، دواتر لاس خەنجەری کابرا کوژراوەکەی بۆ خەزاڵ بە دیاری دەباتەوە، بەم کارەیەوە شانازی بەخۆیەوە دەکات و لای خەزاڵ خۆی ئاشکرا دەکات بەمەش خەزاڵ دەزانێ، کە کوڕی ئەحمەد خانی باڵەکییە بۆیە خەزاڵ هێندەی تر خۆشی دەوێت، لە ئەنجامی ئەمەدا کوڕە عەشقە ناپاکەکان مێگەلە مەڕی خەزاڵ بە تاڵان دەبەن، خەزاڵیش خۆی لە ماڵێ پیرەژنێک حەشاردەدات بۆئەوەی سەری تیا نەچێت، دواتر لاس بەم کارە دەزانێ و پەیمان بە خەزاڵ دەدات کە پەندێکی وایان بداتێ و ماڵە بە تاڵن براوەکەشی بەدوو هێندە بۆیان بگێڕێتەوە[٣٤]. ئەم چیرۆکەی وەکو لە سەرەوە ئاماژەمان پێکرد تیپی نواندنی هەولێر ئەم درامایەیان نمایش کردووە، کەسایەتییە سەرەکییەکانی ئەم درامایە

بریتین له (لاس) و (خەزاڵ) وەکو دلبەر و خۆشەویستی یەکتری وەهەموو گرێیەکانی ئەم درامایەش له دەوروبەری ئەم کەسایەتییانەوە دەخولێتەوە، نمایش و نیشاندانی ئەم چیرۆکە خۆی له خۆیدا بایەخدانە بە زیندووکردنەوەی کەلەپووری نەتەوایەتی کورد و دووبارە ئاشناکردنەوەیە بە نەوەی نوێ، گرێی ئەم درامایە بریتییە له بەیەکگەیشتنی نێوان دوو خۆشەویست، ململانێیەکەش ململانێیەکی چینایەتییە له نێوان لاس وەک کوڕە ئاغایەک و کوڕە تازەپێگەیشتووە هەژارەکانی گوندی مەمودیان، چونکە بەرهەڵستییان دەکرد، کە نەدەبوو (خەزاڵ) بدرێتە لاس بۆیە ئەمیش بەدەست و بازوو لێهاتوویی خۆی گەیشتە دولبەرەکەی، ئەمەش هێمایەکە بۆ چەوساندنەوەی هەژاران لەلایەن کوڕە ئاغاکانەوە کە هەردەم بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان هێز بەکاردەهێنن. دەربارەی ئەم درامایە (مەغدید حاجی) بابەتێکی ڕەخنەیی بە ناونیشانی (شانۆگەری لاس و خەزاڵ و بەیتی (لاس و خەزاڵ)ی ناو کتێبەکەی ئۆسکارمان) نووسیوەو ڕەخنەگر له بابەتە ڕەخنەییەکەیدا بەراوردێک له نێوان دەقی دراماکەو بەیتی چیرۆکەکانی (لاس و خەزاڵ)ی ئۆسکارماندا دەکات، کە تیایدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات نووسەری دەقی دراماکە، بە هیچ شێوەیەک نەیویستووە ناوی کتێبەکەی ئۆسکارمان بەرێت، کە لەلایەن (هێمن)ەوە کراوەتەوە کوردی. «نووسەری شانۆگەری لاس و خەزاڵ، تارادەیەکی زۆر کەڵکی له کتێبەکەی (ئۆسکارمان) وەرگرتووە، کە مامۆستا (هێمن) ساغی کردۆتەوەو هێناویەتیە سەر ڕێنووسی کوردی، بەڵام خۆی دان بەمەدا نانێت و پەنجەش بۆ سەرچاوەکانی نووسینەکەی ڕاناکێشێت»[٣٥]. دواتر ڕەخنەگر پێی وایە نووسەری دەقی دراماکە کۆمەڵێک لادانی له دەقی چیرۆکەکەی (لاس و خەزاڵ)ی نێو کتێبەکەی ئۆسکارماندا کردووە، چونکە لەنێو دەقی چیرۆکی (لاس و خەزاڵ)دا وا هاتووە: ئەحمەد ئاغای باڵەکی برایەکی هەبووە ناوی مەحمود بووە، ئەحمەد ئاغا هیچ کوڕی نەبووە لەگەڵ ئەوەشدا خێزانەکەی زگی (حامیلەدار) بووە، بەهەمان شێوەش ژنەکەی مەحمود ئاغاش زگی هەبووە، دواتر ئەحمەد ئاغا کوڕێکی دەبێت ناوی دەنێت لاس، بەڵام مەحمود ئاغا کچێکی دەبێت ناوی دەنێن خانزاد، دوای گەورە بوونیان هەردووکیان لێک مارە دەکەن، بەڵام «له شانۆگەرییەکەدا بە هیچ شێوەیەک باسی پەیوەندی نێوان لاس و خانزاد ناکرێ و تەنیا لاس و خەزاڵ وەکو دوو قارەمانی چیرۆکەکە بەرز کراونەتەوە»[٣٦] له نێو دەقی چیرۆکەکەی (ئۆسکارمان)دا هاتووە، کە کەسێک بەکرێ گیراوە بۆ ئەوەی بچیتە سەر ڕێگای لاس و بیکوژێت، بە دزی تیرێکی ژەهراوی لەڕاستی پەراسووەکانی قایم دەکات و

دەپیپێکێت. بەڵام (لاس) لەگەڵ ئەوەی، کە بریندار دەبێت دەستبەجێ تۆڵەی خۆی لە کابرا بەکرێ گیراوەکە دەکاتەوە دەیکوژێت دواتر لاشەی کابرا کوژراوەکە بە ئەسپەکەیەوە ڕادەکێشێت و دەیبات بۆ بەردەمی خەزاڵ بۆئەوەی پێی بڵێ من لێهاتوو شۆڕە سوارم سەرەڕای ئەوەی، کە بریندارم بەڵام هەر توانیم تۆڵەی خۆم بکەمەوە بۆیە بە (خەزاڵ) دەڵێت: «خۆ من کورە شوانێک نیم تۆڵەی خۆم پێ نەکرابێتەوە» ئاشکرایە چەند سەد ساڵێک لەمەوبەر زۆربەی خەڵکی کوردستان شوانکارەو مەڕدار بوونە و لە هەمان کاتیشدا سووتەمەنی و پاڵەوانی ڕاپەڕین و بەگژیەکداچوونەکان بووینە، بوونەتە پاڵەوانی چیرۆکی گەلێک داستان و ئەفسانەیان لە مێژووی گەلەکەماندا تۆمار کردووە، بۆ ئەم مەبەستەش ڕەخنەگر پێی وایە ئەم وتەیەی لاس دەربڕینی ناخی بۆرجوازی خۆیەتی «لاسی کورە ئاغا هەڵوێستی چینایەتی خۆی دەربڕیوەو بە ناڕەوا کورە شوانان دەشکێنێتەوە»[٣٧]، بۆیە نابوایە دەرهێنەری شانۆگەرییەکە ئەم وتەیە لەسەر زاری لاس دەربڕیبوایە یاخود ئەم دیمەنەی بە دیمەنێکی تری نێو دەقەکە ئاڵوگۆڕی پێ بکردایە، لەبەر ئەوەی شوانکارەکان هەردەم چینی زەحمەتکێش و ڕەنجدەری وڵات بووینە، بۆیە ناکرێت کەسێک بتوانێت سووکایەتییان پێ بکات و پلە و پایەکی نزمیان بۆ دابنێت.

- شانۆگەری (سەلەی نانکەر) ساڵی ١٩٨٣ لە هۆڵی ئامادەیی سلێمانی لەلایەن تیپی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد - لقی سلێمانی پێشکەش کراوە، دەقی دراماکە لە ڕۆمانی (النخلة والجیران)ی (غائب طعمة فرمان) وەرگیراوە، (فوئاد مجید میسری) بەدەستکارییەوە وەری گێڕاوەو (قاسم محمد)یش بۆ شانۆ ئامادەی کردووە، کامەران ڕەوف بۆ شانۆ دەری هێناوە. پوختەی دەقی دراماکە باس لە ئافرەتێک دەکات، کە نانکەری ماڵانە لە شاری بەغدا لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانی، ئافرەتەکە (سەلە) بێوەژنە و بەکاری نانکردن بۆ ماڵان بەردەوامی بەژیانی خۆی دەدات، ژیانێکی پڕ لە ناسۆری و دەردەسەری، سەرەڕای ئەمەش ئەم ئافرەتە کوڕێکی هەیە ناوی (حسێن)ە، کە هیچ کارێک ناکات و بەردەوام وەکو مشەخۆرێک دەستی لە دایکی پان کردۆتەوە لە ئەنجامی کارنەکردنی کوڕەکەی دایکی تووشی کەسێک دەبێت بەناوی (مچەی دەلاڵ) ئەویش ئەوە بەگوێی ئافرەتەکە دەدات، کە کەسانێک هەن هیچ کارناکەن و بەگونیە پارەیان بۆ دەچێتە ماڵەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی جوولانی هەستی ژنەکە، بەمەش مچەی دەلاڵ ژنەکەی خستە بەر تەماحێکی زۆر، ئەو شەوە ئافرەتەکە لە بارێکی دوودڵی و ڕاڕاییدا دەمێنێتەوە، لەلایەکەوە بڕوا ناکات کەسانێک هەبن بەو جۆرە چونکە چەندەها ساڵە

له شوێن خۆیەوە ڕەنج دەدات کەچی هەر لەشوێنی خۆبەتی و بە نانە سکی دەژی، دوای مشتومڕێکی زۆر لەگەڵ مستەفا ڕێک دەکەوێت، بەمەش مستەفا بۆ ئەوەی بە تەواوی لەخشتەی بەرێت ٣٠ دیناری پێدەدات، مستەفای دەلاڵ لەبنەڕەتدا پارەکەی بۆ مەبەستە گلاوەکانی خۆی داوەتێ و لە دواییدا شوو بە مستەفا دەکات و ئەو ناوچەیەی، کە ئافرەتەکەی تیادا دەژی جێی دەهێڵن[٣٨]. بیرۆکەی شانۆگەرییەکە باس لە ماوەیەکی دیاریکراوی مێژوویی دەکات، کە ساڵنی ١٩٤٤ - ١٩٤٥ بەهۆی ئەو بارە نالەبارەی، کە تێکرای مرۆڤایەتی بەهۆی جەنگەوە تووشی هاتبوون، دیارە پرووشکی ئەم جەنگەش وەکو دەرەنجامێکی نالەباری پاشماوەی جەنگ کۆمەڵی عێراقیشی، بە گشت پێکهاتەو چین و توێژەکانیەوە گرتبۆوە، لەگەڵ ئەمەشدا باس لە نامۆبوونی ئافرەت و ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەوە دەکات، کە بەهۆی جەنگەوە گشتیان ناتەبا بوون. گرێی ئەم شانۆگەرییە بریتییە لە ئازادبوونی ئافرەت لە گشت کۆت و پێوەندەکانی کۆمەڵگا بۆ ئەوەی بتوانێ بە ئاسوودەیی بژیت و بەردەوامی بە ژیانی خۆی بدات، ململانێی ئەم درامایە بریتییە لە ململانێ کردنی ئافرەت لەگەڵ دەوروبەرەکەی و ئەو چەوساندنەوەی لەلایەن کۆمەڵگاوە خراوەتە سەری، چونکە وەکو ئافرەت خۆی، خۆی نەژیێنێ ناتوانێت ئازاد بێت و بەسەربەستی بڕیاری خۆی بدات. دەربارەی ئەم شانۆگەرییە فاروق ڕەفیق بابەتێکی ڕەخنەیی بە ناونیشانی (شانۆی سەلەی نانکەر و پرسیارێک) نووسیوەو ڕەخنەگر لە سەرەتای بابەتەکەیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ئامادەکاری ئەم دەقە درامییە نەیتوانیوە هیچ زیادەیەک بخاتە سەر شێوەی وەرگرتنەکەی نێو دەقی ڕۆمانەکەی (النخله والجیران)، بەڵکو کەسایەتییەکان هەمان ئەو کەسایەتییانەن کە لە نێو دەقی ڕۆمانەکەدا هاتووە بەبێ ئەوەی ڕۆڵەکانیان هیچ زیادو کەمییەکی بۆ بکات، بۆیە دەڵێت: «ئەگەر بەراوردێک لەنێوان ڕۆمانەکەو شانۆییەکەدا بکەین ئەوا دەگەینە ئەوەی، کە کارەساتەکان و کەسایەتییەکان لەسەر هەمان هێڵ دەڕۆن و ئامادەکار کەسایەتی نوێی نەخستۆتە سەر و بە هەمان گۆڕانکارییاندا دەبات و بەرگێکی کوردانەیان دەکا بەبەردا»[٣٩] دواتر ڕەخنەگر لە درێژەی باسەکەیدا سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کەوا ئامادەکردنی ئەم شانۆگەرییە سەرکەووتوو نییە چونکە لەکاتی خۆیدا ڕۆمانی (النخلة والجیران) بەزمانێکی گشتی نووسراوە، بۆیە چەندین ڕەخنەی لێ گیراوەو واتە ڕۆمانەکە هەر لەکاتی خۆیدا سەرکەوتوو نەبووە، چۆنکە ناکرێ لە ڕۆمانێکی ناسەرکەوتوو دەقی درامایەک ئامادە بکەیت و بتەوێت سەرکەوتن بەدەست بهێنی «ڕۆمانەکە بەدیالێکتێیی گشتی نووسراوە کە لەکاتی

خۆیدا بووە ڕەخنەیەک لە نووسەر، کەواتا شتێکی ئاسان نییە بکرێتە شانۆنامەو سیماو بەرگێکی کوردانەی بەبەردا بکرێ و بتوانرێت هێماش بۆ هەمان قۆناغ بکرێت لە شارێکی وەکو سلێمانیدا»[40] چونکە ئەو واقیعەی لەنێو دەقی ڕۆمانەکەدا هەیەو گونجاندنی بۆ نێو واقیعی دەقێکی دراما، کارێکی سەختە، شارەزایی و لێهاتوویيەکی چاکی گەرەکە، هەر لەبەر ئەم هۆیەشەوە ئامادەکاری دەقی دراماکە هاتووە هەندێک ڕووداو هەڵوێستی نێو ڕۆمانەکەی بە واقیعی شاری سلێمانی گونجاندووە، هەروەکو کەسایەتی بێوەژنەکە (سەلمە)، کە لە نێو ڕۆمانەکەدا خاوەنی تەندوورێکە و بەپارە نان بۆ ماڵان دەکات، دیارە بوونی ئەم تەندوورە مانای هەبوونی کار دەگەیەنێ بەمەشەوە دەتوانرێ بەچینی وردە بۆرژوا دابنرێ چونکە بەهۆی پیشەکەیەوە دەتوانێ کەم تا زۆرێک خۆی بژێنێت، بەڵام ئامادەکاری دەقی دراماکە بۆئەوەی ئەم واقیعە بگونجێنێت بەواقیعی شاری سلێمانی بۆیە هاتووە بۆ کەسایەتی ئافرەتەکە هیچ جۆرە هۆیەکی ژیانی بۆ دەستەبەر نەکردووە تەنها هێزی بازوو مەچەکەکانی خۆی نەبێت، ئافرەتەکە «لە شانۆییەکەدا لە ماڵان نان دەکات و هۆی بەرهەمهێنانی نییە تەنها هێزو بازووی خودی خۆی نەبێت»[41] کاتێک کە پاڵەوانەکە هیچ هۆیەکی بەرهەمهێنان شک نابات تەنها هێزی بازووی نەبێت ئەمە لە بیر و هەڵسوکەوت و ڕەوشتیدا ڕەنگ دەداتەوە، خۆ ئەگەر خاوەن پیشە بوایە ئەوا لە چینی بۆرژوای بچووکدا خۆی دەبینێتەوە، کە خۆی لە خۆیدا خاوەن بەها و ڕەوشت و بیر و باوەڕی خۆیەتی.

- ساڵی ١٩٨٤: شوێن ژوورێکی ئەو سەردەمەیە کیژۆڵەیەکی ناسک پەرتووک دەخوێنێتەوە پاشان دەچێتە بەر ئاوێنەو خوی ڕێک دەخات و بە هەناسەیەکی قووڵەوە دەڵێ: (ئەوە سێ ڕۆژە نەهات.... لەشکری) لێرەوە ناونیشای دراماکەمان بو بەدیار دەکەوێت، کە ئەم کیژۆڵەیە خانزادەو چاوەڕوانی لەشکری دەکات بەڵام ئەو خانزادەو (لەشکری)یەی میر نشینی سۆران نین. دڵەڕاوکێ و چاوەڕوان کردنە بێدەنگییەکەی وادیار دەخات خۆی مەلاس داوە تاوەکو بەهۆی ڕابواردن ئەو (لەشکری) لەناو ببات، چونکە گوریسی هەڵواسراو بەدیواری ژوورەکەو بەربوونەوەی دەمانچەی ژێر سەرینەکەی وا پێدەچێت خۆی بۆ ئەنجامدانی پیلانێک ئامادە بکات. دوای ماوەیەک زەلامێک خۆی بەژوورەکە دا دەکات و داوای لێبوردن لە خانزاد دەکات، لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە ئەو پیاوە (لەشکری) یە و خانزاد لە چاوەڕوانیدایە. دوای قسەکردنی لەشکری خانزاد گوێ لەقسەکانی ناگرێت و لەپڕ شاڵوی بۆ دەبات و تاوانباری دەکات، بەڵام لەشکری

هەر سوور دەبێ لەسەر دەربڕینی هەست و خۆشەویستی خۆی، تا کارەکە دەگاتە ئەو ڕادەیەی خانزاد دەیەوێ (لەشکری) تاقی بکاتەوەو لەشکریش بەم تاقیکردنەوەیە ڕازی دەبێت و دەکەوێتە داوی پیلانەکەوە. لە تاقیکردنەوەی یەکەم خانزاد توند دەستەکانی لەشکری دەبەستێتەوەو لەسەر کورسییەک دایدەنێت ئینجا دەمانچەیەک دەردێنێ و داوا لە لەشکری دەکات گوللەیەک بەسەری دڵی یاخود بە کەللەی سەریەوە بنێت، بەرامبەر ئەم هەڵوێستەی خانزاد، لەشکری زۆر بێ هێز دەبێ و دەکەوێتە پاڕانەوە. لەم کێشمە کێشەدا دەنگی تارماییەک دێت، کە خانزادی میری سۆرانەو داوا لەخانزاد دەکات پیلانەکەی جێبەجێ نەکات چونکە نەبادا وەکو ئەوی لێ بێت، بەمەش تارماییەکە کاردەکاتە سەر دەروونی خانزاد و لەپڕون دەبێت، بەم هۆیەشەوە خانزادێکی تر دەپەشۆکێ و وای لێدێ نەتوانێ کارەکە ئەنجام بدات و لەکارەساتی کوژرانی کاکی نەکۆڵێتەوە. لێرەدا خانزادێکی تر وەک ئەوەی بەهۆشی خۆی هاتبێتەوە گورج شاڵاو بۆ لەشکری دەبات و داوای لێدەکات کارەساتی کوژرانی کاکی بۆ بگێڕێتەوە، گێڕانەوەکەش لەشێوەی فلاش باک لە سەرەتای ڕوودانی کارەساتەکە دەست پێدەکات. ڕوون دەبێتەوە کەوا لەشکری تاوانی نییە بەڵکو بازرگانەکە بووە هۆی کوژرانی کاکی، دواجار خانزادێکی تر لەسەر شانۆ ئاواتەکەی لەشکری دێنێتە دی یەکتری نیشان دەکەن[٤٢] ئەم هەوڵەی (تەلعەت سامان) هۆیەکە بۆ ئاشنایەتی کردنی نەوەی نوێ بە کەلەپوورو بەیتی میللی، نووسەر لەم بەرهەمەیدا پێچەوانەی هەموو ئەو ڕایانەی دەربارەی خانزادی میری سۆران و لەشکری هەبوون ڕەفتاری کردووە چونکە لەکۆتایی دراماکەیدا خانزادێکی تر بەلەشکری دەگات و ئەنگوستیلە دەگۆڕنەوە، بەڵام لە بەیتە فۆلکلۆرییەکەدا وا هاتووە، کە خانزادی میری سۆران دوای ئەوەی کاکی ژەهر خوارد دەکرێت لەشکری دەکوژێت، جا کوشتنی (لەشکری)ش کۆمەڵێک گێڕانەوەی جیا جیای هەیە، یەکێک لەو ڕایانە دەڵێ دوای ئەوەی تەرمی (سلێمان بەگی قولیان) دەگاتەوە زێدی باب و باپیرانی خۆی، لەشکری ناگەڕێتەوەو دەچێتە خاکی ئێزیدییەکان، دواتر خانزادی میری سۆران فەرمانڕەوایەتی ئیماراتەکەی دەکەوێتە دەست و لەسەر تەختی میرایەتی دادەنیشێت. هەواڵێک بۆ لەشکری دەنێرێ بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە، (لەشکری)ش لەگەڵ بیستنی هەواڵەکە دەستبەجێ دەگەڕێتەوە، بەڵام محەمەدئەمین زەکی بەگ لە کتێبەکەیدا (تأریخی کرد و کردستان) بەجۆرێکی تر گێڕاویەتیەوە، کە دەڵێ : لەشکری شایەر و خۆشخوانی سولەیمان بەگی میری سۆران بووە، کەوتۆتە داوی خۆشەویستی لەگەڵ خانزادی خوشکی سولەیمان بەگ، خۆشەویستی هانی داوە

خیانەت لە ئاغاکەی خۆی بکا. جاسووسەکانی سولتانی ئەستەمبۆڵ بەڵێنیان داوەتێ ئەگەر لەشکری سولەیمان بەگ ژەهر خوارد بکات ئەوا خانزادی لێ مارە دەکەن، (لەشکری)ش ژەهری بۆ سلێمان بەگ لە قاوە کردووەو کوشتوویەتی، پاشان ئاشکرا بووە کەوا سلێمان بەگ بەدەستی لەشکری کوژراوە، خانزادی خوشکی سلێمان بەگ لەشکری بە بنمیچەی دیوارەوە هەڵواسیوە[٤٣] بۆیە دەبینین چیرۆکی کوژرانی (لەشکری) بە زۆر شێوە گێڕدراوەتەوە، بەڵام ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگ بێت ئەوەیە، کە هەموویان باسی کوژرانی لەشکری بەدەستی خانزادی میری سۆران دەکەن، بەڵام نووسەری دەقی دراماکە هاتووە ڕەهەندێکی تری بە دراماکەی بەخشیوە، کە بەتەواوی پێچەوانەی دەقی چیرۆکی بەیتە میللییەکەیە، دیارە نووسەر مەبەستی خۆی هەبووە بۆ ئەوەی بەبینەر بڵێ کەوا لەشکری بێ تاوان بووە بەڵکو کوشتنی سلێمان بەگ بەدەستی نەیارەکانی کورد بووە، کە هەردەم پیلان و نەخشە دەکێشن بۆ لەناوبردنی پیاوە گەورەکانی کورد و دواتر دەیخەنە ئەستۆی کورد خۆیەوە، هەر دەم نەیارەکانی کورد ویستوویانە دووبەرەکی و ئاژاوە بخەنە نێوماڵی کوردەوە. نووسەریش ویستوویەتی ئەم پەیامە لەدوو توێی دەقی دراماکەیدا ڕەنگ بداتەوە. دەربارەی ڕێبازی درامای (خانزادێکی تر) (محمد تەیمور) پێی وایە: «ڕیالیزمییەکی دەربڕینی خودییە زۆرەملەی بۆ سایەدانە بەهێمایەکی دروشمکاری نائاسایی و لاکوت لەهەوڵدانیدا بۆ دەربازکردن و ڕەوا دانە گیروگرفتی هەڵەیەکی گەورەی سەرەنجامی ڕەوشتێکی چەوتی نارەوای بەئاگا.... چەوتییەکانی ڕابردوو دیار دەکرێ و وانەی بەسوودی لێ وەردەگیرێ و پەیرەوی دەکرێت بەگوێرەی ڕۆژی بەراوردکردنی نەک بەچاو و بیرکردنەوەی وەختی ڕوودانی»[٤٤]. (محمد تەیمور) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە خانزاد هێمای کەسێکی دەرەبەگە نەوەکو هێمای ئافرەتی لێوەشاوەو ئازا و لێهاتووی کوردبێ «کەسییەتی ئەو ژنە لە تەخووبی ئافرەتێکی دەرەبەگی هەر وەک هەموو دەرەبەگێکی پیاو لەژیانی تایبەتی و گشتیدا تێناپەڕێت و نابێتە هێمای ئافرەتی کورد بەڵکو هێمای دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسییە»[٤٥] بۆیە ئەم کارەی خانزاد بەکردەوەیەکی ساوایانە و دوور لە بەرژەوەندی گشتی لێک دەدرێتەوە، بەڵکو بۆ تۆڵە کردنەوەی ئامانجەکانی خۆی بووە. بۆیە (محمد تەیمور) پێی وابووە کەسایەتی (لەشکری)، کە هاوبەشی نواندنی خانزادێکی تر دەکات لە ڕۆڵ بینینەکەی زۆر بێ توانا بووە و قەناعەتی بە دەورەکەی خۆی نەبووە «بەداخەوە ئەوەی دەوری لەشکری دەدیت کەرخی دەنگی و تەپی و ڕاکێشانی لەشی لە ژوورێ دانیشتن و جووڵانەوەی بێ تەوەری وای بەدەرخست ئەو

ئەکتەرە هیچ هەوڵی لەگەڵ نەدراوە بۆ ئەوەی لە دەوری خۆی بگات»[٤٦] بەڵام (ئازاد حەمە شەریف) ئەم کارەی (تەلعەت سامان) بەکارێکی چاک دەزانێ و نموونەی لەزۆربەی بەرهەمەکانی لە وڵاتانی تری بۆ هێناوەتەوە لەوانە لە ئەوروپا کەسایەتی (کیلۆپاترا) هەر لە سەردەمی شکسپیرەوە تا ئەو ڕۆژەش بەچەندین شێوەی جیا جیا مامەڵەی لەگەڵدا کراوەو دەکرێ، نەک هەر کیلۆپاترا بگرە (تۆماس مۆر) و هێنری چوارەم و ناپلیۆن.... هتد، هەروەها لای ڕۆژهەڵاتیش مەجنون لەیلا و شیرین و فەرهاد و گەلێک نموونەی تر دەبینرێن[٤٧] ئەم جۆرە مامەڵەکردنە لەگەڵ کەلەپوور و ناساندنی ڕووە ڕاستەقینەکەی و پیشاندانی لەسەر شانۆ کارێکی چاکە، چونکە هەموو ئەو بینەرانەی ئامادەی بینینی ئەم درامایە دەبن دەکەونە حاڵەتی بیرکردنەوە، کە ئایا لە کوشتنی سلێمان بەگی قولی بەگییان لەشکری یاخود دەستی دوژمنانی کورد ریسوا بکەن، بۆیە لەم بارەیەوە ڕەخنەگر دەڵێ: «لە ئەنجامی ئەو جۆرە مامەڵەکردنە لەگەڵ فۆلکلۆر، بینەران لەگەڵ خۆیان دەکەونە هەمان ململانێی بیری لە نێوان تێڕوانینەکان، کە ئەمەش وایان لێدەکات مێشکیان نەک سۆزیان بۆ یەکالاکردنەوەی بابەتەکان بەکار بهێنن»[٤٨].

- تیپی نواندنی هەولێر لە ساڵی ١٩٨٤دا بۆ یەکەمین جار بەرهەمێکی بیانی بەناوی (خانەدان) پێشکەش کرد، دەقی ئەم درامایە لەلایەن (مۆلێر و مێشێل بۆلکاف)ەوە نووسراوە، چەتۆ حەسەن وەری گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، تەحسین شەعبان ئامادەی کردووەو دەری هێناوە. دەقی دراماکەی (مۆلێر) بە ناونیشانی (البرجوازي النبيل)ە و دەقی دراماکەی (مێشێل بۆلکاف)یش بە ناونیشانی (المجنون)ە. ناوەرۆکی شانۆگەرییەکە بریتییە لە کابرایەک بەناوی (جۆردان) ئەم پیاوە پاش ئەوەی بەشێوەیەک لە شێوەکان زۆر دەوڵەمەند دەبێ و رووەدەکاتە شار بۆ ئەوەی خۆی فێری مۆسیقاو سەماو شمشێربازی و فەلسەفە بکات چونکە پێی وایە ئەگەر ئەم شتانە فێر بێت ئەوا دەبێتە خانەدان، بەڵام هەموو ئەو کەسانەی، کە وانەی پێدەڵێنەوە پسپۆری بوارەکەی خۆیان نین، بەڵکو تەنها مەبەستیانە پارەی لێ وەربگرن، ڕووداوی شانۆگەرییەکە لێرەوە دەست پێدەکات، کە ئەم پیاوە کچێکی هەیەو لەگەڵ خۆی دەیهێنێتە شار، بەڵام لە شار ئەم کچە شەیدای کوڕێکی شارنشین دەبێت، هەرچەندە باوکی، کچەکەی بۆ کوڕە ناسیاوێکی خۆی داناوە، پاشان کوڕەی شار نشین داوای لە جۆردان دەکات بۆ ئەوەی کچەکەی پێ ڕەوا ببینێ، بەڵام جۆردان ڕازی نابێت و کچەکەی خۆی ناداتێ. هەموو ئەو ڕووداوانە نووسەر بەشێوەیەکی کۆمیدییانە دەری بڕیوە چونکە باوکی کچەکە هێشتا هەر بەبیری لادێیی کاردەکات

و سەرەڕای ئەوەی هاتۆتە شار[49] سەبارەت بە ململانێی ئەم شانۆگەرییە، ململانێیەکە لە نێوان دوو بیرو بۆچوون، بیروبۆچوونی باوکی کچەکە هەرچەندە هاتۆتە شار بەڵام بیرو بۆچوونی لادێیی خۆی بەرنەداوەو شانازیشی پێوە دەکات، بیرو بۆچوونەکەی تر بیرو بۆچوونی کچەکەیەتی، کەوا هەست دەکات هاتۆتە شارو لە شارستانیەتی شار پەروەردەو گەورە بووە بۆیە کچەکەی پێی وایە ئەبێ باوکی بیرو بۆ چوونەکانی خۆی بگۆڕێت بەمەش کچەکەی بەرەنگاری باوکی دەبێتەوە. هەروەها بیرۆکەی شانۆگەرییەکە پەیام گەیاندنێکە بۆ هەموو ئەو کەسانەی، کە ئەو سەردەم بەرهەڵستی بەشوودانی کچەکانیان دەکرد بۆئەوەی نەدرێنە کوڕانی شار. سەبارەت بەدیالۆگ و گفتوگۆکانی ئەم شانۆگەرییە شێوەیەکی پەخشان ئامێزو کۆمیدییانەی لەخۆ گرتووە. سەبارەت بەم شانۆگەرییە (سەعدون یونس) وتارێکی ڕەخنەیی بە ناونیشانی (شانۆگەری خانەدان لە هەولێر) نووسیوە، کە تیایدا ڕەخنەگر زیاتر ڕەخنەی لە ناوەڕۆکی دەقەکەوە گرتووەو زیاتر جەختی لەسەر لایەنی زمان کردۆتەوە، لەم بارەیەوە ڕەخنەگر دەڵێت: «لە ڕووی زمانەوانیشەوە زمانی شانۆگەرییەکە یەک نەبوو، دیالۆگی کەسایەتییەکان شێوێندراوە»[50] دیارە ڕەخنەگر مەبەستی لەوە بووە چۆنیەتی وەرگێڕانی دەقەکە ناتەواو بووە واتا وەرگێڕانەکەی وەرگێڕانێکی بێ سەروبەر بووە چونکە دیالۆگەکانی نێو دەقەکە مانای پڕبەپێستی خۆی نەداوەتە دەست. هەروەها دەربارەی ئەم شانۆگەرییە (حەیدەر عبدالرحمن)یش وتارێکی ڕەخنەیی بە ناونیشانی (لەگەڵ شانۆگەری خانەداندا) نووسیوە هەروەکو لە سەرەتادا ئاماژەمان بۆکرد دەقی دراماکە دەقێکی بیانییەو وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی، ڕەخنەگر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات وەرگێڕانی دەقەکە ئەوەندە بێ سەروبەرە تەنانەت بۆ ئەوەی خۆیان لە هەموو هەڵەو کەم و کوڕییەکان دەربازبکەن وەرگێڕ ناوی ناوە ئامادەکردن و وەرگێڕان، دواجار بەم هەموو کەم و کوڕییەوە دەستیان کردووە بەنمایشی شانۆگەرییەکە، سەبارەت بەم لایەنەوە ڕەخنەگر دەڵێت: «مەسەلەی ئامادەکردن هەر ئەوە نییە کە هەندێک لە برادەرە دەرهێنەرەکانمان بۆی چوون بە شێلانی دەقێک بەهەواو هەوەسی خۆیان، هەتا ئەو ڕادەیەی کە تەنیا ناوی نووسەرە ڕاستەقینەکەی خۆی پێوە بمێنێ ئینجا بۆ خۆدەربازکردن لەو گوناهەی دەیکەن مەسەلەی ئامادەکردن دەکەنە بیانوو»[51]، دواتر ڕەخنەگر ڕەخنەی لە چۆنیەتی ناونیشانی دەقی دراماکە گرتووە، چونکە پێی وایە ناوەڕۆکی دەقەکە لەگەڵ ناونیشانی دەقەکەدا تەبا نین: «وشەی خانەدان ئەو چەمکە ناداتە دەست کە لەناونیشان و ناوەڕۆکی شانۆگەرییەکەی مۆلییێردا هەیە»[52]، دیارە ڕەخنەگر ڕەخنەی

له هەڵبژاردنی ناونیشانی دەقەکەدا هەبووە، چونکە پێی وابووە ناوەڕۆکی دەقەکە زۆر لەگەڵ ناونیشانەکەیدا جیایە هەروەکو لە سەرەتاوە ئاماژەمان بۆ کرد، مۆلییێر و میشێل بۆلکاف هەریەکەیان ناونیشانێکی جیایان لەیەکتر بۆ داناوە بۆ ئەم مەبەستەش ئامادەکاری دەقی دراما کوردییەکە جیا لە هەردوو لەمانە هاتووە ناونیشانێکی تری بۆ داناوە، بووەتە مایەی ڕەخنەگرتن لێی، پاشان دەربارەی کەسایەتییە سەرەکییەکە (جۆردان)، کە (سەعدون یونس) ئەم ڕۆڵەی بینیوە، ڕەخنەگر پێی وایە نەیتوانیوە پەیامەکەی بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە وەکو کەسایەتییە سەرەکییەکەی مۆلییێر بگەیەنێ: «بەو ناوەی، کە جۆردان کۆڵەگەی شانۆگەرییەکەیە دەبوو نزیکبوونەوەی جۆردان لە بینەر لە هەموان نزیکتر بوایە...... بەڵام ئەو (سەعدون یونس) نەیتوانی دەست بەسەر ئەو دەرفەتەدا بگرێ و جێگەیەکی ئەوتۆ لەدڵی بینەردا پڕبکاتەوەو کاریگەرییەک لەسەر هەست و نەستیاندا بەجێ بهێڵێت»[٥٣]. بە سەرنجدانمان لە دەقی دراماکە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کەوا بیرۆکە دراماکە وروژاندنی دەردێکی کۆمەڵایەتییە، کە ژمارەیەکی زۆری خانەدانەکانی ئەو سەردەم و سەردەمی ئێستاش بەدەستیەوە دەناڵێنن.

- ساڵی ١٩٨٤: تیپی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی شانۆگەری (تەنەکە)یان پێشکەش کردووە، ئەم شانۆگەرییە لە ڕۆمانەکەی (یەشار کەمال)ەوە وەرگیراوە، کە شوکر مستەفا وەری گێڕاوە بۆ سەر زمانی کوردی و (فوئاد مەجید میسری)ش ئامادەی کردووەو هونەرمەند ئەحمەد سالار بۆ شانۆ دەری هێناوە. یەشار کەمال لە ڕۆمانەکەیدا باسی قائمقامێکمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە لە سەرەتای دامەزراندنیەوە بەرەنگاری ئاغاو دەرەبەگەکان دەبێتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی لە پێشێلکردنی مافی جووتیارە چەوساوەکان ڕاهاتوون و دەیانەوێت قائیمقامیش دەست بخاتە دەستیان بۆ ڕووتانەوەی خەڵکی و بەردەوامبوون لەسەر ئەو ژیانە پڕ ستەمکارییە، بۆیە فەرمانبەرێکی قایمقام ڕووبەڕووی چەندین کێشەو بێنەو بەردەی دەکەن بۆ ئەوەی کارە چەوت و ناپاکەکانی ئاغاو دەرەبەگەکان جێ بە جێ بکات، بەڵام ڕووبەڕوویان دەوەستێتەوە کارەکان جێبەجێ ناکات، بەم هۆیەشەوە ئاغاو دەرەبەگەکان خۆیان ڕێک دەخەن بۆئەوەی بچنە لای قایمقام و سکاڵای لێ بکەن و سزا بدرێت و لەسەر کارەکەی دەری بکات، بەمەش هەوڵەکەیان سەردەگرێ و بە تەنەکە لێدانی منداڵان شاربەدەر دەکرێت. ڕووداوی ئەم شانۆگەرییە ڕووداوێکی ڕاستەقینەی نێو جەرگەی کۆمەڵانی خەڵکەو ڕۆژانە چەندەها کاری لەم شێوەیە بە بەرچاومان دەکەوێت، بۆیە نووسەر هاتووە ڕووداوێکی واقیعی خستۆتە نێو دەقی

ڕۆمـانەکـەیەوە بۆ ئەوەی بتـوانێ کـارە چەوت و نارێکەکـانی چینی بۆرژوا بەدەر بخات، چونکە ئەم چینە هەردەم بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەست لەناو دەست و ڕووەو یەک ئاراستە هەنگاو دەنێن، کە ئەویش چەوساندنەوەو زوڵمکردنە لە چینی هەژاران، ململانێی ئەم درامایەش بریتییە لە ململانێی چینایەتی، کە کـاتێ ئاغـاو دەرەبەگـەکـان سکاڵایان لەدژی فـەرمانبـەرێکی هەژار تۆمـار کـردووەو دواجـار وەدەریان نا. دەربارەی ئەم درامـایە «حـەیدەر عـبـدالرحـمـان» وتارێکی ڕەخنەیی بە ناونیـشـانی (تەنەکەو شـانۆی ڕیالیـزمی) نـووسـیـوە، ڕەخنەگـر دوای باسکردنێکی کـورتی دەقی دراماکـە هەڵوەسـتـە لەسـەر چۆنیـەتی ڕۆڵ بینینەکـەی هونەرمەند «ئەحمەد سالار» دەکات، کەوا ئەرکی کەسایەتییە سەرەکییەکەی نێو دەقی دراماکـەی پێ سپـێـردرابوو، لە ئەنجـامـدا ئەحـمـەد سـالار بە شـێـوەیەکی زۆر سـەرکـەوتووانە توانیـبـووی ئەم ڕۆڵە بگـێـڕێت، بۆیە لەم بارەوە ڕەخنەگـر دەڵێت: «سـالاری هونەرمـەند ئاشکرایە، کـە بەردەوام لە گـۆڕانی کـەسـایەتی شانۆگەریەکانییەتی و خۆی لە دووبارەکردنەوەیان پاراستوە»[٥٤] ئینجا ئاماژە بۆئەوە دەکات کەوا ئەم درامایە ڕێچکە ڕیالیزمیەکەی خۆی پاراستووەو لای نەداوە، بۆیە دەڵێت «دەرخستنی سیما ڕەسەنەکان بە دەربڕینێکی ڕاستگۆیانە لە جل و بەرگی ڕووی جوولانەوەی جـوتیـارەکـان، بەمـە شـانۆگـەرییـەکە لە دەرهێنانیـشدا ڕێچکە ڕیالیـزمیـەکەی خـۆی ون نەکـردووە»[٥٥]، هەروەکـو لە ڕێبـازی درامـای ڕیالیـزمیـدا ئاماژەمان پێکرد، کە ئەم ڕێبازەو چۆنیەتی نووسینی درامای سەر بەم ڕێبازە دەبێ ڕووداوەکانی لە واقیـعەوە هەڵێنجرابن و نـووسەر تێکەڵوی هەست و سـۆزی خۆی نەکات بۆ ئەوەی لایەنگری لایەنێک یاخود بەرەیەک لە بەرەکانی کۆمەڵگا بکات بەڵکو ڕووداوەکان چۆن ڕویداوە بەبێ کەم و زیادی نووسەر بیان گوێزێتەوە.

- ساڵی ١٩٨٥: تیپی شانۆی نەتەوایەتی، شانۆیی (شاری ئەوین)ی لە ساڵی ١٩٨٥ پێشکەش کـردووە لە نووسین و دەرهێنانی (تەلعـەت سـامـان)ە، هەرچەندە ئەم شـانۆنامـەیە سـەرەتا ناوێکی تری هەبوو (ئەژدیهـا) بەڵام کـاتێک دەرهێنەر (تەلعەت سامان) ویستی بەم درامایە بەشداری لە ڤیـستیـڤاڵی شانۆیی بەغدا بکات لیـژنەی هەڵسـەنگاندن سـانسـۆریان خسـتـە سـەر ئەم درامـایەو ڕێگـایان بەدەرهێنەر نەدا بەناونیـشـانی ئەژدیها بەشداری بکات، بۆیە ناچار بووە ناوەکـەی بگۆڕێت بۆ شـاری ئەوین، مەبەسـتی ناونانی ئەم درامـایە (شـاری ئەوین) لەوەوە هاتووە، کە سەرەتای دەستپێکردنی دیالۆگی کەسایەتی یەکەم دەڵێت شاری ئەوین نەفرەت دەورەی داوە، کە پوختەی دراماکە بەم شێوەیەیە: ئەژدیهـایەک سەرچاوەی

ئاوی شاری ئەوین دەگرێت، هەموو دانیشتوانی شار تینوویێتی تاویان بۆ دێنێ، بۆیە ناچار دەبن هەوڵ بدەن بۆئەوەی ئەو ئەژدیهـایە لەناوببـەن، بەڵام لەلایەکی تر بازرگانەکانی شار، ئەم جۆرە ڕووداوەیان پێ خۆشەو بازرگانی بەم جۆرە کارەوە دەکەن بۆ ئەوەی دەستمایەکی زۆریان دەست کەوێ، پاشای شار هەموو دانیشتوان کۆدەکاتەوە بۆ ئەوەی کەسێک خۆی تەرخان بکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەژدیهاکە، ئەگەر هاتوو قارەمانەکە سەربکەوێت دواجار پاشا کچەکەی خۆی لێ مارە دەکات. بەم جۆرە ڕووداوەکانی نێو دراماکە بەرەو پێشەوە دەچێت تا ئەوکاتەی کەسێک خۆی تەرخان دەکات و هەندێک ژەهر لەگەڵ خۆی دەبات و دەیخاتە قورگی ئەژدیهاکە بەمەش ئەژدیهایەکە لەناودەچێت. پاشاش وەکو ئەوەی، کە گفتی داوە دواجار کچەکەی خۆی دەداتێ. بە سەرنجدانمان لەناوەڕۆکی ئەم درامایە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە گرێی سەرەکی ئەم درامایە بریتییە لە ڕزگاربوونی شارێک لەو مەترسی و هەڕەشەیەی، کە ئەژدیهایەک خستبوویە سەر ئەو شارە بە نەمانی و لەناوچوونی ئەژدیهایەکە خەڵکی شارەکە تووشی خۆشی و ئارامی دەبن. لەناوچوونی ئەژدیهایەکە هێمایەکە بۆ بەرقەراربوونی ئازادی چونکە دەرهێنەر ناڕاستەوخۆ ویستوویەتی بەبینەر بڵێ ئەگەر هەموو میللەتی کورد پێکەوە وەکو قارەمان دەست بدەنە ژەهر و بیکەنە قورگی نەیارەکانیانەوە، ئەوا دەتوانن سەرکەوتن بەدەست بهێنن هەروەکو چون قارەمانی ئەم درامایە توانی ئەژدیهاکە لەناوببات. ململانێی نێو ئەم درامایە، ململانێیەکە لەنێوان خێرو شەڕ، دیارە ئەژدیهاو بازرگانەکان بەرجەستەی ململانێی شەڕ دەکەن، چونکە بازرگانەکان هەردەم هەوڵیان داوە بۆ ئەوەی کێشەکە بەچارەسەر نەگات و کۆسپێک بووینە بۆ لەناوچوونی ئەژدیهاکە، تێکڕای خەڵکی شاریش بەرجەستەی ململانێی بەرەی خێرن، کە هەردەم لەپێناوی لەناوچوونی ئەژدیهاکە لە تێکۆشاندا بوونە، ئەم جۆرە ململانێیە لە نێو ئەفسانە کۆنەکانی میللەتی کوردا بونی هەیە نووسەریش سوودی لەم جۆرە ئەفسانەیە وەرگرتووەو خستۆتیە نێو چوارچێوەی دراماکەی. دیارە ئەم جۆرە ململانێیە لە نێو دراماکانی سەردەمی یۆنانی کۆندا بوونیان هەبووە، لەوانە (ئۆدیبی سۆفۆکلیس)، کە زۆر نزیکە لە ڕووداوی دراماکەی «تەلعەت سامان» بۆیە دەکرێ بڵێین نووسەر ڕەنگە سوودی لەم درامایە وەرگرتبێت. سەبارەت بەم درامایە «حەیدەر عبدالرحمان» وتارێکی ڕەخنەیی بە ناونیشانی (گەڕانێک بەشانۆی ئەویندا) نووسیوە، کە تیایدا دەربارەی بیرۆکەی دراماکە دەڵێت: «تەلعەت سامان لەشاری ئەویندا هەوڵ و تەقەلای خۆی بۆ ئەوە خستۆتەکار، کە لە مەسەلە

ڕەسەنەکانەوە دەست پێبکات، وە شانۆ بکات بە ڕێگەیەک بۆ گەیشتن بە گەلێ حەقیقەتی مەوزوعی.... بیری شانۆنامەکەی لە ئەفسانە و کەلەپوورەوە وەرگرتوە»[٥٦]، دواتر ڕەخنەگر ئاماژە بەوە دەکات، کە نووسەری دەق زۆر لێهاتووانە هەوڵی لەناوبردنی ئەژدیهایەکەی داوە لەڕێگەی پاڵەوانی دەقەکەیەوە، نووسەر «ڕێگا بۆ خەڵکی ڕوون دەکاتەوە، کە چۆن بەرەنگاری ئەژدیها ببنەوە، دوو کەرەستە دەداتە دەست قارەمانەکە، ژەهر: کە زانست و بیرە، ئینجا خەنجەر، کە هۆیەکی شۆڕشگێڕانەی گەیشتنە بەئامانج، کە هیچ یەکێکیان بەبێ ئەوی تریان ئامانج بەدەست ناهێنن»[٥٧] بەمەشەوە نووسەر ویستوویەتی نیشانی بینەر بدات، کە بەبێ هۆش و بیرکردنەوە، چەک هیچ ئامانجێک بەدەست ناهێنێت، بۆیە پێویستە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان هۆش و بیریان بۆلە ناوبردنی هەموو ئەو ئەژدیهایانە بەکاربهێنن، کە ڕێگرن بۆ بەدەست هێنانی مافی ئازادی و سەربەخۆیی بۆ میللەتی کورد. پاشان ڕەخنەگر چۆنیەتی وەرگرتنی ئەفسانەو کەلەپووری کوردی لەنێو دەقی ئەم درامایە بەلاواز دەزانێ پێی وایە کۆپیەکی تەواوی دەقە ئەفسانەییەکەی کردووەو هیچ جۆرە چارەسەرێکی بابەتییانەی نووسەری تیا بەدی ناکرێ بۆیە لەم بارەیەوە ڕەخنەگر ئاماژە بۆئەوە دەکات کە نووسەری دەق (تەلعەت سامان) نەیتوانیوە لەم دەقەدا سەرکەوتن بەدەست بێنێت لەچونیەتی گواستنەوەی ئەفسانە بۆ نێو دەقی دراماکەی «نووسەر لەوێنە ئەفسانەییەکەدا لای نەداوەو پەنای نەبردۆتە بەر ڕەمز، بەڵکو بەشێوەیەکی کارتۆنی مەسەلەکە دەبڕێنێتەوە، قارەمانەکە تەنیا لە پێناوی دەستگیرانە چاوەڕوانکراوەکەیدا دەگەڕێنێتەوە، کە ئەگەر بهاتایە ئەم قارەمانە ببوایە قوچی قوربانی لە پێناو ڕزگارکردنی شارەکەی، ئەو کات بڕی پاڵەوانیەتی و قوربانیدانەکەی گەورەتر دەبوو»[٥٨]، ڕەخنەگر مەبەستی ئەوە بووە، کە نەدەبوو پاڵەوانە سەرەکییەکە بگەڕێتەوە نێو میللەت و پاشان پاشا کچەکەی خۆی لێ مارە بکات بەڵکو دەبوایە سەری خۆی بەخت بکردایە لە پێناو ڕزگارکردنی شارەکەی خۆی، لە دەست ئەو ئەژدیهایە، چونکە پاڵەوانەکە دیارە مەبەستی سەرەکی ئەوە بووە بگاتە کچی پاشا و بگات بە ژیانێکی خۆش بەڵام ئەگەر سەری تیا بچووبوایە ئەوا ئەوکات مەبەستی ڕزگارکردنی شارو میللەتەکەی خۆی بووە.

دەربارەی هەمان شانۆگەری شێرزاد حەسەن وتارێکی ڕەخنەیی بە ناونیشانی (شانۆگەری شاری ئەوین و سەرنجێک) نووسیوە و ڕەخنەگر بابەتی دراماکە دەگێڕێتەوە بۆ ئەفسانەو کەلەپووری کوردی و پێی وایە «سەرچاوەی چیرۆکەکە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێ لەو حەکایەتانەی دەماودەم لە گوێ ئاگردانی شەوانی زستانی

لای خـۆمـان زۆر کـەس بە منالّی بیـسـتـوویەتی»[٥٩] هەرچەندە کـەرەسـتـەی شانۆگەرییەکە لە ئەفسانەوە وەرگیراوە، بەلاّم ڕەخنەگر پێی وایە نووسەر کۆمەلێک فـڕو فـێلّ و پیـلانی هونەری خسـتـۆتە نێـو ڕووداوەکـانی دەقی شـانۆگـەریەکـە و لە چوارچیوەی دیالۆگی شانۆیی دایڕشتۆتەوە، ڕەخنەگر کەسایەتییەکانی نێو دەقی دراماکەی بۆ دوو بەرە دابەش کردووە، بەرەی خێرو بەرەی شەڕ. بەرەی خێر بریتین لە «بیـرلێـدەری دانا، شـاگـردی بیـرلێـدەر، دلّدارە ئازایەکـە، کـچی مـیـر، کـچـە گـولّفـرۆشـەکـە...... لە پێناو بەرژەوندی گـشـتی و نەمـانی ئەژدیهـایەکـە هەولّ و تەقەلا دەدەن»[٦٠] دیارە مەبەستی ڕەخنەگر بۆ ناوهێنانی ئەم کەسایەتیانە ئەوە بووە کە پێمان بلّێ ئەمانەش تاکێکی میللەتن و لەبەرەی خێردان، بەلاّم بەرەی دووەم کە بەرەی شـەڕخـوازن و هەردەم لەپێناو بەرژەوەندی خـۆیان و گـیـرفـان پڕکـردنی خـۆیان هەولّ دەدەن ئەوانیش بریتین لە «ئـاغــا، بازرگــان، زانا.... ئەم سێ مــلّــۆزمــە بەرژەوەندی زاتی خۆیان لە سەرووی هەموو شتێکەوە دەبینن، بگرە ئەوەندە پیس و نەگریسن کەلّک لەبوونی ئەژدیهاو نەبوونی ئاو وەردەگرن بەهەلێکی چاکی دەزانن گیرفانی خۆیان پڕبکەن»[٦١] دیارە نووسەری دەق مەبەستی خۆی هەبووە، کە ئاغاو بازرگان و زانا لەیەک بەرەی شەڕخواز کۆبکاتەوە، هەرچەندە پیاوە زاناکە هەندێک جـار ڕۆلّی خـێـر خـوازیش دەبینێ بەلاّم لەم شـانۆگـەریەدا نووسـەر ڕۆلّێکی شـەڕ خوازانەی پێ بەخشیوە چونکە بە پارە ژەهری فرۆشتۆتە پیاوە بازرگانەکە، بۆئەوەی ئەو تاقـە بیـرە ئاوەی کـە بۆ خـێـرو خـۆشی شـاری ئەوین لێـدرابوو ژەهراوی بکات. بەمەش بازرگـان و زانایەکە بوونەتە هۆیەک بۆ ئەوەی خەلّکی شـاری ئەوین تووشی نەهامـەتی و تینوویێتی بکەن، چونکە زانایەکان بە هۆی ئەو زانست و زانیارییـانەی هەیانە بەتایبـەتی ئەوانەی دەسـتـیـان لە دروسـتکردنی چەکدا هەیە زۆربەی جـار هۆکارن بۆ لە ناوبردنی خەلّک، هەر بۆیە نووسەریش بەم شێوەیە ئەو جۆرە زانایانە ڕیسوا دەکات کە هەولّ دەدەن بۆ لەناوبردنی خەلّک، ڕەخنەگریش ئەم ڕاستییەمان بۆ دووپات دەکـاتەوەو دەلّێت: «من کـە ئەم زانایەم لەسـەر شـانۆ دی هەندێ لەو زانا فیزیاویانەم بیر هاتەوە، کە دەستیان لەگەلّ هەندێ لە کارگەکان تێکەلّ کردووە بە تایبەتی ئەو کارگانەی کە چەکی ئەتۆمی دروست دەکەن»[٦٢] پاشان ڕەخنەگر دێتە سەر باسی چۆنیەتی گونجاندنی ئەو ئەفسانەیە لە نێو دەقی درامـای شاری ئەوین بەشـێـوەیەکی ڕێکوپێکی لەقـەلّەم داوەو پێـچـەوانەی ڕەخنەگری یەکـەم (حـەیدەر عبدالرحمان) سەرنجە ڕەخنەییەکەی خۆی داوەو پێی وایە «زۆر زیرەکانە مامەلّەی لەگەلّ وشەدا کردووە.... دراما لەو توندو تیژییە لە نێوان بەرەی خێرو شەڕدا جوان

پەرە دەسێنێ.... کارەکتەرەکان بە تێکڕا توانییان ئامانجی پیرۆزی شانۆگەرییەکە بە بینەران ببەخشن» [٦٣].

لە هەمان ساڵدا شانۆگەری ( لێو بەبارەکان) لەلایەن تیپی شانۆیی هونەری نوێ پێشکەش کراوە، دەقی دراماکە لە عەرەبییەوە، کە هی (جليل القيسي)یە، لەلایەن (لەتیف سالح)ەوە بۆ شانۆ دەرهێنراوە. ناوەڕۆکی دراماکە باسی پیاوێکی فەرمانبەری بەساڵچوو و ماندوو لەکارەکەی خۆیدا دەکات، ئەم پیاوە جگە لەبێزاری کارەکەی خۆی کێشەیەکی تری هەیە ئەویش وای لێکردووە کە هێندەی تر وەڕس و بێزار بێت لەژیانی خۆی بەتایبەتی ئەو کاتانەی، کە دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی بەتەواوی بێ تاقەتی دای دەگرێت، چونکە ئەم پیاوە فەرمانبەرە بەساڵچووە ماوەیەکی زۆر دەبێت ژنی هێناوە بەڵام منداڵی نابێت لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی کاتی خۆی بە خواردنەوەی مەی بەسەر دەبات. لێرەدا دەبینین نووسەر ڕووداوێکی واقیعی هێناوەو خستوویتیە نێو دوو توێی دەقێکی دراماوە. گرێی ئەم درامایە لەو کاتەوە دەست پێدەکات، کە پیاوەکە بیر لەنەبوونی منداڵ دەکاتەوە، هەردەم لەگەڵ خۆیدا تووشی ململانێیەکی سەخت دەبێت، بۆیە دەکرێ بڵێین ململانێی ئەم درامایە ململانێیەکی ناوەکییە، کە هەردەم کەسایەتییە سەرەکییەکە بیر دەکاتەوە لەناخی خۆیدا تووشی شڵەژان و دڵەڕاوکێ دەبێت و دواجار پەنا بۆ مەی دەبات بۆئەوەی خۆی مەست بکات، بتوانێ ساتێ لە ئازارەکانی کەم بکاتەوەو بەردەوام کۆمەڵێک پرسیارو بیر و بۆچوون لە مێشکیدا خول دەخواتەوە، کە بۆچی منداڵی نابێت یاخود بۆچی تووشی ئەم کارەساتە بووە، بەمەشەوە نووسەر پاڵەوانی دەقەکەی لە نێو کۆمەڵدا هەڵبژاردووە، بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم درامایە پەیرەوی ڕێبازی ڕیالیزمی کردووە چونکە مامەڵەی لەگەڵ ڕووداوێکی واقیعی نێو کۆمەڵگادا کردووە وەکو زۆربەی ڕێبەرانی ڕیالیزم ئەم جۆرە کارانەیان بەئەرکی سەرشانی خۆیان دەزانن لەوانە ئەپسن، هەردەم دەچووە قووڵیی کێشەو گیروگرفتەکانی کۆمەڵگاکەیەوە. بۆ ئەم مەبەستەش نووسەری ئەم درامایە هەمان ڕێچکەی بەکارهێناوە، دەربارەی ئەم درامایە حەیدەر عبدالرحمان وتارێکی ڕەخنەیی بە ناونیشانی (لێو بەبارەکان) نووسیوە، سەرەتا ڕەخنەگر باسی ڕێچکەی شانۆگەرییەکە دەکات و دەڵێت: «جلیل بەرامبەر بە سەردەم و کێشەکانیدا مرۆڤێکی مولتەزیمەو ڕاستگۆیانە پەنجە دەنێتە ناوچاوی واقع» [٦٤] ئەمەش ئاماژەیەکی ڕۆشنە بۆ دیاریکردنی ڕێچکەی نووسەری دەقەکە، دواتر دەربارەی کەسایەتییەکانی دراماکە ڕەخنەگر دەڵێت: «پاڵەوانەکانی هەڵبژاردەی کۆمەڵن و لە هەموو چەشن و ئاستی کۆمەڵایەتییەوە وەرگیراون» [٦٥].

**ئەنجام:**

لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا گەیشتینە ئەم خاڵانە:

١- ساڵانی نیوەی یەکەمی هەشتاکان لەڕووی ڕەخنەی شانۆییەوە زیاتر گرنگی هەیە، چونکە نووسەری تر هاتنە مەیدانەکەوە، کە لەڕووی هونەرییەوە شارەزاییەکی چاکی بوارەکە بوون لەوانە (محەمەد تەیمور، محسن محمد، حەیدەر عبدالرحمان، صباح هرمز).

٢- لە نیوەی یەکەمی هەشتاکاندا کۆمەڵێک تەوژمی نوێی شانۆیی هاتە ناو شانۆی کوردییەوە، بەمەشەوە بزاڤەکەیان قووڵترو جوانتر کرد.

٣- لە سەرەتای دەست پێکردنی ڕەخنەی شانۆییدا، لە باشووری کوردستان هەتاوەکو ناوەڕاستی ساڵانی هەشتاکان نامیلکەو کتێبی ڕەخنەی شانۆیی بەرچاو ناکەوێت، بەڵام دواتر ڕەخنەی شانۆیی لە شێوەی کتێب چاپ کراوە، بەتایبەتی هەوڵەکانی ڕەخنەگری شانۆیی (محسن محمد) بەرچاو دەکەوێت، کە هەوڵی داوە بابەتە ڕەخنەییەکانی خوی لە شێوەی کتێبدا بە چاپ بگەیەنێ.

٤- لە ڕەخنەی شانۆیی کوردیدا، کومەڵێک نووسەر خویان تێدا تاقی کردوتەوە، بەڵام تا سەر نەیان توانیوە بەردەوام بن، لەگەڵ ئەمەشدا زوربەی ڕەخنەگرەکان تەنیا ڕەخنەیان لەسەر چونیەتی پێشاندانی شانۆکە هەبووەو لایەنی ئەدەبیی دەقەکەیان پشتگوێ خستووە.

٥- لە گوڤارو ڕوژنامەکانی ساڵانی (١٩٨٠ - ١٩٨٦)دا، کومەڵێک گوڤار ژمارەی تایبەتییان بۆ شانۆ و دراما تەرخان کردووە، بەمەش کومەڵێک لێکولینەوەو ڕەخنەی زانستییان بڵاوکردۆتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا گرینگیدانە بە بواری ڕەخنەی شانۆیی.

٦- دەقە شانۆییە نووسراوەکان تا ڕادەیەک لە ڕووی بیروکەکەیانەوە لە یەکتری نزیکن، چونکە زوربەیان بیرۆکەکەیان لە چوارچێوەی داب و نەریت و لایەنی کومەڵایەتی و تاڕادەیەک لایەنی نەتەوەییدا دەخولێتەوە.

## پەراوێزەکان

(١) د. محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث، ص ٥٧٤.
(٢) دريني خشبة، اشهر المذاهب المسرحية، ص ١٨. هەروەها بڕوانە: د. هیمداد حوسێن، ڕێبازە ئەدەبییەکان، ل ٢٨.
(٣) جمعة احمد قاجة، المدارس المسرحية وطرق اخراجها، ص ١٣.
(٤) د. محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث، ص ٥٧٦.
(٥) فرانسيس فرجسون، فكرة المسرح، ت - جلال العشري، ص ١٢١ - ١٢٢.
(٦) د. فەرهاد پیربال، ڕێبازە ئەدەبییەکان، ل ٣٤ .
(٧) دريني خشبة، اشهر المذاهب المسرحية، ص ١٩ .
(٨) اشلي ديوكس، الدراما، ت: محمد خيري، ص١٦.
(٩) د. محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث، ص ٥٧٤.
(١٠) د. رشاد رشدي، نظرية دراما من الارسطو الى الان، ص ٧٧.
(١١) جيرالد ايدس بنتلي و فرد . ب. ملت، فن المسرحية، ت: صدقي حطاب، ص ٢٩٩.
(١٢) دريني خشبة، اشهر المذاهب المسرحية، ص ٧٠ - ٧١.
(١٣) ئەحمەد سالار، ڕێبازە سەرەکییەکانی ئەدەب و هونەر، ل ١٧ . هەروەها بۆ خاسیەتەکانی درامای ڕۆمانسیی بڕوانە: د. هیمداد حوسێن، ڕێبازە ئەدەبییەکان، ل ٨١ - ٨٢.
(١٤) دريني خشبة، اشهر المذاهب المسرحية، ص ٩٨ .
(١٥) لويس فارغاس، المرشد الى فن المسرح، ت: أحمد سلامة، ١٥٧ .
(١٦) جيرالد ايدس بنتلي - فرد . ب. ملت، فن المسرحية، ت: صدقي حطاب، ص ٣١٧ .
(١٧) د. سالم أحمد الحمداني، مذاهب الادب الغربي ومظاهرها في الادب العربي الحديث، ص ١١٠.
(١٨) علي جواد الطاهر، مقدمة في النقد الادبي، ص ٢٠٧ .
(*) میلۆدراما، دراما نووسانی ڕۆمانسیزم بەهۆی ئەم جۆرە شانۆییەوە بەربەرەکانی کلاسیکیان دەکرد، کە ناشێ هونەری شانۆ تەنیا لە تراژیدیاییەکی خەمناک یان کۆمیدیاییەکی پێکەنیناوی کۆبکرێتەوە، چونکە ئەگەر وابێ شانۆ نابێتە ئاوێنەی ژیان و ئەو ئەرکەی لە نیشاندانی ڕاستییەکانی ژیان بە ناتەواوی بەجێ دەگەیەنێ، بۆیە درامانووسانی ڕۆمانسیزم پێیان وابوو ژیان لە شێوە گشتییەکەیدا نە تراژیدیایەکی خەمناک و نە کۆمیدیایەکی پێکەنیناوییە، بەڵکو لەیەک کاتدا گریان و پێکەنین لەخۆی دەگرێت، یاخود ژیان لەڕەنگە گشتیەکەیدا نە ڕەشەو نە سپییە، بەڵکو بەلای خۆڵەمێشیدا دەچی، واتا تارادەی دڵتەزێن نامان گرێنێ تارادەی قاقا لێدانیش نامان خەنێنێ، بۆیە میلۆدرامای سەردەمی ڕۆمانسیزم ناگاتە ڕادەی تراژیدیایەکی تەواو کۆمیدیایەکی تەواو، بەڵکو تێکەڵە لە هەردووکیان. بڕوانە: د. هیمداد حوسێن، ڕێبازە ئەدەبییەکان، ل ٣٩.
(١٩) د. محمد غنيمي هلال، الرومانتيكية، ص ٢١٩.
(٢٠) علي جواد الطاهر، مقدمة في النقد الادبي، ص ٢٠٨ .
(٢١) خورشید ڕەشید، ڕێبازی ڕۆمانتیکیەت لە ئەدەبی کوردیدا، ل ٣٩ .
(٢٢) ئەحمەد سالار، ڕێبازە سەرەکیەکانی ئەدەب و هونەر، ل ١٩٨ .

(٢٣) د. سالم أحمد الحمداني، مذاهب الادب الغربي ومظاهرها في الادب العربي الحديث، ص ١٦٨.

(٢٤) د. محمد مندور، الادب و مذاهبه، ص ٩٨.

(*) ناوەرۆکی دراماکە باس لە دوو بابەت دەکات: کێشەی زەوی، کێ مافی خاوەندارییەتی هەیە؟ ئایا موڵکی ئەو کەسەیە بەوەرەسە بۆی ماوەتەوە و بە وشکی و بەیاری جێهێشتووە، یان موڵکی ئەو جوتیارەیە، کە ڕەنجی تیا کێشاوەو دایچاندووەو بەروبوومی هەڵگرتووەتەوە؟ بابەتی یەکەم بێ چارەسەر مایەوە بۆ ئەوەی بەشی دووەم وەڵامی بداتەوە، هەرچی بابەتی دووەمیشە باسی کێشەی دایکی ڕاستەقینەو شیردەرە، سەبارەت بەوەی کامیان مافی هەڵگرتنەوە و پەروەردەکردنی کوڕەکەی هەیە، چونکە دایکی ڕاستەقینە منداڵەکەی لەپێناو خۆڕازاندنەوەو گرنگیدان بەخۆی، پشتگوێ خست، ئەمە جگە لەخۆشاردنەوەی لە بەرپرسیارییەتە گەورەکانی منداڵ پەروەردەکردن، بەڵام دایەنەکە شیری داوەتێ و تێری کردووەو تا گەورەی کردووەو جوان و سەرنجڕاکێش بووە، هەموو ئەرکەکانی لە ئەستۆ گرتووە، لە کۆتاییشدا دایکە ڕاستەقینەکە دەیەوێت کوڕەکە بەدەست بێنێتەوە، دایەنەکەش ئەوە ڕەت دەکاتەوەو خۆی بەدایکی ڕاستەقینە دەزانێت و داوایەکی بۆ دادوەر بەرزکردەوە، ئەویش داوای کرد بە تەباشیر بازنەیەک بکێشن، منداڵەکەی لە ناوەڕاستی بازنەکەدا دانا، پاشان فەرمانی بەدایک و دایەنەکە کرد هەریەکەیان بەتوندی منداڵەکە ڕاکێشن، هەر کەسێکیان بەخێرایی ڕایکێشا منداڵەکە بۆ ئەوە. دایکەکە بەخێرایی منداڵەکەی ڕاکێشا بەشێوەیەک خەریک بوو پەلی دەربهێنێت، هەرچی دایەنەکەشە ئەوەی نەکرد، وەک سۆزێک نەبادا منداڵەکە تووشی شتێک ببێت، دادوەریش بڕیاری دا منداڵەکە بدرێت بەدایەنەکەو دایکەکەی بێبەش کرد ،چونکە بەکەڵکی سەرپەرشتی و پەروەردەکردنی کوڕەکە نایەت.

نوێگەری شانۆیی لای برێخت، لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە تەنیا کەسە لە ڕیشەوە بەڕووی شانۆی خۆرئاوایی ئەرستۆییدا ڕاپەڕێت، بۆیە شانۆیەکی بەناوی شانۆی نائەرستۆیی دامەزراند، کە لەسەر بنچینەی نامۆکردن و شکاندنی دیواری چوارەم و بەکارهێنانی سینەما لە شانۆداو هانا بردنە بەر شانۆی دۆکیۆمێنتی بنیاد نرابوو.

(٢٥) ـ لويس فارغاس، المرشيد الى الفن المسرحية، ت – أحمد سلامة، ص ١٧٣ .

(٢٦) حەمە کەریم هەورامی، درامای کوردی لەناو درامای جیهاندا، ل ٢٨٤ .

(٢٧) د. رشاد رشدي، نظرية الدراما من ارسطو الى الان، ص ١٩٣ .

(٢٨) د. سمير سرحان، تجارب جديدة في الفن المسرحي، ص ١٩٦ .

(٢٩) ئەحمەد محەمەد ئابلاخی، گوڵە مێخەک لە نێوان نووسین و ئامادەکردن، گ. ڕۆژی کوردستان (ژمارەی تایبەت بە شانۆ و چیرۆک)، ١٩٨٠، ل٩٨ .

(٣٠) یاسین قادر بەرزنجی، گوڵە مێخەک لە گوڵزاری پێشرەودا، گ. ڕۆژی کوردستان، ژمارەی تایبەت بەشانۆ و چیرۆک، س.١٩٨٠، ل ٤٤ .

(٣١) ئەحمەد محمد ئابلاخی، گوڵە مێخەک لەنێوان نووسین و ئامادەکردن، گ. ڕۆژی کوردستان، ژمارەی تایبەت، ١٩٨٠، ل ٩٧ – ٩٨.

(٣٢) سەرچاوەی پێشوو.

(٣٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠١.

(٣٤) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ئۆسکارمان، تحفة المظفرية، وەرگێڕانی هێمن موکریانی، ل ٢٣٤ –

.٢٤٠
(٣٥) مەغدید حاجی، شانۆگەر ی لاس و خەزاڵ و بەیتی لاس و خەزاڵی ناو کتێبەکەی ئۆسکارمان، گ. کاروان، ژ ١١، س ١٩٨٣، ل ٧٥.
(٣٦) مەغدید حاجی، شانۆگەر ی لاس و خەزاڵ و بەیتی لاس و خەزاڵی ناو کتێبەکەی ئۆسکارمان، گ. کاروان، ژ ١١، س ١٩٨٣، ل ٧٦
(٣٧) سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٥.
(٣٨) فاروق رەفیق، شانۆی سەلەی نانکەرو پرسیارێک، گ. کاروان، ژ ١١، ١٩٨٣، ل ٦٢ – ٦٣.
(٣٩) فاروق رەفیق، شانۆی سەلەی نانکەرو پرسیارێک، گ. کاروان، ژ ١١، ١٩٨٣، ل ٦٢.
(٤٠) سەرچاوەی پێشوو.
(٤١) فاروق رەفیق، شانۆی سەلەی نانکەرو پرسیارێک، گ. کاروان، ژ ١١، ١٩٨٣، ل ٦٢.
(٤٢) محسن محمد، خانزادی سۆران لەکورتە درامادا، ل ٥ – ٨.
(٤٣) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: محەمەدئەمین زەکی بەگ، خلاصەیەکی تأریخی کورد و کوردستان، ل ٢٧٧ – ٢٨١.
(٤٤) محمد تەیمور، خانزادو کەلەپورو شانۆو مێژوو، گ. ئۆتۆنۆمی، ژ ٣، ١٩٨٤، ل ٨٥.
(٤٥) محمد تەیمور، خانزادو کەلەپورو شانۆو مێژوو، گ ئۆتۆنۆمی، ژ ٣، ١٩٨٤، ل ٨٦.
(٤٦) سەرچاوەی پێشوو.
(٤٧) ئازاد حەمە شەریف، خانزادو تێڕوانینێکی تر، ر عێراق، ژ ٢٣٢٤، ١٩٨٤/٦/٢٠، ل ٦.
(٤٨) سەرچاوەی پێشوو.
(٤٩) سەعدون یونس، شانۆگەری خانەدان لەهەولێر، رۆژنامەی هاوکاری، ژ ٧٦٩، ٢٧/ ١٢ /١٩٨٤، ل ٤.
(٥٠) سەرچاوەی پێشوو.
(٥١) حەیدەر عبدالرحمان، لەگەڵ شانۆگەری خانەداندا، گ – کاروان، ژ ٢٩، س١٩٨٥، ل ٦٠.
(٥٢) سەرچاوەی پێشوو.
(٥٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٣ .
(٥٤) حەیدەر عبدالرحمان، تەنەکە و شانۆی ریالیزمی، ر – هاوکاری، ژ ٧٢٠، ١٩٨٤، ل ٩.
(٥٥) سەرچاوەی پێشوو، ل ١١.
(٥٦) حەیدەر عبدالرحمان، گەڕانێک بەشانۆی ئەویندا، ر. هاوکاری، ژ ٨١٨، ١٩٨٥، ل ٣.
(٥٧) سەرچاوەی پێشوو.
(٥٨) سەرچاوەی پێشوو، ل ١١.
(٥٩) شێرزاد حەسەن، شانۆگەری ئەوین و سەرنجێک، رۆژنامەی هاوکاری، ژ٨٤٥، ١٩٨٥ /٦/٢٦، ل ١٠.
(٦٠) سەرچاوەی پێشوو.
(٦١) سەرچاوەی پێشوو.
(٦٢) شێرزاد حەسەن، شانۆگەری ئەوین و سەرنجێک، رۆژنامەی هاوکاری، ژ ٨٤٥، ١٩٨٥/٦/٢٦، ل ١٠.
(٦٣) شێرزاد حەسەن، شانۆگەری ئەوین و سەرنجێک، رۆژنامەی هاوکاری، ژ ٨٤٥، ١٩٨٥/٦/٢٦، ل ١٠.
(٦٤) حەیدەر عبدالرحمان، لێو بەبارەکان، گ – ئۆتۆنۆمی، ژ ٢، س ١٩٨٥، ل ٧٤.
(٦٥) سەرچاوەی پێشوو، ل٧٥.

## سەرچاوەکان:
## بە زمانی کوردی:

**ا- کتێب:**


ـ ئەحمەد سالار، ڕێبازە سەرەکییەکانی ئەدەب و هونەر، دار الحرية للطباعة – بغداد، ١٩٨٨.
– حەمە کەریم هەورامی، درامای کوردی لەناو درامای جیهاندا، چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس – هەولێر، ٢٠٠١.
– خورشید ڕەشید ئەحمەد، ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا، چاپخانەی الجاحظ – بغداد، ١٩٨٩.
– د. فەرهاد پیربال، ڕێبازە ئەدەبییەکان، چ٢، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٦.
– محەمەد ئەمین زەکی بەگ، خلاصەیەکی تأریخی کورد و کوردستان، بەغدا، ب١، ١٩٣١.
– محسن محمد، خانزادی سوران لەکورتە دراامادا، مطبعة شفيق – بەغدا، ١٩٨٦.
– محسن محمد، ڕەخنەی شانۆیی، مطبعة الثقافة والشباب – بەغدا، ١٩٨٨.
– د. هیمداد حوسێن، ڕێبازە ئەدەبییەکان، چاپخانەی دەزگای ئاراس – هەولێر، چ ١، ٢٠٠٧.


**ب – گۆڤارەکان:**


– ئەحمەد محمد ئابلاخی، گوڵە مێخەک لە نێوان نووسین و ئامادەکردن، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژمارەی تایبەت، ١٩٨٠.
– ئازاد حەمە شەریف، خانزاد و تێڕوانینێکی تر، ڕۆژنامەی عێراق، ژ ٢٣٢٤، ١٩٨٤/٦/٢٠.
– حەیدەر عبدالرحمان، تەنەکە و شانۆی ڕیالیزمی، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ ٧٢٠، ١٩٨٤.
– حەیدەر عبدالرحمان، لێو بەبارەکان، گ ئۆتۆنۆمی، ژ ٢، ١٩٨٥.
– حەیدەر عبدالرحمان، گەڕانێک بەشانۆی ئەویندا، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ ٨١٨، ١٩٨٥.
– حەیدەر عبدالرحمان، لەگەڵ شانۆگەری خانەداندا، گ کاروان، ژ ٢٩، ١٩٨٥.
– سەعدون یونس، شانۆگەری خانەدان لە هەولێر، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ ٧٦٩، /٢٧ ١٢ /١٩٨٤.
– شێرزاد حەسەن، شانۆگەری ئەوین و سەرنجێک، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ٨٤٥، ١٩٨٥/٦/٢٦.
– فاروق ڕەفیق، شانۆی سەلەی نانکەرو پرسیارێک، گ. کاروان، ژ ١١، ١٩٨٣.
– مەغدید حاجی، شانۆگەر ی لاس و خەزاڵ و بەیتی لاس و خەزاڵی ناو کتێبەکەی ئۆسکارمان، گ. کاروان، ژ ١١، ١٩٨٣.
– محمد تەیمور، خانزادو کەلەپوورو شانۆو مێژوو، گ. ئۆتۆنۆمی، ژ ٣، ١٩٨٤.
– یاسین قادر بەرزنجی، گوڵە مێخەک لە گوڵزاری پێشرەودا، گ. ڕۆژی کوردستان، ژمارەی تایبەت بە شانۆ و چیرۆک، ١٩٨٠.
– یوسف السید أحمد، شانۆی بێ هوودەیی یان ناماقووڵ، و: محمد عبدالله، گ. شانۆ، ژ ٦، ٢٠٠٨.


**بە زمانی عەرەبی:**

**ا- کتێب:**


– اشلي ديوكس، الدراما، ترجمة: محمد خيري، وزارة الثقافة والارشاد القومي – القاهرة، سنة بلا.

- جمعة احمد قاجة، المدارس المسرحية وطرق اخراجها من الاغريق الى الان، صيدا - بيروت، ١٩٧٥.
- جيرالدايدس بنتلي - فرد. ب. ميلت، فن المسرحية، دار الثقافة والنشر - بيروت، ١٩٦٦.
- دريني خشبة، أشهر المذاهب المسرحية ونماذج من أشهر المسرحيات، القاهرة، ١٩٦١.
- د. رشاد رشدي، نظرية الدراما من ارسطو الى الآن، مكتبة انجيلو المصرية - القاهرة، ١٩٦٨.
- د. سالم أحمد الحمداني، مذاهب الادب الغربي ومظاهرها فى الادب العربي الحديث، الموصل، ١٩٨٩.
- د. سمير سرحان، تجارب جديدة في الفن المسرحي، مركز العربي للثقافة والعلوم - بيروت.
- علي جواد الطاهر، مقدمة في النقد الادبي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر - بيروت، ١٩٧٩.
- فرنيس فرجسون، فكرة المسرح، ترجمة جلال العشري، مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر، القاهرة - نيويورك، ١٩٦٤.
- لويس فارجاس، المرشد الى فن المسرح، ترجمة أحمد سلامة محمد، مراجعة: د. مرسي سعدالدين، دار الشؤن الثقافة العامة - بغداد.
- د. محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث، دار نهضة مصر للطبع والنشر - قاهرة، بلا.
- ـــــــــ، الرومانتيكية، دار العودة - بيروت، ١٩٨٦.
- د. محمد مندور، الادب ومذاهبه، دار نهضة مصر للطبع والنشر، الفجالة - القاهرة، ١٩٧٤.

## ملخص البحث
## النقد المسرحي في الصحافة الكردية
## (كردستان الجنوبية ١٩٨٠ - ١٩٨٦)

**أ.م.د.همداد حسين بكر**
**م.م. كيفي محمد عزيز**
**قسم اللغه الكردية -كلية التربيه للعلوم الانسيانية - جامعة صلاح الدين- اربيل**

ان البحث في النقد الدرامي في مجال البحوث الأكاديمية الكردية يكاد ان يكون قليلا لأن الشعر والفنون النثرية كانوا مواضيع البحوث. في حين لعب الدراما والمسرح دورا ملحوظا قبل اختراع الكتابة والطباعة كوسيلة للتوعية والتعليم. لذلك اخترنا هذا الموضوع لملء جزء من هذا الفراغ في دراسة الأدب الكردي وخصوصا مجال الدراما والمسرح والنقد الدرامي كموضوع لبحث أكاديمي في هذا المجال. الصحافة الكردية في المجتمع الكردي كانت الوسيلة الوحيدة والمصدر الأساسي للتوعية والتثقيف ولعدم توفير الأمكانيات اللازمة والوسائل المطبعية فقد ملء الفراغ الذي تركه الكتاب لأسباب عدة منها الفقر والتخلف والأمية. ونرى اليوم تغيير وتطور واضح في الصحافة الكوردية في مجال الدراما والنقد الدرامي ولم يقصر في هذا المجال. طريقة البحث التي اسلكناها هي طريقة وصفية تحليلية ولنفس السبب أخذنا بعين الأعتبار التسلسل الزمني والتاريخي وقسمناها الى عدة مراحل وقمنا بتصنيف وتحليل الآراء على ضوء الأتجاهات النقدية البارزة في تاريخ الأدب.

يتكون هيكل البحث من مقدمة وفصلين والنتيجة والمصادر حيث تم عرض تاريخي للدراما والنظريات الدرامية. ففي القسم الاول خصصنا للأتجاهات النقدية البارزة في مجال الدراما وفي الفصل الثاني وضحنا المحاولات النقدية في المجلات والصحف الكوردية مع ذكر الأقلام البارزة من النقاد مع تحليل وبحث شامل للمحاولات والجهود النقدية في الفترة المذكورة.

ABSTRACT

## Drama Criticism in Kurdish Press（Southern Kurdistan1980–1986）

**Assis. Prof. Dr. Hemdad. A.Bakir**
**kaifi.M.ziz**

**kurdish department**
**College of Education for Human Science**
**Salahaddin University-Erbil**

**The Kurdish journalism of drama and criticism in the field of academic researches of Kurdish literature is very rare as poem and other arts of prose occupies most of the subjects meanwhile theater and drama played an observable role in different stages of the history of man and the development of his thoughts and ideas even before the invention of writing and printing as it was one of the main means of education.**

**The selection of this subject attempts to fill a part of this gap especially criticism of dram in Kurdish literature though I devoted this attempt for this field.**

**The Kurdish journalism was the only source to develop thoughts and ideas of us because of various reasons like ؛illiteracy, poverty, ignorance and the lack of printing and publishers as it replaced book in our community. The Kurdish journalism today records a live culture and did its best for drama and dramatic criticism.**

**The structure of the research is an introduction, two chapters, conclusion and bibliography .In the first chapter deals with kinds of drama with some attempts of criticism in the Kurdish drama.We have mentioned a detailed evaluation and analysis of these attempts of the mentioned period .The second chapter deals with the Kurdish drama, its elements and different critical opinions of critics or researchers in addition to our own evaluation. The first text of Kurdish drama and the establishment of the teams and associations of arts of Kurdish drama in the seventieth and eightieth are explained.**

# هەلویستێ کومەل و رێکخراوێن کوردی ل کوردستانا باشوور ژکەمالی یا* ١٩١٩ - ١٩٢٦

خەلیل مستەفا ئوسمان
بەشی مێژوو - کولیژا ئادابێ - زانکویا دهوک

**پێشەکی**

ئەڤ ڤەکولینە تیشکەکێ دئێخیتە سەر قوناغەکا نازک ژ بزاڤا رزگاریخوازا کوردی ل کوردستانا باشوور، قوناغا پشتی ب دوماهیک هاتنا شەرێ جیهانیێ ئێکێ، وپەیدابونا هەڤرکیێ دناڤبەرا دەسەلاتا بەریتانی و تورکیا بو دەستڤەئینانا ویلایەتا میسل.

هەر دڤێ ڤەکولینیدا تیشک ل سەر هوکارێن کارتێکرنا بزاڤا کەمالی ل سەر رێکخراو و پارتێن کوردی ل کوردستانا باشوور هاتیە دان، مینا جهێ جوگرافیێ کوردستانێ کو ئێکسەر یێ گرێدایە ب ئاخا دەولەتا تورکیاڤە، وهوکارێ ئایینی و مێژوویی کو ب سەدان سالە کوردو تورک پێکڤە دگرێدایبوون، هەروەسا پروپاکندە یێن تورک یێن تامدای ب سوزا ئایینی، وهوکارێ کارگێریا بریتانیا توند ل کوردستانا باشوور.

پشتی ب دوماهیک هاتنا شەری جیهانیێ ئێکێ چەند گروپەکێن سیاسی ل کوردستانا باشوور پەیدابوون، کو دهەمەجور بوون دبیروباوەرو پروگرامێن خودا، کو هندەک ژوان گروپا هزرا نەتەوایەتی ل دەف زالبوویە، وهندەکێن دی تر هزرا ئیسلامی و هندەکێن دی تر لدویف هزرا بەلشەفی کارو بەرنامێن خو برێڤە دبرن.

دڤێ قوناغێدا دوو جورێن سەرەکییێن گروپێن سیاسییێن کوردی هەبووینە دەربارەی هەلویستێ وان بەرامبەری پروپاگندە و دەسەلاتا تورکا ل کوردستانا باشوور. جورێ ئێکی ئەو کومەل و پارتێن لایەنگریا تورکان دکر و داخاز دکر جارەکا دیتر دەسەلاتا تورکان بگەرێتە کوردستانا باشوور، کو زوربەی ئەندامێن ڤان کومەلا ژ زانایێن دینی و ئەفسەرێن سوپایێ ئوسمانی و فەرمانبەرو سەروک هوزێن کوردی بوون، مینا جەمعیا محەمەدی، کومەلا نهێنی کوردو پارتا ئیسلامی یا کوردی، جورێ دووێ ئەو گروپێن دژایەتییا تورکا دکر هەولێن نەهێلانا دەسەلاتا تورکان ل کوردستانا باشوور دکر، مینا کومەلا سەربەخویی کورد، جەمعیا مودافەعەی وەتەن، کومەلا کوردستان، کومەلا سەربەخوییا کوردستان، کو زوربەی ژ ڤان گروپان ل ژێر سەرپەرشتیا دەسەلاتا بەریتانی هاتبوونە دامەزراندن ب مەرەما بەرسینگرتنا پروپاکندە و دەسەلاتا تورکا ل کوردستانا باشوور.

---

* رێکەوتی وەرگرتن ٢٠٠٩/٧/٢

## هەلویستێ کومەل و رێکخراوێن کوردی ل کوردستانا باشوور ژ کەمالی یا ١٩١٩ - ١٩٢٦

**ئێکەم/ پەیدابوونا بزاڤا کەمالی**

ژئەنجامێ وێ بریارا سەرکردێن کومەلا ئیتحادو تەرەقی دای سەبارەت لایەنگرییا ئەلمانیا و نەمسا و دژایەتییا هەڤپەیمانا دشەری جیهانیێ ئێکێدا ١٩١٤ - ١٩١٨، تووشی شکەستنەکا مەزن بوو ل هەمی بەرەیێن شەری، و ئەڤ بریارە گران ل سەر دەولەتا ئوسمانی راوەستیا ژلایێ سیاسی و ئابووری و لەشکەری ڤە [١].

پشتی مۆرکرنا ئاگربەستا مودرس ل ٣٠ی چریا ئێکێ ١٩١٨ێ، ول دویف بەندێن (٧)ێ(٢)، هێزین هەڤپەیمانان ب داگیرکرنا وان باژێرو خالێن ئیستراتیجی ل ئاخا دەولەتا ئوسمانی رابوو، ول دیف وێ بریارا هاتیە دان ل کونگرا ئاشتییێ ل پاریس ل روژا ١٠ی گولانا ١٩١٩ ێ، باژێری ئەزمیر هاتە داگیرکرن ژلایێ هێزێن یونانی ڤە، ئەڤ چەندە ژی بو جهێ نەرازیبوونا نەتەوە پەرستێن تورک، و بەرگری کرنا ڤێ داگیرکرنێ دەست پێ کر ب سەرکردایەتییا مستەفا کەمال پاشا[٣]، ئەڤێ هاتیە دامەزراندن وەک پشکنینەرێ گشتی یێ لەشکەرێ تورکی ل ساسونێ ل ١٩ ی گولانا ١٩١٩ێ [٤].

دڤێ قوناغێدا مستەفا کەمال پاشای هەمی بزاڤێن خو ئێخستنە دخزمەتا ئێککرتنا بزاڤا نیشتمانی یا تورکی دا، و ژبو ڤێ مەرەمێ چەند کونگرە هاتنە بەستن مینا کونگرەیێ ئەرزەروم و سیواس، ئەڤێن دناڤبەرا هەیفا تەمووزو ئەیلولا سالا ١٩١٩ هاتینە گرێدان[٥]. و بریار هاتە دان ژبو ئێککرتنا کومەل و پارتێن دژی داگیرکەران کار دکەن و دەولەتا تورکیا نوی ل سەر پاشماییێن دەولەتا ئوسمانی بهێتە دانان[٦].

پشتی ب دوماهیک هاتنا شەرێ جیهانیێ ئێکێ ١٩١٤ - ١٩١٨، سەروبەرەکێ سیاسی یێ نوی ل دەولەتا ئوسمانی پەیدابوو، و هەلبژارتنێن چڤاتا نوێنەرێن ئوسمانی ل کانونا ئێکێ ١٩١٩، هاتنە ئەنجامدان و زوربەی ئەندامێن هاتینە هەلبژارتن ژلایەنگرێن بزاڤا کەمالی بووین، دئەنجامدا دان پێدان ب سوزناما نیشتمانی یا تورکی هاتە کرن ل ئەنجوومەنێ نوی[٧].

ژلایەکێ دیڤە هێزێن هەڤپەیمانا دەست ب پلانا داگیرکرنا ئیستەمبولێ کر، وەک بەرسڤەک بو زێدەبوونا هێزا کەمالی یا و ل ٣ی ئادارا ١٩٢٠ بریارا لادانا سەروک وەزیرێن دەولەتا ئوسمانی عەلی رەزا پاشا هاتە دان و ل جهێ وی سالح پاشا (وەزیری دەریایی یێ بەرێ) هاتە دانان [٨].

پشتی ڤێ چەندێ دەسەلاتا لەشکەری یا بەریتانی دەست ب داگیرکرنا تاخێن سەرەکی یێن ئەستەنبولێ کرن ل ١٦ ئادارا ١٩٢٠ێ، و ئەڤ کارە بو جهێ نەرازیبوونا نوینەرێن جڤاتا نوێنەراتیا ئوسمانی، و دئەنجامدا ڤێ جڤاتێ بریارا هەلوەشاندنا خو دەرئێخست پشتی گرتن و دەستبەسەرکرنا ژمارەیەکا زوورا ئەندامێن جڤاتێ، ئەوێن لایەنگریا خو بو

مستەفا کەمال پاشای دیار کری[٩].

پشتی ڤان کاودانان مستەفا کەمال پاشایی بریارا دامەزراندنا جڤاتا نیشتمانی یا تورکی دال ٢٣ی نیسانا ١٩٢٠ کو یا پێک هاتی بوو ژ (٣٥٠) نوینەرا، زوربەی وان ئەندامێن ئەنجومەنی نوینەرێن ئوسمانی هەلوەشیای بوون، و بریار هاتە دان کو مستەفا کەمال ببیتە سەروکێ ڤێ جڤاتێ[١٠].

وەک بەرسڤ دان بو ڤێ کردارێ حکوومەتا ئیستەنبولێ ژلایێ خوڤە بریارا لادانا مستەفا کەمال وەک پشکنینەرێ گشتی یێ لەشکەری لە ئەنادولێ دەرخست و هەروەسا دادگەها لەشکەری یا بلند ل ئیستەنبولێ بریارا سێدارەدانێ دژی وی و چەند سەرکردێن کەمالی ئیمزا کر ل ١١ی گولانا ١٩٢٠[١١].

ژلایەکێ دیڤە ئەو سەرکەفتنێن لەشکەری ئەوێن بزاڤا کەمالی ب دەستڤە ئینایین بو جهێ نەرحەتیا هەڤپەیمانا و ڤەشار خستە سەر حکوومەتا ئیستەنبولێ کو ئەگەر رێککەفتنەکا ئاشتییێ دگەل هەڤپەیمانا موور نەکەتن، دێ دەسەلاتا وێ ل بەشێن ئورووپی ژ دەولەتا ئوسمانی هێتە دویر خستن، لەورا حکومەتا ئیستەنبولێ ب نەچاری ڤە پەیمانا سیڤەر ل ١٠ی تەباخا ١٩٢٠ێ دگەل هەڤپەیمانا مور کر[١٢].

مورکرنا ڤێ پەیمانێ ژلایێ حکوومەتا ئیستەنبولێ ڤە، بو جهێ نەرازیبوونا نیشتمان پەروەرێن تورک، و مستەفا کەمال ئەڤ پەیمانە ب سێدارەدانا تورکیا وەسف کر[١٣]، ودەست ب بەرهنگاریا لەشکەری دژی داگیرکەران حکومەتا ئیستەنبولێ کر[١٤].

هەروەسا ژلایێ خوڤە هەڤپەیمانا بریارا نەهێلانا دەسەلاتا کەمالی دا و فەرمان دا یونانێ کو بەرەف ئەنادولێ بچن، بەلێ هێزێن کەمالی ل شەرێن ئینونوا ئێکێ و ١٩ – ١١ کانینا دووێ ١٩٢١ و دووێ ٣١ ئادار– ١ نیسانا ١٩٢١، شیان بەرسینگێ هێزێن یونانی بگرن و تێک بشکێنن، و لروژا ٩ی ئەیلولا ١٩٢٢ هێزێن کەمالی شیان ئەزمیرێ رزگار بکەن ژدەستێن یونانیا[١٥].

ئەڤ سەرکەفتنێن بزاڤا کەمالی ب دەست خوڤە ئینایین بو ئەگەرێ سەرەکی کو دەولەتێن هەڤپەیمان جودا جودا هەلویستێ خو بەرامبەر کەمالیا بگوهرن و، و ل دویماهییێ پەیمانا مودانیا بهێنە مورکرن دناڤبەرا هەردوو لایەناندا، و بریارا ب دوماهیک هاتنا شەری ل ١١ ی چریا ئێکێ ١٩٢٢ هاتە دان[١٦]، لروژا ١٩ ی چریا ئێکێ ١٩٢٢ هێزێن کەمالی چوونە دناڤ باژێرێ ئیستەنبولێ دا و پشتی بوورینا (١١) روژان مستەفا کەمالی بریارا لادانا حکومەتا ئوسمانی دا، و ٠٥) چریا دووێ بریارا سەربەخویا تورکیا هاتە راگەیاندن[١٧].

ژلای خوڤە بەریتانیا بریار دا کو کێشەیێن خو دگەل کەمالیا برێکێن ئاشتییانە چارەسەر بکەت، و ئەگەر خو ل سەر کیستێ گوهرینا پەیمانا سیڤەر بپەیمانەکا نوی بیت، کو تێدا بەرژەوەندیێن وێ ل دەڤەرێ بهێنە پاراستن[١٨]. ب ڤی شێوەی ل تەموزا سالا ١٩٢٣ پەیمانەکا نوی بناڤێ پەیمانا لوزان دناڤبەرا هەڤپەیمانا و حکومەتا کەمالی هاتە

موركرن، كو دهێته هژمارتن مەزنترین سەركەفتن حكومەتا كەمالی بدەست ڤه ئینای ل سەر ئاستێ سیاسەتا دەرڤه، و زڤراندنا توركیا بو ناڤ جڤاكێ نیڤ دەولەتی[19].

پشتی بەستنا پەیمانا لوزان قوناغەكا نوی ل توركیا دەسپێكر و سەركردێن كەمالی دەست ب چاكسازییێن نافخویی كرن، و ناڤێ كومەلا بەرگری كرنێ ژ مافێن ئەنادول و رومیلی هاتە گوهرین بو پارتا گەل، و هاتە دەستویردان ب شێوەیەكی فەرمی ژلایێ حكومەتا توركی ڤه ل ٩ ی ئەیلێ ١٩٢٣، و مستەفا كەمال هاتە هەلبژارتن وەك ئەمینداری گشتی یێ ڤێ پارتێ، و پاشان بریارا راگەهاندنا كومارا توركیا یانوی ل ٢٩ی چریا ئێكێ ١٩٢٣ هاتە دان[20].

## دووەم

## هوكارێن كارتێكرنا بزاڤا كەمالی ل كومەل و رێكخراوێن كوردی ل كوردستانا باشوور :

هەر ل دەسپێكا پەیدابوونا بزاڤا كەمالی ل دەولەتا ئوسمانی گەلەک هوكار هەبوون كو ئەف بزاڤه بشێن كارتێكرنێ ل كومەل و رێكخراوێن كوردی ل كوردستانا باشوور بكەتن، كو ئەم دشێن بڤی رەنگێ خوارێ جودا بكەین:

### ١- هوكارێن جوگرافی

نزیک بوونا جهێ جوگرافی دناڤبەرا توركیا وكوردستانا باشوور دا، و هەبونا پەیوەندیێن مێژووی دناڤبەرا خەلكێ كوردستانا باشوور و توركیا دا، ئەگەرەكێ سەرەكی بوو كو سەركردێن كەمالی بشێن كارتێكرنێ ل كومەل و رێكخراوێن كوردی بكەن [21].

ژ ئەگەرێ هەڤ سنوور بوونێ كو پتر ژ ٣٠٠كم دناڤبەرا واندا، پەیوەندی و هاتنو چوون گەلەكا ئاسان بوو، و ژبەر كو ئەڤ پارچەیا كوردستانێ بەشەک بوویە ژ دەولەتا ئوسمانی وسەرە ب ئاخا وی بوویە، ئەڤ هوكارە پتر كاریگەرییا وی زێدە بوو دەمێ كێشەیا ویلایەتا میسل دناڤبەرا بەریتانیا و توركیا پەیدابووی، كو توركیا كەمالی داخاز دكر زڤراندنا ویلایەتا میسل بو سەر ئاخا كومارا توركی و بزاڤێن خورت ژ بو ڤێ چەندێ ئەنجام دان و هەروەكی یا دیار كو بارێ جوگرافیێ دەڤەرێ نەبوویە ئاستەنگ درێكا پەیداكرنا پەیوەندییان دگەل كومەل و رێكخراوێن كوردی ل كوردستانا باشوور [22].

### ٢- هوكارێ ئاینی

ب درێژاهیا مێژوویا چەرخێن بوری دا بیروباوەرێن ئایینی موكمترین گرێک بوویە دناڤبەرا توركا و كوردا دا، سولتانێن ئوسمانی عەقیدەو ئیمان بكار ئینایە ژبو ب دەستڤە ئینانا پشتەڤانیا كوردا، و ل دەمێ شەری جیهانیێ ئێكی سەركردێن ئوسمانی بناڤێ شەرێ پیروز –الجهاد المقدس – بانگەوازی دانە كوردان و داخاز ژوان كریە دژی هەڤپەیمانا

شەری بکەن، ول دیف ڤێ بانگەوازیێ هۆزێن تالەبانی و خوشناو چەندین هوزیچن دیتر شەر ل بن ئالایێ دەولەتا ئوسمانی کریە، شێخ مەحمودێ حەفید و شەرکەرێن وی هەر ل بن کارتێکرنا هزرا ئایینی پشکداری دشەرێ شوعەیبە ل باشوورێ عیراقێدا کریبیە[٢٣].

هەر بهەمان شێوە هوزێن هەورامی و دزەیی و هەرکی و بلباس و خوشناو ل دەڤەرێن سەر سنووری دژی لەشکەرێ روسی راوەستیاینە و چەند بەرەییێن ئێککگرتی ل ژێر ناڤێ ئایینی دامەزراندن بو بەرسنک گرتنا داگیرکەران[٢٤].

بزاڤا کەمالی هەر هەمان چەک بکار ئینایە ژبو ئازادکرنا ئاخا دەولەتا ئوسمانی ل دەستێ داگیرکەران، و کوردا رولەکێ مەزن گێرایە دڤێ چارچوڤێ دا، وچەندین فەیلەقێن کورد هاتنە دروستکرن ل بەرەییێن شەری ل سەقاریا، ئەفیون، قەرەحصار و شەرێ ئینونو[٢٥].

سەرکردێن کەمالی هەر ئەڤ چەکە ب کارئینایە ژ بو زڤراندنا ویلایەتا موسل بو سەر ئاخا دەولەتا تورکی، وبزاڤا کەمالی هەولدایە ململانا خو دگەل بەریتانیا بکەتە دچارچوڤەکێ ئاینیدا، وژێدەرێن ئینگلیزی ئەڤێن بەحسێ شورەش و سەرهلدانێن کوردی ل دەڤەرا بادینان ل سالا ١٩١٩ێ، ب شێوەیەکێ بەرچاڤ بەحسێ ئەڤی فاکتەری کریە[٢٦]. هەروەسا سەرکردێن کەمالی کار دکرن ب رێکا هندەک شێخ و مەلایان کو سوزا خەلکێ دەڤەرێ بو تورکان راکێشن، و بزاڤا کەمالی چەندین بەلاڤوک دەرئخستینە ل دەڤەرێ کو تێدا داخازا براییا بسلمانا و پێتڤیا راوەستیانا تورک - کورد - دژی داگیرکرنا «ئاخا بسلمانا ژلایێ کافران» دکر[٢٧].

### ٣- هوکارێ لەشکەری

دەمێ هێزێن لەشکەری یێن بەریتانی ویلایەتا میسل داگیرکری، حکومەتا ئیستەنبولێ دەست ب پلاندانا زڤراندنا وێ کر، و بو ڤێ مەرەمێ ژی عەلی ئیحسان پاشا ( سەرکردێ لەشکەرێ ئوسمانی ل وانێ ) هاتە دەست نیشانکرن [٢٨]. هێزێن ئوسمانی شیان چەندین سەرکەفتنا ب دەست خو ڤە بینیت ل دەڤەرا بوتان، زاخو، ناوچا سندی و گولیا، بەلێ سەرکردێن بەریتانی هزر دمەترسیا ڤێ چەندێ دا کر، وگەف ل حکوومەتا ئیستەنبولێ کرن کو ئەگەر ڤان جورە چالاکیان نەراوەستینیت دێ پێ رابونێن لەشکەری دژی حکومەتا ئیستەنبولێ ئەنجام دەت، و دئەنجامدا لهەیڤا شواتا ١٩١٩ بریارا ڤەکێشانا عەلی ئیحسان پاشا لدەڤەرێ هاتە دان[٢٩].

پشتی پەیدابوونا بزاڤا کەمالی سەرکردێن وێ دەست بپلانا زڤراندنا ویلایەتا میسل کر، ژبوڤێ چەندێ ژی هێزەکا لەشکەری ڤرێ کرە باژیرێ رەواندز ل گولانا ١٩٢١، وهێزێن کوردی-کەمالی دەست بکریارێن دەرکرنا هێزێن بریتانی ل ئاکرێ، دەربەند، هەریر، بێتاس کرن[٣٠]. پشتی ڤان رویدانا حکومەتا ئەنقەرە بریار دا هەبوونا خو ل کوردستانا باشوور زێدەتر لێ بکەت و هێزەکا لەشکەری ب سەرکردایەتیا رەمزی بەگ

هاتە فرێکرن بو رەواندزێ ل ١٧ی ئادارا ١٩٢٢[٣١].

و دەست ب هێزکرنا هەبوونا خویا لەشکەری ل کوردستانا باشوور کر، بو ڤێ چەندێ ژی سەرهەنگ عەلی شەفیق (ئوزدەمیر)[٣٢] هاتە هنارتن بو رەواندزێ ل ٢٢ی خزیرانا ١٩٢٢[٣٣]. و ئوزدەمیر پاشا شیا زیکا سوز و لایەنگریا خەلکی دەڤەرێ بو تورکا بکێشیت، هەروەک رەفیق حلمی دنڤێسیت کو شاندێن سەروک هوزێن کورد ژ باژێرێن جودا جودا دهاتنە بارەگایێ ئوزدەمیری ل رەواندوزێ ژبو دەربرینا لایەنگریا خو بو هێزێن کەمالی[٣٤].

هاتنا لەشکەری کەمالی بو کوردستانا باشوور ئومێدەک ل دەف هندەک سەروک هوزێن کوردی پەیدا کر مینا کەریم فەتاح بەگ (سەروک هوزێ هەمەوەند) و سەید محەمەدێ شێخ (سەروک هوزێ جەباری ) و ئەحمەد ئاغایێ پشدەر ی، کو جارەکا دیتر بچنە ل ژێر دەسەلاتا تورکان دا، و کومبوونەک دناڤبەرا ڤان سەروک هوزان و ئوزدەمیری هاتە رێکخستن، و تێدا بریار هاتە دان کو هێزێن وان پێکڤە هێرشا ببەنە باژێری دەربەند و رانیە ل ٣١ی تەباخا ١٩٢٢[٣٥].

حکوومەتا کەمالی یا بەردەوام بوو ل سەر فرێکرنا هێزێن لەشکەری بو کوردستانا باشوور، و ب هاریکارییا لایەنگرێن تورکا، ئەڤ هێزە شیان باژێرێ کۆیە داگیر بکەن و قائمەقامەکێ تورک لێ بدامەزرینن [٣٦]. هەروەسا هێزەکا لەشکەرێ تورکی هێرش کرنە سەر ربەتکێ و جولکێ و ئاشیتێ و گوندێن دەوروبەر ل ١٤ تیرمەها ١٩٢٣ [٣٧].

ول دەمێ گەرماتیا ململانێ دناڤبەرا بەریتانیا و تورکیا ل سەر ب دەستڤەئینانا ویلایەتا میسل، حکومەتا کەمالی یا بەردەوام بوو ل سەر هنارتنا هێزێن لەشکەری بو کوردستانا باشوور ئەڤەژی دەلیڤەکا خوش بوو، بو لایەنگرێن تورکا ل دەڤەرێ کو تا رادەیەکی پروپاگندەیێ بو زڤراندنا کوردستانا باشوور بو سەر ئاخا دەولەتا تورکی یا نوی بکەن[٣٨].

### ٤- ئەگەرێ سیاسی

پشتی دەسەلاتا بەریتانی سیاسەتا خو گوهری بەرامبەر کوردستانا باشوور، و دەست ب لادانا حکومەتا شێخ مەحمودی کری(٣٩)، و هەولدانێن وێ بو گرێدانا کوردستانا باشوور ب شاهنشینا عیراقێ یا نوی ڤە، هەر وەسا پشت گوه هاڤێتنا ئەوان بەلێنێن داینە کوردان ژبو دامەزراندنا حکومەتەکا کوردی یا سەربەخو ل ژێر سەرپەرشتیا بەریتانیا[٤٠].

ئەڤ سیاسەتا نەرینی ئەڤا دەسەلات بەریتانی بەرامبەر کوردستانا باشوور بکارئینای بو ئەگەرێ پەیداکرنا دژایەتییێ دژی بەریتانیا، و چەندین کومەل و پارتێن کوردی پالدان بەرەف لایەنگریا تورکا بچن، و داخازا هاریکاریا وان بکەن ژبو دەرخستنا لەشکەرێ بەریتانی ژ کوردستانا باشوور[٤١].

### ٥- پروپاگندێن تورکی

سەرکردایەتا بزاڤا کەمالی دەست ب هەوەکا بەرفرەهـ کر ل ویلایەتا میسل ژ بو ب دەستڤەئینانا هەڤکاریا کوردا دململانەیا خودا دگەل بەریتانیا، و شوینکارێن کەمالی دەست ب بەلاڤکرنا بەلاڤوکێن خوییێن تام دای ب سوزا ئاییبی و داخازا شەڕێ پیرۆز ل دەڤەرێ کرن(٤٢). و سولتان بەگ کورێ موسەلەت (قائمقامێ بوتان) و وەحید عەلی بەگ (والیێ وانی) ب ئەرکێ بەلاڤکرنا پروپاگندەیێن کەمالی ل دەڤەرێن بەرواری بالا، گویان، سندی، گولی، سورچی، بارزان رابووینە، هەروەکی کابتن میلز د راپورتا خویا هەیڤانەدا بو سەرکردایەتیا گشتی یا هێزێن بەریتانی ل عێراقێ دیار دکەت، کو ئەگەرێ سەرەکی یێ نە ئارامیێ ل دەڤەرا زاخو بو وێ بزاڤا سەروک هوزێ شەرناخێ (عەلی بەگێ) و هەڤکاری وی (عەبدولرەحمان ئاغایێ شەرناخی) پێرابووین و ئەو پروپاگندەیێن ئەو بەلاڤە دکەن دژی هەبوونا دەسەلاتا بەریتانی ل دەڤەرێ نە[٤٣].

هەروەسا مس بیل[٤٤] دنامەیێن خودا بەحسێ پروپاگندەیێن کەمالی یا ل کوردستانا باشوور دکەت و دبێژیت ل ١٩ی ئادارا ١٩١٩ هێزێن لەشکەرێ بەریتانی سەروک هوزا شەرناخێ (عەبدولرەحمان ئاغا ) دەستەسەر کریە و چەندین نامە دگەل دا هاتینە گرتن، کو دڤان نامادا داخاز ژخەلکێ دەڤەرێ هاتیە کرن کو هێزێن بەریتانی ژ کوردستانێ بکەنە دەر[٤٥].

شوینکارێن کەمالی ل کوردستانا باشوور بزاڤێن خو خورتر لێ کرن و هەول داینە کومەل و رێکخراوێن کوردی بو لایەنێ خوڤە کێشن و ب تایبەتی پشتی کێشەیا ئاکنجیکرنا ئاسووریا ل دەڤەرا بادینان پەیدا بووی، داخاز ژ سەروک هوز و زانا و رەوشەنبیرا هاتە کرن کو دژی ڤێ پیلانا بەریتانی ب راوەستن و پێکڤە کاربکەن بو نەهێلانا دەسەلاتا بەریتانی ل کوردستانا باشوور[٤٦].

### ٦- کارگریا بەریتانی یا توند

ل وی دمێ سەرکردێن ئیداری و لەشکەریێن بەریتانی سەرەدەریەکا رەق و زڤر دگەل خەلکێ بێ دەسەلاتێ دەڤەرێ دکر، سەرکردێن بزاڤا کەمالی "بگوتن " داخازییا بریینیا تورک و کوردا دکر، و بەرێ خەلکی ددا پشکداریا نوینەرێن کوردا دحکوومەت و پەرلەمانێ تورکی یێ نوی دا، ئەڤ چەندە ژی بو ئەگەرێ هندێ کو خەلکێ دەڤەرێ ب چاڤەکێ کەرب و کینێ تەماشەی دەسەلاتا بەریتانی بکەن و بەرەف لایەنگریا کەمالی یا بچن[٤٧]. ل دور ڤێ چەندێ ویلسون (جێگرێ حاکمێ مەدەنی ل عێراقێ ) دبێژیت : ب کوشتنا حاکمێ سیاسی یێ بەریتانی (بیرسون) ل زاخو، دیار دبیت کو ئەفسەرێن بەریتانی چەند دنەزان بوون درەفتارێن خودا دگەل هوزێن کوردی[٤٨].

سەبارەت رەفتارێن سەرکردێن ئیداری و لەشکەریێن بریتانی ل کوردستانا باشوور، عەبدولمنعم غولامی دبێژیت کو رەفتارێن سەرکردێن بەریتانی و توندوتیژیا وان بەرامبەر

خەلکێ دەڤەرێ، ئەگەرەکی سەرەکی بوو، کو خەلک دژی دەسەلاتیا بریتانیا براوەستیت و داخازا هاریکاریا تورکان بکەن ژ بو رزگارکرنا دەڤەرێن خو ژڤێ دەسەلاتێ[٤٩].

هەروەسا ویلسون دجهەکێ دی تردا دووپات دکەتن کو رەفتارێن توندوتیژانە، ئەڤێن مستر بیل دژی هەردووک سەروک هوزێن زێبار و ئاکرێ "فارس ئاغا و بابەکر ئاغا" ی ئەگەرین سەرەکی بووینە کو خەلکێ دەڤەرێ دژی دەسەلاتا بەریتانی ب رەواستن و پاشان پەیوەندیا دگەل هێزێن کەمالی گرێبدەن[٥٠].

سەرکردێن لەشکەری و ئیداریێن بەریتانی نە بتنێ دژی خەلکێ بێ دەسەلات توندوتیژی بکاردئینان، بەلکو ڤێ سیاسەتێ زاناو زەلامێن ئایینی ژی ڤەگرتن، و گرتنا شێخ بەهائەدینێ نەقشەبەندی و سووتنا تەکیا نەقشەبەندی ل بامەرنێ، کارێ شوینکارێن کەمالی بساناهی تر لێ کر، کو خەلکەکی هاندەن دژی دەسەلاتا بەریتانی ب راوەستن ب ناڤێ پاراستنا ئاینێ ئیسلامی[٥١].

**٧- ئەگەرێ ئابووری**

ل دەسپێکا هاتنا لەشکەرێ بەریتانیا بو کوردستانا باشوور، دەست ب بەلاڤکرنا ئازووقەی ل سەر هاولاتیان کر، و ئەڤەژی بو جهێ دلخوشیا خەلکێ دەڤەرێ، چونکی دڤوناغا زوو ر یا ئالووز ژلایێ ئابووری ڤە دەرباز دبوو، ژبەر ئەنجامێن خرابێن شەرێ جیهانیێ ئێکێ یێن هاتینە سەرێ خەلکێ دەڤەرێ[٥٢].

بەلێ دەسەلاتا بەریتانی بەردەوام نەبوو ل سەر ڤێ سیاسەتێ، بەلکو ئەفسەرو حاکمێن بەریتانی ل باژێرکێن کوردستانێ سیاسەتەکا ئابووری یا توند دژی خەلکی بکار ئینا، رابوون ب سەپاندنا باجەکا قورس ل سەر جوتیاران، و ل سەر خەلکێ دەڤەرێ یا پێدڤی بوو کو ئەو باجێن ل سەردەمێ ئوسمانیا ددان هەمی یا بدەنە دەسەلاتا بەریتانی[٥٣]. و ل سلێمانیێ میجەرسون (حاکمێ لەشکەرییێ بەریتانی) لیستەک ب ٢٣ ێ بەندان دەرئێخست و باجە زێدە کر ل سەر چەندین کەلوپەلێن خارنێ ل باژێری سلێمانیێ[٥٤].

سەرکردێن لەشکەری و ئیداریێن بەریتانی هێز دژی وان کەسێن دانا باجێ گیرودکر یان ژی ددانا باجێ رەڤیبا بکاردئینا، ئەڤ سیاسەتە بو ئەگەرێ گیروبوونا پێشخستنا بەرهەمێن چاندنێ، و بەرهەم بەرەڤ کێماتیێ دچوو، و هەروەسا نرخێ بەرهەمێن کشتوکالی ل بازاری بەرەڤ زێدەبوونێ دچوو[٥٥].

ئەڤێ سیاسەتێ خەلک بێ ئومێد کر ژ دەسەلاتا بەریتانی و خەون ب هندێ ڤە دیتن کو جارەکا دیتر دەسەلاتا تورکا بزڤریتەڤە، بەلکو ژ وان باجێن قورسێن دەسەلاتا بەریتانی ل سەرسەپاندین قورتال بێن[٥٦].

## سێیەم

## هەلویستێن رێکخراو و کومەلێن کوردی ژ کەمالی یا

سەرەڕای هندێ کو بەری شەرێ جیهانیێ ئێکێ چ کومەلێن سیاسیێن کوردی ل باشوورێ کوردستانێ نەهاتبوونە دانان، بەلێ کوردێن ڤێ دەڤەرێ د زووربەی بزاڤێن سیاسییێن د چوارچوڤەیی کومەلێن کوردی مینا کورد تەعاون و تەرەقی جەمعیەتی، چڤاتا هیڤی، کوردستان تەعالی جەمعیەتیداپشکداری دکرن[٥٧].

پشتی ب دوماهیک هاتنا شەرێ جیهانیێ ئێکێ چەند گروپەکێن سیاسی ل باژێرێ سلێمانیێ پەیدابوون ژوانا پاشڤەرۆیێن هەڤالبەندێن ئوسمانی کو ژێرا دگوتن (تورک خوا ز- جل خوار ) کو دژی بەریتانیا بوون، و پروپاگندە بو بەرژەوەندییا تورکان دکرن، کو پێک هاتبوون ژ کاربەدەستێن مەزن و هندەک مەلاو ئەفسەرێن سەردەمێ دەولەتا ئوسمانی، کو بو زڤراندنا بەژەوەندیێن خو یێن ژ دەستچوویی بزاڤ دکر[٥٨]. ول دیف نڤیسینا شێخ لەتیف پارتا ئیسلامی یا کورد شیایە خەلکی ل دوور خو کوم بکەت، کو ئارمانجا وێ رێککەفتنە دگەل تورکان ب مەرجەکی دان ب سەربەخوییا کوردستانێ بهێتە دان، و پرانیا ئەندامێن ڤێ پارتێ ژ مروڤێن ئاینی و سەروک هوز و هژمارەکا ئەفسەرێن کوردێن دناڤ سوپایێ ئوسمانیدا پێکهاتبوو مینا عەباسێ مەحموود ئاغای، سەید عەبدولای سەید حەسەن، سەید حەسەن سەید محەمەد مفتی، تاهیر ئەفەندی و ئەمین ئەفەندی[٥٩].

ل دیف نامەیەکا محەمەد سالح (مدیر مال بەرواری)[٦٠] ل ئامێدیێ ل تیرمەها ١٩١٩ بو والیێ وانێ ب ناڤێ (جەمعیا محەمەدی) داخازا هنارتنا قائمقامەکی یان ژی هنارتنا لەشکەری دا دژایەتیا ئینگلیزا بکەن، ڤێ کومەلێ بزاڤێن چاک هەبووینە ل دەڤەرا بادینان و رەنگە ئەو رێککەفتنا دناڤبەرا سەروک هوزێن کوردی هاتیە مورکرن ل ئامێدیێ هەر ل بن ناڤێ جەمعیا محەمەدی بیت[٦١].

هەروەسا ل سلێمانیێ چەندین شانێن رێکخستنی ل دویف هزرا بەلشەفیک هاتنە دامەزراندن ب سەرکردایەتیا جەمال عرفان[٦٢]، مینا کومەلا (بەرزی وەلات - کوردستان - گزنگ - فیداکارانی کورد - وەتەن پەروەران ) ، ئەڤ شانەیە زوور دنهێنی بوون و سەرئێک پروگرام دچوون و چالاکیێن خو ئەنجام ددان دژی مایتێکرنا بیانیا دناڤ کوردستانێ دا و چەند بەلاڤوک ل دور ڤێ چەند بەلاڤە کرینە[٦٣].

پشتی تێکچوونا پەیوەندییا دناڤبەرا بەریتانیا و شێخ مەحموودێ بەرزنجی (١٨٨١- ١٩٥٦) و رووخاندنا حکومەتا کوردستانێ یا ئێکێ، تێکچوونا تەناهی و سەقامگیریێ و زێدەبوونا لایەنگرێن کەمالی یا ل کوردستانا باشوور، دەسەلاتا بەریتانی جارەکا دی بزاڤ کرن بو زڤراندنا دەسەلاتداریا خو ل دەرڤەی و کێمکرنا کارتێکرنا کەمالیان[٦٤]. بو ڤێ مەبەستێ ژی (کومەلا سەربەخۆیی کوردستان) هاتە دامەزراندن ل سلێمانیێ ب سەرکردایەتیا حەمدی بەگ بابان [٦٥]، و یاپێکهاتی بوو ژ لاوێن نشتیمان

پەروەر، ئاغا، ئەفەندی، شێخ و مەلا، بەگزادێن بابان، کاسبکارێن ناڤ بازاری و سەروک هوزێن دەڤەرێ[٦٦]، مەرەما ڤێ کومەلێ دامەزراندنا کوردستانەکا سەربەخو ل ژێر سەرپەرشتیا بەریتانیا، و بەرسینگگرتنا زێدەبوونا دەسەلاتا کەمالی ل کوردستانا باشوور بوو[٦٧].

پشتی سەروکێ کومەلێ سەرەدانا سلێمانییێ کری گەهشتە باوەرەکێ کو دەسەلاتداریا بەریتانی مەرەما وێ ژ دامەزراندنا ڤێ کومەلێ بتنێ پەیداکرنا تەناهی و سەقامگرییێیە ل دەڤەرێ و بەرسنگگرتنا پروپاگندێن کەمالییە، و حکوومەتا بەریتانی رێ نادەتە نشتیمان پەروەرێن کورد پتر ژڤێ داخاز بکەن، بریارا ڤەکێشانا خو ژ سەرکردایەتیا کومەلێ دا و دئەنجامدا، ئەڤ کومەلە تووشی لاوازی و هەلوەشیانێ بوو[٦٨].

ژلایەکێ دیڤە دەمێ حکوومەتا بریتانی سیاسەتا خو هەمبەری کوردا گوهری، وپاشگەزبووی ژوان بەلێنێن داینە سەرکردێن کورد، و حکوومەتا کوردستانێ ل سلێمانی رووخاندی، بێ ئومێدییەک ل دەڤ نیشتیمان پەروەرێن کورد هەمبەری دەسەلاتا بەریتانی پەیدابوو، و بەرەڤ لایەنگریا تورکان چوون ، وەک فشارەک ل سەر دەسەلاتا بەریتانی بو بجهـ ئینانا سیاسەتەکا پتر ئیجابی بەرامبەر کێشەیا نەتەویی یا کوردی[٦٩].

دڤی بارودوخێ نازکدا کومەکا فەرمانبەرێن کورد ئەڤێن ل دام و دەزگەهێن میری یێن ئوسمانی کار دکر و چەندین زەلامێن ئایینی، رابوون ب دامەزراندنا (کومەلا نهێنی کورد) ل هاڤینا ١٩٢٠، ب سەرپەرشتیا ئەحمەد تەقی کەریم، فەتاح نوری باویل ئاغا، عەباس محەمەد ئاغا. و چالاکیێن ڤێ کومەلێ دەرباز بووینە ژ دەرڤەی سنوورێ سلێمانییێ و ئەڤ کومەلە شیایە لایەنگریا شێخ ئەحمەدێ بارزانی و فارس ئاغایێ زێباری و ئەمین سولان بدەست خوڤە بینیت[٧٠].

ئارمانجا ڤێ کومەلێ گرێدانا پەیوەندییا دگەل بزاڤا کەمالی ب مەرەما ب دەستڤەئینانا هاریکاریا چەکی و پارەی بو بەرگری کرنا داگیرکرنا بەریتانیا بوو، و بو خورت کرنا پەیوەندییان کومەلێ ئەحمەد تەقی هنارتە ویلایەتا وانێ بو بەستنا چەندین هەڤدیتنا دگەل سەرکردێن لەشکەرێن کەمالی، و ل وێرێ رێککەفتنەک هاتە مورکرن کو تێدا هاتبوو کو مەفرەزەکا لەشکەرێ تورک بهێیە رەوانەکرن بو رەواندزێ ل گولانا ١٩٢١[٧١].

چالاکیێن کومەلێ بشێوەیەکی بەرفرەهـ ل باژێرێ رەواندزێ بەربەلاڤ بوون، ئەندامێن کومەلێ ب هاریکاریا هێزێن تورکی، لەشکەرێ بەریتانی ژ باژێری هاتە دەرئێخستن و ئەنجوومەنەکێ میللی هاتە دامەزراندن بو رێڤەبرنا کاروبارێن ئیداریێن باژێری، کو زوربەی ئەندامێن وێ لایەنگرێن تورکان بوون[٧٢].

ئەنجوومەنێ میللی ب هەڤکاری دگەل ئەو هێزێن تورکی ئەڤێن ل دەڤەرێ هەین، دەست ب هێرشکرنێ ل سەر بارەگایێن لەشکەری بەریتانی ل ئاکرێ و باتاس و رانیا و زێبار کرن، ب مەرەما دەرئێخستنا وان ل باژێرێن کوردستانێ و دامەزراندنا دەسەلاتا

کوردی ل ژیگر سەرپەرشتیا تورکان[٧٣].

پشتی سەرکردنێن کەمالی هاریکاریا کوردان ب شێوەیەکێ پراکتیکی بەرچاڤ دیتی بریار ل ڤرێکرنا ئوزدەمیر ی بو رەواندزێ دا، بو ب هێزکرنا دەسەلاتا تورکی ل رەواندزێ و ئەو دەڤەرێن دەسەلاتا بەریتانی لێ هاتیە دویرکرن[٧٤].

جل خوار و لایەنگرێن تورکان ل باژێرێ سلێمانیێ زێدەتر لێ هاتن، پشتی تێکچوونا پەیوەندییا دناڤبەرا بەریتانیا و شێخ مەحمود، کومەلا نهێنی کورد ئەڤ چەندە ب دەلیڤە زانی و دەست ب رابوونا رولێ (وساطە) دناڤبەرا پەیداکرنا پەیوەندییا دناڤبەرا شێخ مەحمود و ئوزدەمیر پاشای، و د ئەنجامدا شێخ مەحمود قایل دبیت شاندەکی ب نوێنەرایەتیا رەفیق حلمی و ئەحمەد تەقی رەوانەی ئەنقەرە بکەتن، ژبو گەنگەشەکرنا جورێ هاریکاریا کو تورک پێشکێشی کوردان دکەت[٧٥].

شاندێ ناڤبری درێکا خودا ل رەواندزێ رێککەفتنەک دگەل ئوزدەمیر پاشای مورکر، و خالێن وێ پێکهاتبوون ژ دامەزراندنا کوردستانەکا سەربەخو و ب سەرکردایەتیا شێخ مەحمود، کو سنوورێن وێ دناڤبەرا قەزا شەمدینان ل باکوور و زنجیرە چیایێن حەمرین ل باشوور و سنوورێن ئیرانێ ل روژهەلات و ریبارێ دیجلە ل روژئاڤا ڤە، بەرامبەری ڤێ چەندێ حکوومەتا کوردستانا باشوور دێ دەستێ هاریکاریێ بو ترکیا درێژ کەتن د هەر شەرەکێ ژ دەرڤە دا[٧٦].

پشتی ڤان پێشکەفتنێن سیاسی و لەشکەری ل کوردستانا باشوور پەیدابووین، مەترسی ل دەف دەسەلاتا بەریتانیا پەیدابوو کو دێ بەرژەوەندیێن وانێن ئابووری و سیاسی هێنە تێکدان، ژبەر ڤێ چەندێ بەریتانیا دەست ب گوهرینا سیاسەتا خو کر، دەلیڤە هاتە خوشکرن بو زڤرینا مستەفا پاشا یاملکی بو سلێمانیێ، و هەر وەسا دەلیڤە هاتە خوشکرن بو دامەزراندنا کومەلا کوردستان ل خزیرانا ١٩٢٢ ب سەرکردایەتیا مستەفا پاشایێ یاملکی و بریار هاتە دان کو روژنامەیەک وەک زمانحالێ کومەلێ بهێتە دەرکرن ل ژێر ناڤێ (بانگی کوردستان) ل ٨ی تەباخا ١٩٢٢[٧٧].

کومەلا کوردستان بزاڤێن زوور کرینە ژ بو بەرسنگرتنا پروپاگندەیێن کەمالیا، و دانانا رادەیەکی بو دەسەلاتا تورکا ل کوردستانا باشوور، و پشتی پەیدابوونا پەیوەندیەکا ب هێز دناڤبەرا تورکان و شێخ مەحموودی دا کومەلێ هەولدایە ڤێ پەیوەندیێ ب دوماهیک بینیت و ناکوکییا دناڤبەرا بەریتانیا و شێخ مەحموود ب دوماهیک بینێن، بو ڤێ چەندێ ژی کومەلێ داخاز ژ سمکو شکاک کریە کو سەرەدانا سلێمانیێ بکەتن بو ئەنجامدانا ڤی کاری[٧٨].

سەرەرای هەولێن بەرچاڤ یێن کومەلێ بو دووماهیک ئینانا پەیوەندییا دناڤبەرا شێخ مەحموود و کەمالیا، بەلێ، ڤان هەولان سەرنەگرتن و شێخ مەحموود ب کارتێکرنا دەوروبەرێن خو بەردەوامی دا ڤان پەیوەندییا ب مەرەما گڤاشتنێ ل سەر دەسەلاتا بەریتانی بو گهورینا سیاسەتا خو بەرامبەری کوردا[٧٩].

ئەڤ هەلویستێن ژێک جودا دناڤبەرا شێخ مەحمود و کومەلا کوردستان، سەبارەت پەیوەندیێن شێخ مەحمود دگەل تورکان، بو ئەگەرێ پەیدابوونا ناکوکییەکا دژوار دناڤبەرا سەروکێ کومەلێ و شێخ مەحموودی، شێخ مەحموودی مستەفا پاشا یاملکی تومەتبار کر کو دیڤەلانکێ ئینگلیزایە و کار ژبو بەرژەوەندێن وان دکەت و بریارا قەدەغەکرنا کارێ کومەلێ دەرخست و هەروەسا روژناما بانگ کوردستان داخست و ل گوری وێ روژنامەکا دی ل ژێر ناڤێ (روژ کوردستان) دەرخست[٨٠].

ژلایەکێ دی ڤە لایەنگرێن تورکان بڤێ چەندێ تنێ رازی نەبوون، بەلکو پشتی ڤەکێشانا هێزێن بریتانی ژ سلێمانیێ، هێزەکا عەشایری ب سەرکردایەتیا کەریم فەتاح بەگێ هەماوەندی هێرش کرە سەر ئەنجوومەنی مللی یێ سلێمانیێ و مستەفا پاشا یاملکی هاتە دەستەسەرکرن ژلایێ لایەنگرێن تورکان ڤە[٨١].

ئەڤ کارێ هاتیە ئەنجامدان ژلایێ لایەنگرێن تورکان ڤە، بو جهێ نەرازیبوونا ئەندام و لایەنگرێن کومەلا کوردستان، و د ئەنجامدا شیان مستەفا پاشای ژ گرتیخانەیا سەرای دەربێخن و پاشان مستەفا پاشا بەرەڤ بەغدا چوویە، و ل وێری کارێ کومەلێ ب رێڤە بریە[٨٢].

پشتی پەیدابوونا کێشەیا ویلایەتا میسل، ڤێ کومەلێ چالاکیێن زوور ئەنجام دان بو بەرسنگرتنا پروپاگندەیا تورکان ل کوردستانا باشوور و ل ١ی چریا ئێکێ ١٩٢٤ یادداشتەک پێشکێشی کومەلا گەلان کریە، و تێدا داخازیێن تورکا و مافێن وان ل ویلایەتا میسل ب نەوەیی دەرخستیە، و دیار کریە کو چ پەیوەندی دناڤبەرا کوردا و تورکا نەماینە پشتی رووخاندنا خیلافەتا ئیسلامی[٨٣].

پشتی تێکچوونا پەیوەندییا دناڤبەرا شێخ مەحموود و بەریتانیا، کومەلەکا نهێنی ل دووماهیا سالا ١٩٢٢ ل سلێمانیێ هاتە دامەزراندن ب مەبەستا پشتەڤانیکرنا کەمالی یا، هەروەک روژنامەیا بانگ کوردستان دیارکری کو ئەندامێن ڤێ کومەلێ هەسپەکێ زین کری ئامادەکریە بو پێشوازی کرنا ئوزدەمیر پاشای ل سلێمانیێ[٨٤]. و ئەندامێن ڤێ کومەلێ پروپاگندە ل دور هاتنا لەشکەرێ تورکی بو سلێمانیێ دکرن، و دژایەتیا وا ئەفسەرو منەوەرێن سوز و لایەنگریا دەسەلاتا بەریتانی دکر[٨٥].

ژلایەکێ دیڤە پشتی بێ ئومێد بوونا ناسیونالستێن کورد ژ پەیدا بوونا کوردستانەکا سەربەخوو، نەخا سمە پشتی رووخاندنا حکومەتا شێخ مەحموود یا دووێ ژلایێ دەسەلاتداریا بەریتانی، هەروەسا ئەو کوشتارا گەلێ کورد ل کوردستانا باکوور تووش بوویێ، درانداپەتیا تورکان و مەرەمێن وان یێن ڤەشارتی بەرچاڤ کرن، ل ڤی کاودانێ نازک نەچار بوون بریارا گرێدانا کوردێن کوردستانا باشوور دگەل دەولەتا عێراقا نوی بدەن نەک تورکا، چونکی هەلبژارتنا سییێ دگورێ دا نەبوو[٨٦]. و ژبو مەرەما خورتبوونا هزرا دژایەتیا تورکان و ب هێز ئێخستنا دەسەلاتا بەریتانی ل ویلایەتا میسل، ل ١٤ی شواتا ١٩٢٥ ێ ل خانەقا خالدێ نەقشەبەندی ل سلێمانیێ کومەلا (جەمعیەتی مودافعەی

وەتەن) هاتە دامەزراندن[٨٧].

ئارمانجا ڤێ کومەلێ هەروەکی دپروگرامێ وێ دا هاتی بەرگری کرن ژ ویلایەتا میسل دژی پروپاگندەیێن تورکان، و گرێدانا ویلایەتا میسل ب عێراقێ ڤە ب مەرجەکی کو مافێن کەلتووری و ئیداری بو کوردان بهێنە دان[٨٨]. ڤێ کومەلێ رولەکێ مەزن گێرایە دناڤ هەمی تەخ و چینێن کومەلگەها کوردی دا بو قایل کرنا هزرا گرێدانا ویلایەتا میسل ب دەولەتا عێراقێ ڤە، ب مەبەستا پاراستنا مافێن گەلێ کورد، هەروەکی ڤێرسن (سەروکێ لژنا نێڤ نەتەوەیی ل دور کێشەیا میسل) دبێژیت کو زوربەی وان کوردێن چاڤپێکەتن دگەل ئەنجام داین داخاز کریە دگەل عێراقێدا بژین و نەرازیبوونا خو دەربریە دژی هەر گرێدانەکێ دگەل تورکاندا[٨٩].

هەروەسا دڤێ قوناغا نازکا بزاڤا نشتیمانییا کوردی تێدا دبووری، چەندین پارت و کومەلێن دیتر هەبووینە، بزاڤ دکرن ژ بوو دویرخستنا پروپاگندەیێن تورکا ل کوردستانا باشوور، هەر وەکی ڤێرسن دبیرهاتنێن خودا دنڤیسیت، کو پارتا نشتیمانییا کورد (نەتەوەیی) ل بەغدا چاڤپێکەتن دگەل کریە و یادداشتەک برێکا وی گەهاندیە لژنا ڤەکولینێ ل دور ویلایەتا میسل، و تێدا دیارکریە کو کوردا پێخوش نینە دگەل تورکادا بژین و ئەگەر دگەل عێراقێ بن دڤێت خاندن ب زمانێ کوردی بیت و رێڤەبەرێن رێڤەبەریا و کارمەندێن وان ژی کوردبن[٩٠].

پشتی گەرم بوونا ناکوکیێ دناڤ بەرا بەریتانیا و تورکیا بو دەستڤە ئینانا کێشەیا میسل، دەسەلاتا بەریتانی رێدا گەلەک رێکخراو و پارتێن کوردی کاربکەن دژی پروپاگندەیێن تورکان، هەر دڤێ بوارێ دا کومەلا خوسەریا کورد – لقێ میسل[٩١]، ل ٧ی چریا دووێ ١٩٢٤ یادداشتەک دا چڤاتا گەلان[٩٢]، و روژناما (الموصل) دهژمارە (٩٠٥)ێ ل چریا دووێ ١٩٢٤، دەنگ و باسێن بلندکرنا یادداشتێ بەلاڤە کربوون، کو تێدا دیار کربوو کو پرانیا خەلکێ ویلایەتا میسل کوردن و ژرەگەزێ ئاری نە و هیچ پەیوەندییەک دناڤبەرا وان و تورکاندا نینە، و داخازا مافێ چارەنڤیسێ بو کوردان کریە ژ کومەلا گەلان، و دیار کریە کو ئیدی هیچ کوردەکی ڤیان نینە جارەکا دی بزڤرینە دژێر دەسەلاتا تورکان دا[٩٣].

ژلایەکێ دیڤە ڤێ کومەلێ رولەکێ مەزن گێرایە بو هاندانا سەروک هوزو عەشیرێن کوردی، ئەڤێن ل سەر توخیبێ تورکیا کو بەرهنگاریا هێزێن کەمالی بکەن، هەروەک بەلگەنامەکا بەریتانی ڤێ چەندێ خویا دکەت، کو چەندین مەلبەندێن رێکخستنی ل سەر سنووری دئامادەنە کو دژی تورکان شورەشێ بکەن، و هەروەسا ڤێ بەلگەنامەیێ دیار کریە کو کومەلێ داخاز ژ دەسەلاتا بەریتانی کریە دەستویرێ بدەنە وان بو دەرێخستنا روژنامەکێ ژبو بەرهنگاریا پروپاگندەیێن تورکا، و هەروەسا دەستویریێ بدەنێ بو ڤەکرنا لقەکا کومەلێ ل زاخو دا بشێت پەیوەندیێن موکمتر دگەل هوزێن گویان و شەرنەخ و هوزێن دیترێن دەڤەرێ گرێدەتن، و چەند ئەفسەرەکێن بەریتانی رەوانەی سنووری بکەن دا

سەرپەرشتیا چالاکییێن کومەلێ بکەن[٩٤].

پشتی چارەسەرکرنا کێشەیا ویلایەتا موسل دناڤبەرا بەریتانیا و تورکان دا، هەولێن دەسەلاتا بەریتانی ل باشوورێ کوردستانێ هەمی بو هندێ دچوون، کو دژایەتیا هەر کومەلەکێ بکەت کو مەترسییێ ل سەر تورکان یان عێراقێ پەیدا بکەتن، ل دویف ئەو ریکەفتنامەیا سێ قوولی ئەوا دناڤبەرا بەریتانیا - عێراق - تورکیا هاتیە مورکرن ل ئەنقەرە ل ٥ خزیرانا ١٩٢٦[٩٥] بگرێدانا ڤێ پەیمانێ گوهرینەکا مەزن د مەیدانا سیاسی یا دەولیدا پەیدا بوو و بزاڤا سیاسی یا کوردی هاتە پارچەکرن، و هەر کومەلەکێ ل دوور چارچوڤەیێ خویێ سنوورێ نیڤ دەولەتی کار دکر، بەلێ دگەل هندێ ژی هاریکاری و گرێدان دناڤبەرا پارتێن کوردی ل هەر چار پارچەیێن کوردستانێ بەردەوام بوو.

## پوختە

پشتی ب دوماهیک هاتنا ڤەکولینێ دیار دبیت کو هوکارو پالدەرێن زوور هەبووینە کارتێکرنا خو ل سەر وان کومەل و پارتێن ل کوردستانا باشوور هاتینە دامەزراندن هەبیت، مینا جهێ جوگرافیا کوردستانا باشوور کو ب شێوەیەکی سروشتی گرێدایە ب ئاخا تورکیا ڤە، و پروپاگندەیێن تورکی یێن تام دای سوزا دینی، و هەروەسا کارگێریا بریتانی یا توند ل دەڤەرێ، و هوکارێ ئایینی و مێژوویی کو ئەڤە ب سەدەهان سالە کوردو تورک پێکڤە گرێداین.

هەر وەسا دڤێ ڤەکولینێ دا هاتیە دیارکرن کو دوو جورە هەلویست هەبوویە ژلایێ کومەل و پارتێن کوردستانا باشوور هەمبەری بزاڤا کەمالی، جورێ ئێکێ ئەو کومەل و پارتێن لایەنگیریا تورکان دکر وداخاز دکر جارەکا دی دەسەلاتا ئیسلامی یا تورکان بزڤریتە کوردستانا باشوور، کو زووربەی ئەندامێن ڤان کومەل و پارتا پێکهاتیبوون ژ زانایێن ئاینی و فەرمانبەرێن خانەنشین و ئەفسەرێن سوپایێ ئوسمانی و هندەک سەروک هوزێن کوردی، مینا کومەلا نهێنییا کورد و جەمعیا محەمەدی و پارتا ئیسلامیا کوردی. جورێ دووێ پێکهاتبوو ژ وان کومەل و پارتێن دژی پروپاگندەیا تورکان کار دکرن و خەبات دکرن بو نەهێلانا دەسەلاتا تورکی ل کوردستانا باشوور، مینا کومەلا سەربەخویی کوردستان و کومەلا کوردستان و جەمعیەتا مودافعەی وەتەن و پارتا نشتیمانیا کورد.

هەر وەسا دڤێ ڤەکولینێ دیار دبیت کو پشتی دەسەلاتا بریتانیا سیاسەتا خو بەرامبەری کوردستانا باشوور گهوری و حکوومەتا شێخ مەحموودی رووخاندی، زووربەی رەوشەنبیرو سیاسییێن کورد بەرەڤ نزیک بوون و لایەنگریا کەمالی ڤە چوون، وەک گڤاشتنەک ل سەر دەسەلاتا بەریتانیا کو سیاسەتەکا پتر ئیجابی بەرانبەر کوردا بکاربینیت.

هەر وەسا دڤێ ڤەکولینێ دا دیار دبیت کو پشتی پەیدابوونا شورەشا شێخ سەعیدێ پیران و کوشتارا سالا ١٩٢٥ ئەوا دژی کوردێن کوردستانا باکوور ژلایێ تورکاڤە هاتیە

ئەنجامدان، روویێ کەمالیا یێ ڤەشارتی هاتە ئاشکرا کرن و دیار بوو کو تورک هەر دبەردەوامن ل سەر سیاسەتا نەهێلانا مللەتێ کورد، ژ بەر ڤێ چەندێ کومەل و پارتێن کوردی کار ژ بو گرێدانا کوردستانا باشوور ب دەولەتا عێراقێ ڤە ب مەرجەکی مافێن کەلتووری و ئیداری بو کوردان بهێنە دابینکرن.

هەر وەسا دڤێ ڤەکولینێ دا هاتیە دیارکرن کو دەسەلاتا بەریتانی رولەکێ سەرەکی گێرایە ددامەزراندنا کومەل و پارتێن دژی دەسەلاتا تورکی کار دکر و هاندانا وان کریە کو چالاکییێن خو ئەنجام بدەت دژی ڤەگەریانا تورکان بو کوردستانا باشوور مینا جەمعیەتا مودافعەی وەتەن و کومەلا کوردستان.

ل دوماهییێ بو مە دیار دبیت کو ئەو پەیوەندییێن دناڤبەرا بزاڤا کەمالی و پارت و کومەلێن کوردی پەیدابووی نەگەهشتبوونە ئاستەکێ بەرز، ژ بەر نەبوونا باوەریەکا موکم دناڤبەرا هەردوو لایەناندا و ئەڤ پەیوەندییە هەر مانە دئاستێ نزمدا و چ پێشکەتن بخوڤە نەدیت.

## پەراوێز:

١. بو پتر پێزانینا ل دور ڤی بابەتی بنێرە : جورج لنشوفسكي، الشرق الاوسط في الشؤون العالمية، ترجمة جعفر الخياط، (بغداد، ١٩٦٤)، ج ١، ص ٢، عمر الديراوي، الحرب العالمية الاولى، ط ٥، (بيروت، ١٩٧٧)، ص ص ٤٦٥ - ٤٦٩.

٢. مادەی (٧)ێ رێ ددەتە هەڤپەیمانا بو داگیرکرنا هەر باژێرەکی یان خالەکا ئیستیراتیجی کو هەڤپەیمان دبینن یاگرنگە بو پەیداکرنا ئارامیێ و هێزکرنا جهێن خو ل دەڤەرێ. بو پتر پێزانینان بنیرە:

**Bernard lewis,The Emerance of modern Turkey,(London ,1961) ,p.23g.**

٣. مستەفا کەمال: ژ دایکبووی باژێرێ سالونیک، دەرچوویێ کولیژا لەشکەری ل ئستەنبولێ سالا ١٩٠٥، ل سالا ١٩١٠ ێ چوویە فەرەنسا بو تەمامکرنا خاندنا خویا لەشکەری، پشکداری دشەرێن دەولەتا ئوسمانی ل تەرابلس ١٩١١ و بەلقان ١٩١٣ کرییە، هەروەسا دشەرێ جیهانیێ ئێکێ دا سەرکردێ هێزا (١٩)ێ ل دەردەنیل بوو. احمد نوري النعيمي، الحياة السياسية في تركيا الحديثة ١٩١٩ - ١٩٣٨ ،(بغداد ،١٩٩٠)، ص ص ١٢-٢٥.

٤. حنا عزو بهنان، التطورات السياسية في توركيا ١٩١٩-١٩٢٣، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٩، ص ٦٠.

٥. ل دور کاروبارێن ڤان هەردووک کونگرەیان بنێرە:

**Feofrey lewis, Turkey ,LLondon, 1965).**

٦. ابراهيم الداقوقي، اكراد تركيا، (دمشق، ٢٠٠٣)، ص ٥١.

**7. Bernard Lewis, op.cit. ,p245.**

٨. حنا عزو بهنان، المصدر السابق ، ص ص ٥٧-٥٨.

٩. ارمسترونج، الذئب الاغبر، مصطفى كمال ،(القاهرة، د.ت)، ص ١٣٣.

١٠. كارل بروكلمان، تاريخ الشعوب الاسلامية، نقله الى العربية نبيه امين فارس ومنير البعلبكي، ط ٥، (بيروت، ١٩٦٨) ص ٦٩٠.

١١. بو پتر پێزانینا بنێرە: عبدالعزيز یاملکی، بنەمالی یاملکی و ژیاننامەی مستافا پاشا یاملکی، ئامادە و بەراوێژکردنی سەدیق سالح، هەزارمێرد(گوڤار)، ژمارە (٤)، سلێمانی، ئەیلول ١٩٩٨، ل

ل٢٦ - ٤٥.
١٢. احمد عبدالرحيم مصطفى، في اصول التاريخ العثماني، (بيروت، ١٩٨٢)، ص ٣٠٦، فؤاد حمه خورشيد مصطفى، القضية الكردية في المؤتمرات الدولية، (اربيل، ٢٠٠١)، ص ص ١٥-١٧.
١٣. حنا عزو بهنان، المصدرالسابق، ص ٧٧.
١٤. قاسم خلف عاصي الجميلي، تطورات السياسية الداخلية التركية ١٩٢٣ - ١٩٢٨، رسالة الماجستير غير منشورة مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٥، ص ٣٧.
١٥. حنا عزو بهنان، المصدر السابق، ص ٨٧.
١٦. قاسم خلف عاصي الجميلي، العراق والحركة الكمالية ١٩١٩-١٩٢٣، اطروحة دكتوراه مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٩٠، ص ١٨.
١٧. مصطفى الزين، ذئب الاناضول، (لندن-قبرص،١٩٩١)، ص ١٤٣.
١٨. فاضل حسين، مؤتمر لوزان واثاره على البلاد العربية، (بغداد، ١٩٦٧) ص١٢.
**19.Musul-Kerkuk lli lligili Arsiv Belgeleri 1525-1919,T.C.Basbakanlik Devlet Arsivleri Genel Mudur Lugu osmanli Arsividaire Basbanligig (Ankara, 1993) ,pp42-55.**
**20. Feofre lewis,op.cit.,p.73.**
٢١. نصيف جاسم المطلبي، موقع تركيا الجيوستراتيجي و اهميته للعراق، اطروحة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة بغداد ،١٩٨٦، ص ص٢٤٦-٢٥٢.
٢٢. فاضل حسين، مشكلة الموصل، دراسة في الدبلوماسية العراقية - الانكلزية - التركية وفي الرأي العام، ط ٣، (بغداد ١٩٧٧) ص ٥٠.
٢٣. كەمال مەزهەر ئەحمەد، كوردو شەڕێ شوعەيبە، روشنبيرى نوێ (گۆڤار)، ژمارە (١٢٥)، بغداد، بهارى ١٩٩٠، ل ١٢، سروة اسعد صابر، كردستان بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل ١٩١٤ - ١٩٢٦، دراسة سياسية ثقافية، (اربيل ،٢٠٠١)، ص ٤٣.
٢٤. طاهر احمد حويزى، مێژووى كۆيە، (بەغدا، ١٩٨٥)، بەرگى دووەم، بەشى يەكەم، ل ٢٧؛ ارنولد تالبون ويلسون، بلاد مابين النهرين بين ولائين، ترجمة فؤاد جميل، (بغداد، ١٩٦٩) ص ,٢٨٠
٢٥. نژيار نعمان لقمان الباجلورێ، الحركة القومية الكردية التحررية في كوردستان تركيا ١٩٢٧ - ١٩٣١، ودراسة تاريخية - سياسية ،(دهوك، ٢٠٠٧)، ص ٢٥.
٢٦. ارنولد تالبون ويلسون، المصدر السابق، ص ٢٨٠، اليزابيت بيرغون، جيركووت بيل، من اوراقها الشخصية ١٩١٤- ١٩٢٦، تقديم عبدالرحمن منيف، ترجمة نمير عباس مظفر، (بيروت، ٢٠٠٢)، ص ٥٢٠.
٢٧. عبدالمنعم الغلامي، ثورتنا في شمال العراق، (بغداد، ١٩٦٦) ص ص٢٥ - ٢٧ محمد امين عثمان، حصاد الحنظل، (دهوك، ١٩٩٨)، ص ٦٥.
٢٨. المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب، ترجمة جعفر الخياط، ط٢، (بيروت، ١٩١٧)، ص ٢٠٥.
٢٩. جرجيس فتح الله، يقظة الكورد - تاريخ سياسي ١٩٠٠ - ١٩٢٥ ومما يتناول النزاع على جنوب كوردستان امام عصبة الامم مع الوثائق والمذكرات المتعلقة به، (اربيل، ٢٠٠٠)، ص ,١٦٠

٣٠. رەفیق حلمی، یاداشت، کوردستانی عیراق و شورشەکانی شێخ مەحموود ،(بەغد، ١٩٥٦)، بەرگی شەشەم، ل٢٢.
٣١. هەمان ژێدەر، بەرگی شەشەم، ل٢٢.
٣٢. ئوزدەمیر یان سەرهەنگ عەلی شەفیق کو ئەفسەرەکێ تورکان و ب رەسەن چەرکەسێ مسری بوو سالا ١٩١٩ گەهشتبوو بزاڤا کەمالیا، و سەرکردایەتیا هێزێن کەمالی دکر ل دەڤەرێ. بو پتر پێزانینا بنێرە: س. ج. ادموندز، کورد وترک وعرب، سیاسة ورحلات وبحوث عن الشمال الشرقي من العراق ١٩١٩ - ١٩٢٥، ترجمة جرجیس فتح الله ،ط٢، (اربیل، ١٩٩٩)، ص ص ١١٢- ١١٤.
33. Hassan Arfa,The Kurdish An Historical and political studay,(London, 1966) ,p.115.
٣٤. رەفیق حلمی،یاداشتەکان، بەرگی شەشەم، ل ل٢٥ - ٢٦,
٣٥. قاسم عاصي الجمیلي، العراق والحرکة الکمالیة، ص ١١٩.
36 -Repo Iraq Administration for the period 1922 - 1923 ,(London, 1924),p.35 .
٣٧. بیار مصطفی سیف الدین، السیاسة البریطانیة تجاه ترکیا وأثرها في کوردستان ١٩٢٣ - ١٩٢٦، (اربیل، ٢٠٠٤)، ص ١٨٥.
٣٨. بو پتر پێزانینا بنێرە، فاچل حسێن، مشکله الموصل...، ص ص ١٢٠ - ١٣٠.
٣٩. ل دور رووخاندنا ڤێ حکوومەتێ بنێرە : ئاکو عەبدولکەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩١٨ - ١٩٣٢، لێکۆڵینەوەیەکی سیاسییە، (سلێمانی ، ٢٠٠٢)، ل ل ٥٥ - ٦٠.
٤٠. ل دور سیاسەتا بەریتانیا بەرامبەر کوردستانا باشوور بنێرە : خلیل مصطفي عثمان الاتروشي، کوردستان الجنوبیة (العراق) في سنوات الاحتلال والانتداب البریطانیین ١٩١٨ - ١٩٣٢، رسالة ماجستیر غیر منشورة مقدمة الی مجلس کلیة الاداب، جامعة دهوك، ٢٠٠٥.
٤١. کەریم شارەزا ، القضیة الکردیة وسیاسة بریطانیا تجاهها في النصف الاول من القرن العشرین، گولان العربي (مجلة) العدد (٣٢)، اربیل، کانون الثاني ١٩٩٨، ص ٧٧.
٤٢. قاسم خلف عاصي الجمیلي، العراق والحرکة الکمالیة ١٩١٩ - ١٩٢٣، ص ص ١١٤ - ١١٥.
43. Mills To G.H.Q.L., Apr.1,gth ,1919.( J.A.B)،(٦٢١ - ٢٠)،Air
٤٤. خانما بیل : غیرترود لوسیان بیل (١٨٦٨ - ١٩٢٦ )، ژ دایک بوویا بەرتانیایە و خواندنا خو ل زانکویا ئیکسفورد تەمام کریە دبوارێ مێژوویێ دا، کارێن سیاسی ل مسرو عێراقێ ئەنجام داینە، کارتێکرنەکا مەزن هەبوویە ل سەر دانانا سیاسەتا بریتانی ل عێراقێ و کوردستانێ. بو پتر پێزانینا بنێرە محمد یوسف القریشي، المس بیل وأثرها في السیاسة العراقیة، (بغداد، ٢٠٠٣ ).
٤٥. المس بیل، فصول من تاریخ العراق القریب، ص ١٩٤.
٤٦. ریاض رشید ناجي الحدیدي، الاشوریون في العراق ١٩١٨ - ١٩٣٦ ،(بغداد، ١٩٧٥ - ١٩٧٦)، ص ١٢٩.
٤٧. انور المائي، الاکراد في بهدینان ،(الموصل، ١٩٦٠ )، ص ص ٢٠ - ٤٠.
٤٨. وەرگرتن ژ: عزیز الحاج ، القضیة الکردیة في العشرینات، ط٢، (بغداد، ١٩٨٥ )، ص ١١٤.
٤٩. عبد المنعم الغلامي، المصدر السابق، ص ٣٣.
٥٠. ارنولد تالبون ویلسون، المصدر السابق، ص ٥١.
٥١. بو پتر پێزانینا ل دور سۆتنا تەکیا نەقشەبەندی ل بامەرنی بنێرە، مصطفی بامەرنی، ئەڤەیە

بامەرنێ ! ؟ ،(دهوک، ٢٠٠٤ )، صلاح هروری، ئەگەرو پالدەرێن رویدانێن سالا ١٩١٩ ل دەڤەرا بادینان، دهوک (گوڤار)، ژمارە (١٦)، دهوک، ئادارا ٢٠٠٢، ل ١١.

٥٢. سعيد عبود السامرائي، مقدمة في تاريخ الاقتصاد العراقي، (النجف الاشرف، ١٩٧٣ )، ص ٧٥.

٥٣. البرت م. منتشاشفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ترجمة هاشم صالح التكريتي، (بغداد ،١٩٧٨ )، ص ٣٠٨.

٥٤. پێشكەوتن (روژنامە)، ژمارە (٨)، سلێمانێ ،١٧ ێ حوزیرەن ١٩٢٠، ل ١.

٥٥. سعيد عبود السامرائي، المصدر السابق، ص ٧٥.

٥٦. كمال مظهر احمد، دور الشعب الكردى فى ثوره العشرين، (بغداد، ١٩٧٨)، ص ص ١٥ - ١٩.

٥٧. عەلی تەتەر، بزاڤا سیاسی ل كوردستانێ ١٩٠٨ - ١٩٢٧، (هەولێر، ٢٠٠٢)، ل ١٩٦.

٥٨. یادداشتەكانی شێخ (لەتیف)ی حەفید، سا غكردنەوەی: كەمال نوری، (هەولێر، ١٩٩٥)، ل ل ٧٨ - ٨٠.

٥٩. هەمان ژێدەر، ل ل ٧٨ - ٨٠.

٦٠. محەمەد سالح كورێ مستەفا ئەفەندیێ ئامیدیێ ژ بنەمالا یەحیایێ مزوریریە، نزیكی ٢٥ سالا (مدیر مال ) بوویە ل ئامێدیێ گەلەک یێ خودان شیان و دەسەلاتدار بوویە. عەلی تەتەر، ژێدەرێ پێشوو، ل ١٩٩.

٦١. محمد طاهر العمري الموصلي، مقدرات العراق السياسية، (بغداد، ١٩٢٥ )، مج٢، ص ١٢٧.

٦٢. جەمال عرفان : ئێک ژ رەوشەنبیرو سیاسەتڤانێن كورد ە، ل شەرێ جیهانیێ ئێكێ هاتبوو ئێخسیركرن و ل روسیا ل ژێر هزرا بەلشەفیک هشیاری سیاسی وەرگرتیە، پشتی شەری دهێتە بەردان و دهێتە سلێمانیێ، ل كانینا ئێكێ ١٩٢٢ دهێتە تیروركرن، جل خوار دهێتە گونەهباركرن ب تیروركرنا وی. محمد عبدالله كاكەسور، الدور السياسي والثقافي لضباط الكورد في الحركة الكردية في كوردستان الجنوبية (١٩٢١ - ١٩٤٥ )، رسالة ماجستير مقدمة الي مجلس كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، ١٩٩٨، ص ص ٥٣ - ٥٦.

٦٣. ئەحمەد خواجە، چیم دی، (بەغدا، ١٩٦٧ )، بەرگی یەكەم، ل ٦١.

٦٤. كوردستان لە بەڵگەنامەكانی كونسلی فرەنسی لە بەغدا لە ساڵی ١٩١٩، نەجاتی عەبدوڵلا لە فرەنسییەوە كردوونی بە كوردی و پێشەكی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، (سلێمانی، ٢٠٠٤)، ل ل ١٤ - ١٥.

٦٥. حەمدی بەگ كورێ محەمەد پاشا (الخديوى)یە، ل ئیستەنبولێ ژ دایک بوویە، پشتی شەرێ جیهانیێ ئێكێ زڤریتە بەغدا و ژبەر هەبوونا ناكوكیێ دگەل بەریتانیا و حكوومەتا عێراقێ چوویە لەندەن و سالا ١٩٦٢ ول ویرێ وەفات بوویە. عەلی تەتەر، ژێدەری پێشوو، ل ٢٠٨.

٦٦. بو پتر پێزانینا ل دور ڤێ كومەلێ بنێرە: خليل مصطفى عثمان الاتروشى، المصدر السابق، ص ص ٢٠٤ - ٢٠٧.

٦٧. ئەحمەد باوەر، ئوزدەمیرو كورد، كورتەیەک لە مێژووی ململانێی بەریتانیا و تورک لە كوردستانی باشووردا، (سلێمانی، ٢٠٠٠)، ل ٣١.

٦٨. رەفیق حلمی، ژێدەری پێشوو، بەرگی یەكەم و ل ١٢٩.

٦٩. قاسم خلف عاصي الجميلي، العراق والحركة الكمالية ١٩١٩ - ١٩٢٣، ص ١١٥.

٧٠. عثمان علي، دراسات في الحركة الكردية المعاصرة ١٨٣٣ - ١٩٤٦، دراسات تاريخية وثائقية،

تقديم الدكتور عمر الهموندي، (اربيل، ٢٠٠٣) ص ٣٧٨.
٧١. ئەحمەد تەقی، خەباتی گەلی کورد لە یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی، لاپەرەیەک لە شۆڕشەکانی شیخ مەحموود و سمکو و هەستانەکەی رواندز، ریکخستن و ئامادەکرن بۆ چاپ جەلال تەقی، (بەغدا، ١٩٧٠)، ل ل ٤٥ - ٤٦.
٧٢. رەفیق حلمی، ژیدەری پیشوو، بەشی دووەم، بەرگی شەشەم، ل ٢٢.
٧٣. عبدالرحمن ادريس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد (البرزنجي) والنفوذ البريطاني في كردستان العراق منذ عام ١٩٢٥ حتي عام ١٩٣٢، (بغداد، ٢٠٠٥)، ص ٢٧٥.
**74. Hasan Arfa,op.cit.,p.115.**
٧٥. ئەحمەد تەقی، ژیدەری پیشوو، ل ٦٩.
٧٦. م. لازاريف، المسالة الكوردية ١٩٢٣ - ١٩٤٥، النضال والاخفاق، ترجمة : د. عبدي حاجي، (اربيل، ٢٠٠٧)، ص ٦٥.
٧٧. بانک کردستان (روژنامه)، ژماره (١)، سالی یەکەم، ٢ ئاغستوس ١٩٢٢ ،ل ١.
**78. F.O.,(371),(6347),(2262), from political officer sulaimani to the secretary of high commissioner, 29 -7- 1922.**
٧٩. رەفیق حلمی، ژیدەری پیشوو، بەرگی سێیەم، ل ٢٥.
٨٠. هەمان ژیدەر، بەرگی سێیەم، ل ٢٨.
٨١. هەمان ژیدەر، بەرگی سێیەم، ل ٢٥.
٨٢. هەمان ژیدەر، بەرگی سێیەم، ل ٢٥.
٨٣. خليل مصطفى عثمان الاتروشي، المصدر السابق، ص ١٨١.
٨٤. بانک کردستان (روژنامە)ژمارە (٩) ،٨ تشرين اول ١٩٢٢،ل١.
٨٥. رەفیق حلمی، ژیدەری پیشوو، بەرگی سێیەم، ل ٢٥.
**86. Perter sluglett, Britainin Iraq 1914 - 1932 ,(London,1976) p.p.114 - 118.**
٨٧. ژیانەوە (رۆژنامە)، ژمارە (١٦)، ١٩ شباگ ١٩٢٥، ل ل ١ -٣.
٨٨. د. ك. و، ملف تشكيل دولة كردية ١٩٢٤ - ١٩٢٦، سكرتارية فخامة المندوب السامي للعراق الي مقر القيادة الجوية، سري، جي.١.أو ١١٨، ١ شباگ ١٩٢٦.
٨٩. نقلا عن: جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ص ٣٥٩.
٩٠. وەرگرتن ژ : عەلی تەتەر، ژیدەری پیشوو، ل ٢٥٢.
٩١. ل دور چەوانیا دامەزراندنا ڤێ کومەلێ ل کوردستانا باشوور بنێرە، خليل مصطفى عثمان الاتروشي، المصدر السابق، ص ٢٧٤.
٩٢. عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكردية التحررية، ملاحظات تاريخية ودراسات اولية ،(اربيل، ٢٠٠١ )، ص ٦٠٠.
٩٣. المصدر نفسه، ص ٦٠٠.
٩٤. د. ك. و، ملف تشكيل دولة مستقلة ١٩٢٤ - ١٩٢٦، دائرة ضباط الخدمات الخاصة، بغداد، الي مقر القيادة الجوية بغداد، سري، دي/٦، في ٨ تشرين الاول ١٩٢٤.
٩٥. روبرت اولسن، المسالة الكردية في العلاقات التركية الإيرانية، ترجمة محمد احسان، (اربيل، ٢٠٠٢)، ص ٧.

## خلاصة البحث

## موقف الجمعيات والمنظمات الكوردية في كوردستان الجنوبية من الكماليين (١٩١٩-١٩٢٦)

**خليل مصطفي عثمان**
**كلية الاداب- قسم التاريخ**

يلقي البحث الضوء على مرحلة تاريخية مهمة مرت بها الحركة التحررية الكردية في كوردستان الجنوبية، مرحلة ما بعد انتهاء الحرب العالمية الاولى وبدأ الصراع بين بريطانيا وتركيا من اجل الاستحواذ على ولاية الموصل، فبعد انتهاء الحرب ظهرت جمعيات سياسية عديدة في كوردستان الجنوبية تختلف فيما بينها في المنهج و المعتقد السياسي، منها ذات التوجه القومي، والآخر ذات التوجه الإسلامي، بينما انفرد بعض الجمعيات بالتوجه البلشفي.

كما يلقي البحث الضوء على عوامل تأثر الجمعيات الكردية في كوردستان بالحركة الكمالية ،منها العامل الجغرافي، حيث يتصل كوردستان مباشرة بأراضي الدولة التركية مما سهل عملية الاتصال، وكذلك العامل الديني والتاريخي اللذين يربطان الكرد بالدولة (التركية) منذ أكثر من أربعة قرون، فضلا عن الدعاية التركية المغلفة بالطابع الديني التي كان ينشرها وكلاء الكماليون في المنطقة، كما ان سوء الإدارة البريطانية في المنطقة والسياسة المتشددة التي مارسها الضباط والحكام البريطانيين إحدى أهم عوامل اندفاع الكورد نحو التعاطف مع الحركة الكمالية ودعمها.

وفي هذه المرحلة التاريخية الحرجة من عمر الحركة التحررية الكوردية، ظهر تيارين مختلفين فيما يتعلق بموقفها من النشاط الكمالي في كوردستان الجنوبية، التيار الأول وتمثل بالجمعية السرية الكوردية والجمعية ا المحمدية والحزب الاسلامي الكوردي، الداعية الى العودة الى احضان الدولة التركية وربط كوردستان الجنوبية بها، وكان معظم الموءيدين لهذا التيار يتكون من رجال الدين وضباط الجيش العثماني السابقين والموظفين وبعض رؤساء العشائر الكوردية. أما التيار الثاني المتمثل بجمعية استقلال الكورد وجمعية كوردستان وجمعية الدفاع الوطني وحزب الاستقلال، فكان يدعوا الى طرد الأتراك من كوردستان الجنوبية، حيث ان معظم هذه الجمعيات قد تأسست باشراف بريطاني من اجل صد الدعاية الكمالية والحد من انتشار نفوذها في كوردستان الجنوبية.

## Abstract

### The attitude of Kurdish organisation and instuties in southern kurdistan from the kamaly (1919-1926)



**Khalil M. osman**
**Dept of History - Collage of Arts - Duhok**



**The research paper sheds light on an important historical period that the Kurdish liberation movement in southern Kurdistan passed, the period after the end of the first world war and the struggle between Britain and Turk for owning the state of Mosul. With the end of the war many political association appeared in Southern Kurdistan that were different in system and political belief ؛ some of which were nationally oriented, others Islamic ally oriented , and some others with Blushful orientation.**

**This paper also deals with why the Kurdish association in Kurdistan were affected by the Kamaly movement. One of them is the geographical factor, where Kurdistan is directly connected with the Turkish arias which facilated their communication, also the religious and historical factors which connect the Kurds with the Turkish government for over four centuries. Besides, the Turkish propaganda framed with the religious impression which was send out by the Kamaly agents in the area. In addition, the mismanagement of the British government and the extremist policy used by the British officers and governors were important factors that led the Kurds to support the Kamaly movement.**

**In this difficult historical stage in the life of the Kurdish liberation movements appeared different in attitude toward the Kamaly activity in Southern Kurdistan. the first movement representing the Kurdish secret association, Muhammadia association, and the Kurdish Islamic party that call for the return to Turk and connecting it to Southern Kurdistan. Most supporters to this movement were religious scientists, previous ottoman army officers, employees, and some heads of the Kurdish trides. while the other movement representing the Kurdish independence association, Kurdish association, national defense association, and independence party that call for driving the Turks out of southern Kurdistan, where most of these associations were established under the british supervision for resisting the Kamaly propaganda and limiting the spread of its authority in southern Kurdistan.**

# پرۆژەی دانانی ئەتڵەسێکی زمانی بۆ هەرێمی کوردستان*

**پ.د. یوسف شریف سعید**
**بەشی زمانی کوردی- کۆلیجی زمان- زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر**

## چەمک و پێناسەی ئەتڵەسی زمانی

مەبەست لە ئەتڵەسی زمانی کۆکردنەوەی زانیاری و دێتاکانە لەسەر زمانێک و تۆمارکردنیانە لەسەر نەخشەی جوگرافی جیاجیادا، کە ئەمەش لە ئەنجامی گەشەکردنی لێکۆڵینەوەکانی شێوەزارەکانی زمانە، بە تایبەتی لە قوتابخانە زمانەوانییە نوێکانەوە سەری هەڵداوە و بە زمانەوانی پانتایی یان رووبەر ناسراوە. مەبەست لە پانتایی رووبەری جوگرافییەکە دیاردە زمانییەکانی تێدا بڵاو بۆتەوە.

زمانەوانەکان هەر وەک چۆن پێناسەی جیا جیایان لە بواری زماندا هەیە، بەهەمان شێوە پێناسەی جیاوازیان بۆ ئەتڵەسی زمانی هەیە. هەندێک لەو پێناسانە دەخەینە روو :

١- رەنگدانەوە و دەرخستنی جیاوازیی نێوان شێوەزارەکان بەپێی جیاوازیی شوێنیان لە نەخشەی جوگرافیدا، کە بەهۆی دانانی نیشانە زمانییەکانەوە جێبەجێ دەکرێت و رۆڵێکی گرینگ لە لێکۆڵینەوە زمانییەکاندا دەبینێت. (**Bussman:1996:281**)

٢- تێڕوانینێکە بۆ راڤەکردنی دیاردە زمانییەکان و دانانی ئاماژە زمانییەکانە لەسەر نەخشەی جوگرافیدا لە رێگای یاساکانی گرێدانی تایبەتمەندییەکانی زمانێکی ناوچەیی دیاری کراوە بە شێوازی ئاماژەکردن.

٣- جۆرێکە لە نەخشەکێشانی جوگرافیی زمان بە هۆی دیالێکتە جیاوازەکانەوە (خلیل محمود :٩٥: **arabicacademy.org**)

٤- کۆمەڵە نەخشەیەکە گۆڕانکاری زمان بە شێوەیەکی جوگرافی لەسەر نەخشەکان تۆمار و دابەش دەکات، هەندێ جاریش بە ئەتڵەسی شێوەزارەکان دەناسرێت (**Linguistic atlas define.com**). بەشێوەیەکی گشتی لە ئەنجامی ئەم پێناسینانەوە دەردەکەوێت کە ئەتڵەسی زمانی ئەو کۆمەڵە نەخشانەیە کە تایبەتمەندی و دیاردە زمانییەکانی زمانێکی دیاریکراو بەهۆی بەکارهێنانی هێمای تایبەت بۆ دیاردەکان و دانانیان لەسەر نەخشەکاندا بۆ پیشاندانی جیاوازی دەنگسازی و وشەسازی و واتاسازی زمانەکە بەکار دەهێنرێت.

### کورتە مێژوویەکی سەرهەڵدانی ئەتڵەسی زمانی

سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم بابەتە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی

---

* رێکەوتی وەرگرتن ٢٠٠٩/٧/١٢

سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە و بەداهێنانێکی ئەوروپی لەقەڵەم دەدرێت، رابەرەکانی جۆرج فینکەر (**Gorg Wenker**)ی ئەڵمانی و چولز چیلیرۆن (**Golz Gillieron**) ی فەرەنسییە کە هەر زانایەک لەمانە رێبازی تایبەت بە خۆی لە شێوازی دانانی ئەتڵەسی زمانی بۆ وڵاتەکەی هەبووە، یەکەم ئەتڵەسی زمانی لە مێژوودا بۆ زمانی ئەڵمانی دانراوە کە زانای ئەڵمانی فینکەر لە ماوەی دە ساڵ (١٨٧٧ – ١٨٨٧) بە ئەنجامی گەیاندووە. شێوازو رێگاکەی بەم شێوەیە بووە:

لیستێکی لە چل رستەی زمانی ئەڵمانی دروست کردووە و لە رێگای پۆستەوە بۆ پەنجا هەزار بەڕێوەبەری قوتابخانە جیاجیاکانی هەموو ناوچەکانی ئەڵمانیدا ناردووە، وەڵامی چل و پێنج هەزار لیستی بۆ گەڕاوەتەوە، رستەکان جۆراوجۆر بوون لە رستەی سادە و لێکدراو و ئاڵۆز پێکهاتبوون. لە رێگای پۆلینکردنی ئەم لیستانەوە فینکەر توانی رووپێوی زمانی ئەڵمانی ئەنجام بدا، چونکە داوای لە بەڕێوەبەری قوتابخانە جیاوازەکان کردبوو بەرامبەر بە هەر رستەیەک کە لە لیستەکاندا هاتووە رستەی شێوەزاری ناوچەکانیان تۆمار بکەن. بەمەش توانی جیاوازی نێوان ناوچە جیاوازەکان لەسەر نەخشەی ئەڵمانیادا بەرجەستە بکات. دوای فینکەر میتزکا **Mitizka** لە ساڵی ١٩٣٩ لیستێکی لە دوو سەد وشەی فەرهەنگی ئەڵمانی دروستکرد بە هەمان شێوە بۆ پەنجا هەزار بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوچە جیاوازەکانی ئەڵمانیای نارد. ئەنجامی ئەو کارەش بووە هۆی فراوانکردنی ئەتڵەسەکەی ئەڵمانی.

دووەم ئەتڵەس لە جیهاندا بۆ زمانی دانیمارکی کراوە. ماریۆس کریستین (**Maryas Kristen**) لە نێوان ساڵانی ١٨٩٨ – ١٩٢١ ئەنجامی دواە و کاریگەری فینکەری تەواو پێوە دیارە، بەڵام لە کارەکەی فینکەر لە هەموو روویێکەوە تەواو بچووکترە.

چولز چیلیرۆن **Golz Gillieron** لە ساڵی ١٨٩٦ شەش سەد و سی و نۆ ناوچەی وەکو خاڵی سەرەکی بۆ ئەنجامدا ئەتڵەسی زمانی فەرەنسی دەستنیشان کردووە، لەم کارەیدا حەفت سەد گێڕەرەوەی زمانی دەستنیشان کردووە لە رێگای ئەمانەوە دێتاکانی کۆ کردۆتەوە لە سەر نەخشەی جوگرافی فەرەنسی تۆماری کردوون، لەو حەفتسەد کەسە گێڕەرەوەیە، شەستیان ژن بوون ئەوانی تر لە چین و توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵگای فەرەنسی بوون. بەم شێوەیە توانی لە ساڵی ١٩٠٢ بەشێکی ئەتڵەسی فەرەنسی بڵاو بکاتەوە.

تەواوی ئەتڵەسەکەش لە ساڵی ١٩١٢ بڵاو کرایەوە (**J.Kchambers** ١٤:٢٠٠٤ **Andprtertrud**: ئەتڵەسی ئیتاڵی لەلایەن کارل جویبێرگ (**Karil Joberg**) لە ساڵی ١٩٣١ بڵاو کرایەوە کە ناوبراو قوتابی چیلیرۆن بوو هەمان شێوازی مامۆستاکەی لە دانانی ئەتڵەسەکەدا گرتبووە بەر، تەواوی پرۆژەکە لە ساڵی ١٩٤٠ بڵاو کرایەوە.

ئەتڵەسی ئەمریکی و کەنەدی لەدوای ئەتڵەسەکانی ئەوروپی سەری هەڵدا، یەکەم هەنگاوی پراکتیکی ئەتلەسەکە لە نیو ئینگلاند لە ساڵی ١٩٣٩ دەستی پێکرد و

لەساڵی ١٩٤٣ پرۆژەکە تەواو بوو و بڵاوکرایەوە. بەڕێوەبەری پرۆژەکە هانز کوراس (Hanez Kurath) بوو. شایانی باسە کە هەر یەک لە پۆل چورمێر (Poll Sechermrier) و جاکۆب جود Jacob Jud کە دوو هاوکاری سەرەکی چیلیرۆن بوون لە دانانی ئەتڵەسی فەرەنسیدا و بەشدارییان کردبوو لە دانانی ئەتڵەسی ئیتاڵی و سویسری بەمەبەستی مەشقپێکردنی تیمەکانی ئامادەکار بۆ دانانی ئەتڵەسی زمانی ئەمەریکی و کەنەدی سەردانی ئەمەریکایان کرد و زۆربەی ئەو کەسانەی کە بەشدارییان لەو پرۆژەیە کردبوو لەلایەن ئەوانەوە راقەیان پێکرا. بەڵام بەهۆی جەنگی جیهانی و مردنی سەرۆکی تیمەکان، ئەتڵەسەکە دواکەوت، لەگەڵ ئەوەشدا دواتر کار لەسەر ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی ئەمەریکا کراو ئەتڵەسێکی فراوان بۆ ئەو زمانە دانرا (Ibid: ١٦-١٨).

### ئەتڵەسی زمانی عەرەبی

یەکەم ئەتڵەسی زمانی عەرەبی لەلایەن برچستراسەر Bergstrasser لەسەر دیالێکتەکانی سوریا و فەلەستین لە ساڵی ١٩١٥ نەخشێنراوە (جۆنستون: ١٣ :١٩٨٣) لە ساڵی ١٩٤٦ ج. کانینۆ (J.Contineau) شەست نەخشەی جیاجیای بۆ دیالێکتی حۆران کە دەکەوێتە نێوان بیابانی ئیراق و سوریە داناوە، لەپاڵ ئەمەشدا ئەتڵەسی شێوەزارەکەشی داناوە لە ساڵی ١٩٦١ ئەبو فەزل سنووری بڵاوبوونەوەی جوگرافی دیالێکتەکانی میسری بۆ پارێزگاکانی رۆژهەڵاتی میسری داناوە. لە ساڵی ١٩٨٦ پ. بنێشتد (P.Behnsted )ی بەڕەگەز ئەڵمانی دوو ئەتڵەسی بۆ شێوەزارەکانی میسری و یەمەنی داناوە لە پێنج سەد و شەست و یەک نەخشەی جیاوازدا حەفت سەد ناوچەی جیاوازی گرتۆتە خۆ و چوار سەد دیاردەی زمانی بۆ جیاوازی دەنگسازی و وشەسازیی ئەم شێوەزارانە لەسەر نەخشەکاندا تۆمار کردووە. هەروەها پ. بنێشتد جگە لە شێوەزاری قاهیرەی پایتەختی میسر ئەتڵەسی بۆ هەموو شێوەزارەکانی میسری داناوە. ئەم کارە لە ماوەی نێوان ١٩٨٥-١٩٩٤ ئەنجامدراوە. لەهەمان کاتدا ئەتڵەسی بۆ شێوەزارەکانی باکوری یەمەن لە نێوان ساڵانی ١٩٨٥-١٩٩٢ داناوە. بەهەمان شێوە کاری لەسەر ئەتڵەسی سووری کردووە بەڵام هێشتا تەواو نەبووەو بڵاو نەکراوەتەوە ( کیتس فریستغ :١٥٧ : ٢٠٠٣ ).

لەو چەند ساڵانەی دوایی ئەمازیغییەکان گرنگییان بە زمانەکەی خۆیان داوە. لەساڵی ٢٠٠٧ مینەی فقیوی کە مامۆستایە لە بەشی لێکۆڵینەوەکانی ئەفریقیا و زمانە رۆژهەڵاتییەکان لە زانکۆی خنت ی بەلجیکی ئەتڵەسی زمانی ئەمازیغی لادێیی پێشکەش بە زانکۆی لیدن لە هۆلەندا کردووە. ئەم ئەتڵەسە لە چوار بەش پێکهاتووە لەبەشی یەکەمدا باس لە سەرهەڵدانی زمانەوانی جوگرافی لە لێکۆڵینەوەکانی زمانی ئەمازیغی کردووە. بەشی دووەمی بۆ بەراوردکردنی لایەنی فۆنۆلۆجی دیالێکتەکانی زمانی ئەمازیغی و لادێیی تەرخان کردووە. لە بەشی سێیەمدا جیاوازی لایەنەکانی مۆرفۆلۆجی

و سینتاکسی لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەلی بۆ کراوە. بەشی چوارەمی بۆ بەراورد کردنی لایەنی واتاسازی وشە فەرهەنگییەکان تەرخان کردووە. لە ئەنجام و و کۆتاییدا هەموو ئەو زانیارییانەی لەسەر نەخشەی زمانەکە دارشتووە.

**ئەتڵەسی گشتی زمانەکانی جیهانی**

ئەتڵەسی گشتی زمانەکانی جیهانی**The world atlas of language structures** گرنگی بە لایەنە جیاجیاکانی زمانە سروشتییەکان داوە. واتە تایبەتمەندی زمان و سیما زمانی و خێزانە زمانییەکان، دەنگە ڤاولەکان وەرەگەزەکانی تری زمانەکانی خستۆتە روو وەک ئامرازی پەیوەندی و کۆکردنەوە لە زمانەکاندا و هەموویانی لە سەر نزیکەی سەد و چل و پێنج نەخشەی جیاوازدا تۆمارکردووە. ئەم کارە لە ساڵی ٢٠٠٥ لەلایەن نزیکەی چل دامەزراوەی زانستی و زیاد لە پەنجا و پێنج کەسایەتی پسپۆرو شارەزای زمانەوانی جوگرافی و مرۆڤناسیی سەرانسەری جیهان ئەنجامدراوە. ئەم ئەتڵەسە نەخشەی زیاتر لە چوار سەد زمانی زیندووی کێشاوە، لە حەفت سەد و پازدە لاپەڕە پێکهاتووە. نەخشەی هەرێمی زمانییەکانی تێدایە و بە پێی جیاوازی دەنگسازی و وشەسازی و رستەسازی زمانەکان پۆل کراون. شایانی باسە پسپۆرانی پتر لە بیست پەیمانگا و زانکۆ لەبواری لێکۆڵینەوەکاندا بەشدارییان کردووە.

پاش ئەو کورتە مێژوویە دێینە سەر ئەوەی کە بزانین چۆن دەتوانین ئەتڵەسێک بۆ زمانی کوردی دابنێین و کام رێباز بگرینە بەر بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە.لەم کورتە مێژوویە ئەوە دەردەکەوێت کە عەرەبەکان و ئەمەریکییەکان خۆیان ئەتڵەسیان بۆ زمانەکەیان دانەناوە بەڵکو لەلایەن زانایانی میللەتانی ترەوە کارەکەیان بۆ ئەنجامدراوە بەڵام ئەڵمانەکان و فەرەنسییەکان خۆیان ئەتڵەسی زمانییان بۆ خۆیان داناوە. پرسیار لێرەدا ئەوەیە ئێمەی کورد ئەتڵەسی زمانی بۆ خۆمان دابنێین یان چاوەڕوان بین کەسانێکی تر ئەتڵەسمان بۆ بکەن؟

من وای بۆ دەچم ئێمە خۆمان دەبێ ئەم کارە ئەنجام بدەین. لێرەدا رووبەڕووی پرسیارێکی تر دەبینەوە ئەویش ئەوەیە کام رێباز لە رێبازەکانی دانانی ئەتڵەسی زمانی بۆ کارەکەمان بگرینە بەر؟

لە رۆشنایی ئەم توێژینەوەیە بەوە دەگەین کە سێ رێباز بۆ ئەم مەبەستە لەئارادایە:

١- رێبازی ئەڵمانی ٢- رێبازی فەرەنسی ٣- رێبازی گشتی

ئەگەر رێبازی ئەڵمانی بە کاربێنین دەبێ چەندین رستەی جیاواز لەو وشانەی کە گرنگن و رۆژانە قسە پێکەرانی زمانەکە بەکاریان دەهێنن ئامادە بکەین و لە لیستێکدا تۆماریان بکەین و بۆ ناوچە جیاجیاکانی کوردوستان بیاننێرین، کە بەرامبەر بەو وشەو رستانە وشەو رستەی ناوچە جیاوازەکان تۆمار بکرێن. ئینجا ئەم لیستانە کۆبکەینەوە و لەسەر نەخشەی کوردوستاندا جیاوازییەکانی دەنگسازی و وشەسازی و رستەسازی ناوچە

جیاوازەکان تۆمار بکەین، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستمان بە فۆرمی تایبەت دەبێت کە دوو جۆرە زانیاری تێدا تۆمار دەکرێت. لایەکی فۆرمەکە ئەم زانیارییانەی تێدا تۆمار دەکرێت:

١- فۆرمانت **Formant**واتە ئەو کەسەی کە دێتا و زانیاری لێ وەردەگیرێت، پێویستە ناو و تەمەن و پیشەو شوێنی لە دایکبوونی تۆمار بکرێت.

٢- تۆمارکەری زمانی کە دێتا زمانییەکان تۆمار دەکات. ئەویش بەهەمان شێوە دەبێ ناوو تەمەن و پیشەو شوێنی لە دایکبوونی تۆمار بکرێت.

لایەکەی دووەمی فۆرمەکە ئەو رستانەی تێدا تۆمار دەکرێت کە پێویستە بە شێوەزارە جیاوازەکان دووبارە بنووسرێنەوە بۆ نموونە دەتوانین لێرەدا چەند رستەیەک دەستنیشان بکەین لە شێوەی ئەو رستانەی کە جۆرج فینکەر بۆ زمانی ئەلمانی ئامادەی کردبوون سوودیان لێ وەرگرین بۆ نموونە:

زستانان گەلای دارەکان هەڵدەوەرێن و بە بادا دەچن.
هەندێک رەژوو بخەرە نێو ئاگردانەکە بۆ ئەوەی شیرەکە بکوڵێت.
هەموو کاتێ هێلکە بەبێ خوێ و بیبەر دەخوات.
قاچم زۆر ژان دەکات وادیارە زۆر هاتوچۆم کردووە.
قسە کە لە زارێ دەرچوو ..... هتد.

دیارە ئەگەر ئەم رێبازە بەکار بهێنین پێویستمان بە ژمارەیەکی زۆر لە دێتا کۆکەرەوە دەبێت، هەروەها ناتوانین پشت ببەستین بە بەڕێوەبەری قوتابخانەکان چونکە ئەو کارە بەو ئاسانییە ئەنجام نادرێت و لەوانەیە بۆچوونی خودی بەڕێوەبەرەکە ببێتە وەڵامی پرسیارەکان و پشت بە شێوەزاری ناوچەکە نەبەستێت، لەوانەشە لەو بارودۆخەی ئێستاماندا نەگەیشتینە بەرپرسیارییەتی ئەم ئەرک و کارە، بۆیە من ئەو رێبازە زۆر لەبار نابینم بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە.

**رێبازی فەرەنسی**

ئەگەر پشت بە رێبازی فەرەنسی ببەستین دەبێ ئەم هەنگاوانە بنێین بۆ ئەنجامدانی ئەتلەسەکە:

١- هەموو ناوچەکانی کوردستان دەبێ دەستنیشان بکەین. واتە گوندو شارو شارۆچکەکانی کوردستان کە سەر بە هەرێمی کوردستانن. ئینجا لە ناو ئەمانەدا چەند گوند و شارۆچکە هەڵبژێرین کە جیاوازی ژینگەی زمانییان تێدایە.

٢- کتێبێکی تایبەت دابنێین کە نزیکەی دوو هەزار تا دوو هەزار و پێنجسەد پرسیار بە خۆوە بگرێت لە دانانی پرسیارەکاندا دەبێ رەچاوەی هەندێ خاڵ بکرێت لەوانە:

أ- بەشی هەرە زۆری ئەو وشە فەرهەنگییانە بە خۆوە بگرێت کە لەو ناوچانەی دیاری کراون بەکار دەهێنرێن.

ب- ڕەچاوی ئەوە بکرێت کە پرسیارەکان بە وشەیەک وەڵام بدرێنەوە.
پ- دانانی پرسیارەکان دەبێ بابەتی بێت، بە شێوەیەک هەر کۆمەڵە پرسیارێک تایبەت بێت بە بوارێک لە بوارەکانی زمان و بەشێک لە ئەتلەسی زمانەکە پڕ بکەنەوە. بۆ نموونە لە کێڵگەی واتاییدا دەکرێ سوود لەو وشەو زاراوانە وەربگرین کە بۆ خزمایەتی بەکاریان دەهێنین وەک: دایک، باوک، برا، خوشک، مام، خاڵ، هتد. هەروەها دەتوانین لە کێڵگەکانی تری وەک رە نگ و ژمارە و تام ٠٠ هتد. سوود وەربگرین.
ت- لەدوای چاپکردنی کتێبی پرسیارەکان، کتێبەکان بەهۆی دێتا کۆکەرەوەکانەوە کە بە تۆمارکەری زمانی دەناسرێن و مەشقی تایبەتییان لەم بوارەدا بۆ کراوە، ڕەوانەی ئەو ناوچانە دەکرێن کە بۆ دانانی ئەتلەسەکە دەستنیشان کراون. بۆ ماوەی هەفتەیەک لەو ناوچانە دەمێننەوە لەو ماوەیەدا زانیاری و دێتاکانی پێویست بە پرسیارەکانی نێو کتێبەکە زۆر بە ئەمانەتەوە کۆ دەکەنەوە و ئاسانکاری بۆ فۆرمانتەکان لە ژینگەی زمانییەکەدا دەکەن تا وەڵامی پێویست لە کتێبەکەدا تۆمار بکەن. لەم ڕێبازەدا زۆر گرنگە بایەخ بە فۆرمانتی زمانی بدرێت لە هەڵبژاردنیاندا دەبێ ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:
١- فۆرمانت دەبێ دانیشتووی ڕەسەنی ناوچەکە بێت.
٢- بۆ هیچ شوێنێکی کوردستان کۆچی نەکردبێت و گەڕابێتەوە.
٣- لە وەڵامەکانیدا ڕاستگۆ بێت.
٤- هیچ هۆکارێکی ڕۆشنبیری لە ڕێگاکانی ڕاگەیاندنەوە کاری تێ نەکردبێت و پەیوەست بێت بە ڕەسەنایەتی شێوەزارەکەی خۆی.

لە ئەنجامی ئەم کارانەوە دێتاو دیاردە زمانییەکان کۆ دەکرێتەوە و وشە و دەربڕینە هاوواتاکان بەپێی ناوچەو گوند و شارە جیاجیاکان پۆل دەکرێت و دێتا و دیاردە زمانییەکان بە پێی شوێنی بەکارهێنانیان لەسەر نەخشەی جوگرافی ناوچەکان دادەنرێت و ئەتلەسێکی گشتگیری لە تێکەڵکردن و لێکدانی نەخشە جیاوازەکاندا ئامادە دەکرێت. بەمە دەتوانین ئەتلەسێکی زمانی بۆ نەتەوەی کورد لە هەرێمی کوردستاندا ئامادە بکەین.

بەبۆچوونی من ئەو ڕێگایە باشە ئەگەر ئەکادیمیای کوردی ئەو ئەرکە بخاتە ئەستۆی خۆی و چەندین کادری وا مەشق پێبکات ئەم کارە ئەنجام بدەن لە ماوەی چەند ساڵێکدا دەتوانین ئەتلەسێکی زمانی کوردی دابنێین کە ئەمە ڕێگا خۆش دەکات بۆ پتەوکردنی پەیوەندی نێوان شێوەزارەکان و هاندەرێک دەبێت بۆ دروستبوونی ستاندەری کوردی.

**ڕێبازی گشتی**

وەکو ڕاستییەک ناتوانین ڕێبازی گشتی بەکار بهێنین چونکە پێویستە لەسەر تەواوی لایەنەکانی شێوەزارەکان لە زمانی کوردیدا بوەستین و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ و

بەجیا ئەتڵەسی زمانییان بۆ ئامادە بکرێ. دیسانەوە نابێ هیچ لایەنێک لە لایەنەکانی زمان فەرامۆش بکرێ و تیشکی نەخرێتە سەر. ئەم کارە لەو بارو دۆخەی ئێستاماندا وا بەئاسانی ئەنجام نادرێت. چونکە کۆکردنەوەی دێتاکانی زمان دەبێ لە رووی چەندییەتی و چۆنییەتی بێت، دەبێ تەواو شارەزای دابەشبوونی جوگرافی شێوەزارەکان بین. هەروەها پێویستە دەستنیشانی چڕی دابەشبوونەکان بکرێ و لە دوو روانگەوە لێیان بکۆڵرێتەوە:

یەکەم: لە لایەنی جوگرافی.
دووەم: لە لایەنی کۆمەڵایەتی کاریگەرییان لەسەر زمانەکە.

**چەند جۆرە ئەتڵەسی زمانی هەیە و لە چ روانگەیەکەوە پۆلین دەکرێن**

ئەتڵەسی زمانی بەپێی ئەو مەبەستەی کە بۆی دادەنرێت دەکرێتە دوو جۆر :

١- لە روانگەی بەکارهێنانی زمان کە سێ جۆری لێ دەستنیشان کراوە:
   أ- ئەتڵەسی شێوەزاری کۆمەڵایەتی.
   ب- ئەتڵەسی شێوەزاری جوگرافی
   پ- ئەتڵەسی شێوەزاری کۆمەڵایەتی و جوگرافی
٢- لە روانگەی ناوەرۆک و قەبارەوە دوو جۆری لێ دەستنیشان کراوە:
   أ- ئەتڵەسی زمان
   ب- ئەتڵەسی شێوەزار

ئەو پرۆژەیەی کە ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەتڵەسی زمانی کوردی و ئاستەکانییەتی، لە پلەی یەکەمدا ئەتڵەسی دەنگسازیی و شێوەزارەکانە. کە دەکرێت هەموو ئەو گۆڕانە فۆنۆلۆژییانەی زمانەکەمان دەستنیشان بکەین و یاسا فۆنۆلۆژییەکان لە ڕێگای ئەو ئەتڵەسەوە بچەسپێنین و تەنانەت یاسا فۆنۆلۆژییەکانی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان دیار بکەین و چۆنییەتی کارکردنیان بخەینە روو. بۆ نموونە ئەگەر ناوچەی هەولێر وەربگرین دەبینین لە نێوان شاری هەولێر و کۆیە هەندێ گۆڕانی دەنگسازی هەیە کە سیمای شێوەزاری کۆیە لە شێوەزارەکانی تر جیای دەکاتەوە وەک گۆڕانی دەنگی ڤاولی /ی/ بە دەنگی ڤاولی /وو/ هەولێر دەڵێت: خیندن، دەخینم، دەخینیت، دەخینن، خین. لە کۆیە دەڵێن: خووندن، دەخوونم، دەخوونیت، دەخوونن، خوون. ئەگەر زیاتر دوور کەوینەوە لە کۆیە بۆ نموونە بچینە دەشتی بیتوێن دەبینین گۆڕانە دەنگییەکە دەگۆڕێت و دەبێتە : خوێندن، دەخوێنم، دەخوێنیت، دەخوێنێت، دەخوێنن .... هتد ئەمە نموونەیەک بوو لە گۆڕانی دەنگی کە بەدەیەها نموونەی تر هەیە لە گۆڕانی دەنگی نەک هەر ڤاولەکان بەڵکو کۆنسونانتەکانیش دەگۆڕێن وەک گۆڕینی دەنگی (ڵ)ی قەڵەو بە (ر)ی سووک وەک دڵ دەبێتە در، ماڵ دەبێتە مار و بە دەیەها نموونەی وا بەرچاو دەکەوێت.

لە راستیدا پێویستە ئەو بزانرێ کە جیاوازیی فۆنۆلۆژی بڵاوترین و فراوانترین جۆرەکانی جیاوازی زمانییە لە نێوان هەرێم و ناوچە جوگرافی و کۆمەڵە زمانییە جیاوازەکاندا. نموونەی ئەم جۆرە ئەتڵەسانە ئەتڵەسی دەنگەکانی ئینگلیزییە (**Atlas of English sounds**) کە جیاوازی فۆنۆلۆژی شێوەزارەکانی زمانی ئینگلیزی لە بەریتانیادا تێدا تۆمار کراوە و چەسپێندراوە.

لە پلەی دووەمدا ئەتڵەسی مۆرفۆلۆجی شێوەزارەکانە کە لەم قۆناغەدا هەوڵدەدرێت چۆنییەتی کارکردنی یاسا مۆرفۆلۆجییەکانی شێوەزارەکانی کوردی دەستنیشان بکرێت و ئەتڵەسی زمانی بۆ دابنرێت و لایەنی لێکچوو و جیاوازەکانیش لە چەند نەخشەیەکدا دیاری بکرێت بۆ نموونە دەتوانرێ نەخشەیەک بۆ هەموو جێناوەکان دابنێین بەتایبەتی جێناوە کەسییەکان بە هەردوو جۆرەکەی سەربەخۆ و لکاو لە هەموو شێوەزارەکاندا. بۆ ئەم مەبەستەش دەکرێ چەند هێمایەک بە ئارەزووی خۆمان هەڵبژێرین و لە بری جێناوەکان لەسەر نەخشەکەدا دایانبنێین بە پێی ناوچەکانیان. هەر بەم شێوەیە دەتوانرێ مۆرفیمەکانی وەک ناسیاری و نەناسیاری، ئامرازەکانی پەیوەندی و کۆکردنەوە ... هتد لەسەر نەخشەکەدا تۆمار بکرێ. بەم جۆرە دەتوانرێ ئەتڵەسێکی مۆرفۆلۆجی بۆ زمانەکەمان ئەنجام بدەین سوودی ئەم ئەتڵەسە لەوەدا دەبێت کە دەتوانرێ جیاوازیی نێوان وشە فەرهەنگییەکان و مۆرفیمە پێکهێنەرەکانی وشەکان دەستنیشان بکەین بەم شێوەیەش سنووری جیاوازی شێوەزارەکانمان بۆ روون دەبێتەوە. گرنگیی ئەم ئەتڵەسە لەوەدا دەبێت کە لە رێگای دەستنیشانکردنی ئەم جیاوازییانە بە تایبەتی مۆرفۆلۆجی و سینتاکسی دەتوانین بنەمایەک بۆ ستاندەرێکی کوردی دابنێین. هەروەها لە رێگای دەرخستنی جیاوازی نێوان مۆرفیمەکان لە رووی بڵاوبوونەوەیان لە ناوچەو دەڤەرە جیاجیاکاندا دەتوانین ئەو مۆرفیمانە دەستنیشان بکەین کە باشتر لەگەڵ ستاندەرەکەدا دەگونجێت و سوودیان لێ وەربگرێت. نموونەی ئەم جۆرە ئەتڵەسانە ئەتڵەسی زمانی ئینگلیزییە **Atlas of English language** کە بایەخێکی زۆری بە بڵاو بوونەوەی جوگرافی مۆرفیمی کۆ ( **e-n-n**) داوە. وەکو راستییەک دەبێ ئەوە بزانین کە ئەتڵەسی مۆرفۆلۆجی بەقەد فۆنۆلۆژی بایەخی پێ نەدراوە بە تایبەتی لایەنی مۆرفۆ فۆنیمی و مۆرفۆسینتاکسی.

لە پلەی سێیەمدا ئەتڵەسی سینتاکسی شێوەزارەکان دێت. هەروەک هەردوو جۆرەکەی تر دەتوانین نەخشەی بۆ دابنێین لە رێگای دەستنیشانکردنی مۆرفیمە سینتاکسییەکان و یاساکانیان کە بە هۆی هێمای تایبەتەوە لە سەر نەخشەیەکی دیاریکراودا دەتوانین ئەتڵەسێک بۆ زمانەکەمان دروست بکەین و دیاردە سینتاکسییەکان لە شێوەزارەکاندا بە هەموو جیاوازییەکانیان بخەینە روو. بۆ نموونە دەتوانین رێژە و کات و رەگی مۆرفیمەکانی کار و چۆنییەتی بڵاوبوونەوەیان هەروەها مۆرفیمەکانی بکەر نادیار و تێپەڕاندن و بانگکردن و دۆخ و نێر و مێ و ژمارە لە شێوەزارە جیاوازەکانی زمانەکەمان بەپێی ناوچەکان بخەینە ناو ئەتڵەسەکە.

له پلەی چوارەمدا ئەتڵەسی سیمانتیکی دێت. ئەم جۆر ئەتڵەسانە تایبەتن بە کێڵگە واتاییەکان بە تایبەتی گرنگی زۆر بە وشە هاوواتا و دژواتا پۆلۆاتاکان دەدەن. هەروەها جیاوازیی واتایی نێوان وشە فەرهەنگییەکان شێوەزار و زمانەکە وەکو جیاوازی فۆنۆلۆژی سەیر دەکەن کە جیاوازییەکی بەربڵاوە. ئەم جۆرە ئەتڵەسانە لە جۆرەکانی دیکە زیاتر ناسراون و زورترن چونکە گۆڕانکارە واتاییەکان بەهۆی هێمای تایبەت لەسەر نەخشەی زماندا پێشان دەدەن، بە تایبەتی جیاوازییەکانی هەرێم و ناوچە جیاوازەکان لە هەموو ئاستەکانی دیکە زمانی زۆرترن، ئەوەی کۆمەڵە زمانییە جیاوازەکان بە ئاسانی دەتوانن وشەی نوێ و واتای نوێ لە زمانەکانی تر یان دەوروبەر وەربگرن. چونکە ئەم لایەنەی زمان واتە سیستەمی سیمانتیکی سیستەمێکی کراوەیە. نموونەی ئەم جۆرە ئەتڵەسانە ئەتڵەسی فەرەنسییە کە نەخشەی تایبەتییان بۆ واتای هەندێک لە ئاژەڵەکان وەک: سەگ، پشیلە، ئەسپ... هتد داناوە. هەروەها ئینگلیزەکان ئەتڵەسی تایبەتییان بۆ بڵاوبوونەوەی وشەی (ژن – کچ) لە زمانی ئینگلیزیدا داناوە (رابرت لارنس:١١٣: ١٨٣٠).

ئەم کارە کارێکی پیرۆزە کە ئاواتەخوازین ئەکادیمیای کوردی ئەو ئەرکە بخاتە ئەستۆی خۆی بەمە خزمەتێکی زۆر گەورەی زمانەکەمان دەکات. شایانی باسە کە نموونەی ئەتڵەسی سیمانتیکی ئەتڵەسێکە، یەکێک لە قوتابییەکانی ماستەرم بە ناوی عەبدولمەناف رەمەزان لە زانکۆی سەلاحەدین – کۆلێژی زمان لە بواری کێڵگەی واتایی زاراوەکانی خزمایەتی ئەنجامی داوە و بە پلەی نایاب وەرگیراوە. ئەم ئەتڵەسە چل و پێنج نەخشەی بەخۆوە گرتووە. لەم نەخشانەدا زاراوە جیاوازەکانی خزمایەتی وەک : باپیر، باوک، دایک، خاڵ، مام، خوشک، برا، ئامۆزا، برازا، خوشکەزا، نەوە و نەوەزا هەڵبژێرراون. ئەگەر هەریەکێک لەم زاراوانە وەربگرین دەبینین بە پێی شێوەزارو ناوچەکان بە چەندین جۆری جیاواز بەکار دەهێنرێن بۆ نموونە زاراوەی باپیر لە شێوەزارە جیاوازەکاندا بەم شێوەیە بەرچاو دەکەون و بەکار دەهێنرێن: بابە گەورە، باوە گەورە، باوا، بابا، کالک، باپیرە، داپیر ئەم شێوە جیاوازانەی هەیە : پیرک، نەنک، نەنێ، نەنە، دایە گەورە، ماما، نیک، دەدە، دادا، هەر بەم شێوەیە بۆ زاراوەکانی تر شێوە جیاوازەکان بە پێی ناوچەی شێوەزارەکان لەسەر نەخشەی کوردستاندا بە هێمای تایبەت دانراون.
(عەبدولمەناف:٢٠٠٨: ١١٧)

## سەرچاوەکان

١- أ.د.ن.ي كولنج و د. محي الدين حميدي و د. عبدالله سميان ـ الموسوعة اللغوية. ج٣، جامعة الملك سعود، الرياض، المملكة العربية السعودية، ١٤٢١ هـ.

٢- ت. ج. جونسن. دراسات في لهجات في شرق الجزيرة العربية. ترجمة د. احمد محمد الحبيب، بيروت، لبنان، ١٩٨٣.

٣- راپرت لادنی تراسک. مقدمات زبانشناسی، ترجمه فریاد اخلاقی، انتشارات نشر، تهران، ١٨٣٠.

٤- عبدالمناف رمضان، ئەتلەسی زمان. نامەی ماستەری چاپ نەکراو، زانکۆی سەلاحەددین ـ کۆلێژی زمان.

٥- كيس فرستيغ اللغة العربية تاريخها ومستوياتها وتاثيرها، ترجمة محمد الشرقاوي. القاهرة ٢٠٠٣

**Hadumod Bussmann, Dialectionary of languagr & linguistics. London : Rutledge 1966.**

**Peter Trudygill. Dialectology. secondedition Cambridge&Chambers .K.J University press, 2004.**

ملخص البحث

# مشروع وضع اطلس لغوي لاقليم كردستان

**أ.د. يوسف شريف سعيد**
**قسم اللغة الكوردية- كلية اللغات - جامعة صلاح الدين - اربيل**

مشروع اعداد اطلس لغوي لأقليم كردستان هو عنوان هذا البحث. موضوع هذا المشروع يندرج ضمن اللسانيات الجغرافية، وتبادل اللهجات الكردية وهي محاولة لاعداد أطلس لغوي يتضمن جميع اللهجات الكردية في محاولة لتوحيد اللهجات وتكوين نواة للغة الفصحي. في المقدمة ذكر الباحث بعض التعاريف الخاصة بالاطالس اللغوية والتي هي نتاج اللسانيين الجغرافية، بعدها تطرق الي تاريخ وظهور الاطلس اللغوية بصورة دقيقة حيث ذكر تجارب بعض الشعوب والغات في هذا المجال، مثل الفرنسية والالمانية والبريطانية والايطالية والعربية. في ضوء هذه التجارب استخلص ثلاثه اساليب رئيسية وهي الاسلوب الفرنسي والالماني والعام. واختار احدي هذه الاساليب في الدراسه. والجدير بالذكر ان الباحث اعتمد علي الاسلوب و الطريقة الفرنسية ووجدها أحسن الاساليب والطرق الأنجاز الاطلس اللغوي الكردي. وأشاء الى انواع الاطالس منها الأطلس الاجتماعي والجغرافي الاجتماعي الجغرافي. ولكن وضع جل اهتمامه في الاطلس الصوتي للهجات الكردية ووجدها الأحسن لأنجاز الأطلس اللغوي الكردي.

Abstract

**Project for establishing a Linguistic atlas of the kurdistan Region**


**Yousif Sharef Saeed**

**Kurdish Dep. College of Languages- Salahaddin University- Erbil**

**This study, which is entitled a project for establishing a linguistic atlas of the Kurdistan Region, falls within the realm of linguistic geography and is a to be a survey of the Kurdish dialects. It is an attempt to initiate a linguistic atlas that can be used to unify these dialects and serve as a basis for the standard Kurdish.**

**The introduction presents some definitions of the linguistic atlas as viewed by linguists and linguistic geographers, and dwells on the history of dialectology and the emergence of the first large scale systematic atlases in Germany, France, Italy and some Arab countries. In the light of these experiments, the researcher finds that there are three different methods that can be used in conducting such large scale dialect surveys: the German, the French and the general methods, of which he opts for the French one and views it to be the best for producing a Kurdish linguistic atlas. By way of conclusion, the researcher elaborates on atlas types and their classification, and distinguishes between sociolinguistic, geographic and sociogeographic ones. However, he focuses all his attention on the importance of a phonological atlas of the Kurdish dialects and regards it to be the best survey that can lead to the establishment of the Kurdish linguistic atlas.**

# پەیدابوونی
# میرنشینی بابان*

## توێژینەوەیەکی شیکاری
## لەبارەی دامەزرانی میرنشینەکە و ڕەگ و ڕیشەی بابان

**پ.ی.د.سەعدی عوسمان هەروتی**
**بەشی مێژوو- کۆلیژی ئەدەبیات**
**زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر**

**پێشەکی:**

میرنشینی بابان یەکێکە لەو میرنشینە کوردییانەی کە گەلێک وتار و توێژینەوە و کتێبیان لەسەر نووسراوە، بەڵکو دەتوانین بڵێین لەم بارەیەوە بابان بەشی شێری بەرکەوتووە. سەرەڕای ئەمەش هێشتا مافی تەواوی خۆی نەدراوەتێ و زۆر لایەنی مێژووی ئەم میرنشینە بەشاردراوەیی ماوەتەوە، بەتایبەتی لایەنەکانی ژیاری و شارستانی ئەم میرنشینە. بەهەمان شێوە مێژووی بەرایی و سەرەتای سەرهەڵدانی میرنشینەکەش هەروا لێڵ و نادیارە. لە سۆنگەی ئەم ڕاستییەوە هەوڵدرا لەتوێژینەوەیێکی وەهادا ئەوەندەی بکرێ سەبارەت بەم بابەتە پەردە لەسەر ڕاستییەکان هەڵگیرێ.

بێگومان لێرەدا پێویستە پەنا ببەینە بەر شێوازی شیکاری بۆ لێکدانەوەی زانیاری سەرچاوەکان و گەڕان بەدوای ڕاستییەکان. لەهەمان کاتدا دەبێ ئاگامان لەڕای نووسەر و مێژوونووسان و بۆچوونە جیاوازەکانیان لەم بارەیەوە هەبێ. بۆیە هەوڵدرا سەیری هەموو ئەو نووسین و سەرچاوانە بکرێ کە یارمەتی ئەم توێژینەوەیە دەدەن، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە سەرچاوە بنەڕەتییەکان بایەخی تایبەتییان هەیە، وەک (شەرەفنامە)ی (شەرەفخانی بەدلیسی) کە دەتوانین بڵێین تائێستا تاکە سەرچاوەی ڕەسەنە کە زۆربەی مێژوونووسان سەبارەت بە مێژووی بنەماڵە

---

* ڕێکەوتی وەرگرتن ٢٠٠٩/٩/٨

بەراییەکانی بابان پشتیان پێ بەستووە. شەرەفنامە دوو تەواوکەر (ذیل)یشی هەیە و لەنێویاندا ئەوەی کە (محەمەد ئیبراهیم ئەردەڵانی) سەبارەت بەمێژووی ئەردەڵان نووسیویەتی زانیارییەکی دەگمەنی بۆ ئەم توێژینەوەیە تێدابوو. هەروەها پەرتووکی (النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة)ی مێژوونووسی مەملوکی (ابن تغري بردي – ٨٧٤ك/١٤٦٩ز) کە سەرچاوەیەکی ڕەسەنی سەدەی پازدەیەمە بایەخێکی هاوشێوەی هەبوو. بێگومان هەردوو کتێبی (ڕەوشی کوردان) و(مذكرات مأمون بك بن بيكه بك)یش سەرچاوەی دەگمەنن، چونکە ئەوەی یەکەمیان کەسێکی بنەماڵەی بابان بەناوی (عەبدولقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان) لەساڵی ١٨٧١ز دا دایناوە، ئەوەی دووەمیشیان یاداشتی میرێکی ئەردەڵانییەو لە سەدەی شازدەدا وەکو سکاڵایەک پێشکەشی سوڵتانی عوسمانی کراوە. هەروەها توانرا سوود لە چەندین بەڵگەنامەی عوسمانیش ببینرێ بەهۆی کتێبی (د. عماد عبدالسلام رؤوف – دراسات وثائقية في تاريخ الكرد وحضارتهم) و وتارەکەی (خەلیل ساحلی ئۆغلو) سەبارەت بە (دابەشبوونی کارگێڕی عیراق لە سەردەمی عوسمانیدا). گەشتنامەی هەندێ لە بیانییەکانیش بەتایبەتی (گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠) سەرچاوەیەکی گرنگ بوو بۆ ئەم بابەتە. بێجگە لەمانە سوود لە چەندین سەرچاوەی تر بینراوە کە لەکۆتایی توێژینەوەکە ڕیزبەند کراون.

### سەرەتای پەیدابوونی میرنشینی بابان:

لە ئەنجامی کەمی سەرچاوەی مێژوویی تایبەت بە کورد و کوردستان لە سەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتاکانی سەردەمی نوێ، هەروەها لەبەرئەوەی زۆربەی دەسەڵات و میرنشینە کوردییەکان سەرەتا وەک قەوارەیەکی خۆماڵی هۆزایەتی یان دەرەبەگایەتی بچووک پەیدابوون، دەبینین پەیدابوونی بنەماڵەی دەسەڵاتداری بابان، یان بەواتایەکی تر سەرەتای دامەزرانی میرنشینی بابان، هەروەکو زۆربەی میرنشینە کوردییەکانی تر ڕوون و ئاشکرا نییە. ئەمەش ڕێگای خۆشکردووە بۆ خستنەڕووی چەندین بۆچوون و ڕای جیاواز.

هەندێ نووسەر و مێژوونووس باس لەکۆن و دێرینی میرنشینی بابان دەکەن و تەنانەت هەندێکیان لەم بارەیەوە زێدەڕۆیی دەکەن، وەک (جەمال بابان) کە ڕەچەڵەکی بنەماڵەی بابان دەگێڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش زایین.[1] یان زانیاری بێ بەڵگە و بنەما دەخەنەڕوو، وەک (عبدربه ابراهيم الوائلي) کە بەڕاگواستن لەکتێبی (عشائر العراق الكردية) دەڵێ (حەمدی بەگی بابان) گوتوویەتی کە ((دەستپێکی

مـێـژووی بابان لە سـاڵی ١٤٠٠ز دابوو بەڵام سـەرەتا ئەوەندە گـرنگ نەبوون کـە لەبارەیانەوە بنووسرێ تا لەسـاڵی ١٥٠٠ز دا توانیـیـان مـیـرنشـینێکی بەهێـز پێکبهێنن...)).[٢] بەڵام کە سەیری کتێبی ناوبراو دەکەین دەبینین (حەمدی بەگ) تەنیا گوتوویەتی سەرەتای بنەماڵەی بابان نادیارە. وە هەرگیز باسی ساڵی ١٤٠٠ز نەکـردووە.[٣] هەروەها (حـوسـێن حـوزنی مـوکـریانی) بۆچوونێکی سـەیر دەخاتەڕوو،کاتێ (میـر بۆداقی کوڕی میـر ئەبدال) کـە لەسـەرەتای سەدەی شـازدە میری بابان بووە [٤]، دەکات بەکوڕەزای (بابا ئەردەڵان)ی باپیرە گەورەی بنەماڵەی دەسەڵاتداری ئەردەڵان.[٥] بەمەش موکریانی سەرەتای دامەزراندنی میرنشینی بابان دەگێڕێتەوە بۆ سەدەی سێزدە یان چواردەی زایینی، چونکە بەپێی بۆچوونی زۆربەی مـێـژوونوسـان بابا ئەردەڵان لەم مـاوەیەدا ژیاوە.[٦] بێگومـان ئەمـەش هەڵەیەکی مێژووییە چونکە ناکرێ باپیرێک لەم سەردەمانە ژیابێ و کوڕەزاکەشی لە سەدەی شازدە.

ئەگەر ئەم بۆچوونانەی پێشوو بێ بنەما و هەڕەمەکیش بن، ناکرێ چاوپۆشی لەو مەسـەلەیە بکەین کە بەر لە سـەدەی شازدە مـیرنشـینی بابان هەبوونی هەبووە. لەم بارەیەوە ئەوەی زۆرتر جێگەی تێڕامانە ئەو دەسـتنووسـە فـارسـیـیـەیە کـە سـاڵی ١٠٩٩ک/١٦٧٧-١٦٨٨ز نـووسـراوە. لەم دەسـتنووسـەدا دەقی قـەباڵەیەکی فرۆشتنی زەویوزار هەیە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٧٧٥ک/١٣٧٣-١٣٧٤ز)[٧]و فرۆشیـار کەسێکە بەناوی (میـرزا عـەبدولکەریمی کوڕی میـر خالدی کـوڕی مــیـر ئەحـمـەدی بابان). هەروەها لەلاپەڕەیەکی تریشـدا بەپشت بەستن بەکتێبێک بەناوی (تذكرة الاجناد في محاربة الاتراك والاكراد) ناوی میرێکی تری بابانی دەهێنرێ بەنـاوی (مـیـر حـەمـزەی بابان) و باس لەوە دەکـرێ کـە سـەرەتا دیاربەکـر و حـەڵەبی گـرتووە، بەڵام بەهۆی ناپاکی سـەرلەشکرەکـەی کـە ناوی (حـەمـدوون) بووە تێکشکاوەو هەڵاتووە بۆ (مـەریوان). مـیـر حـەمـزە دواتر خۆی گـرتۆتەوەو دەسـتی بەفـراوانخـوازی کـردووە تا گـەیشـتـۆتە بەعـقـوبە، کـەچی لەوێ ژەهرخـوارد کراوە.[٨] هەرچەندە نـووسەری ئەم دەستنووسە (سەید عـەبدولسـەمـەدی تـووداری) ئامـاژە بە بەرواری ئەم ڕووداوەی دوایی نـاکـات، بەڵام بەهۆی زانینی ساڵی مردنی ئەو زانایەی کە لە مزگەوتێکی ژێردەسەڵاتی ئەم میرە دەرسی گوتۆتەوە (شـێخ ابراهیم ناسـراو بە کـابل - یان/کـاکـە بلە - م٨٢٣ک) دەتوانین بڵـێین ئەم ڕووداوە بەپێی دەسـتنووسـەکـە هی کـۆتایی سـەدەی هەشـتـەم و سـەرەتای سـەدەی نۆیەمی کۆچییە.

کەواتە زانیـارییـەکـانی ئەم دەسـتنووسـە پێـمـان ڕادەگـەیەنێ کـە بەلایەنی کـەم لەنیـوەی دووەمی سـەدەی چواردەی زایینی مـیـرنشـینێکی کـوردی هەبووە بەناوی (بابان)، بەو پێیەی کەسانێک لەم ماوەیەدا هەڵگری نازناوی (میری بابان) بوونە. وە هەر هەمان میرنشین لە سەرەتای سەدەی پازدەش لە ئارادا بووە.

ئەمانە زانیاری نوێ و زۆر گرنگن لەمەڕ مێژووی بەرایی میرنشینی بابان، کە لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا نەبینراون. بەڵام دەبێ بپرسین ئایا دەکرێ وەک ڕاستییەکی مێژوویی وەربگیرێن؟ پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێ بزانین کە نووسەری ئەم دەسـتنووسـە هاوچەرخی ئەم ڕووداوانە نەبووە کـە بۆی تۆمـار کـردووین، هەروەها خودی نووسـەریش نە مـێـژوونووس بووە و نە بۆمەبەسـتی مـێـژوویی ئەم ڕووداوانەی نووسیوە. بەڵکو تەنیا کەسایەتییەکی ئایینی بووە و بۆ ناساندنی هەندێ لە پیر و پیـاوچاکـان بەکـورەکـەی ئەم دەسـتنووسـەی داناوە. بەڵام لە سـەرێکی ترەوە دیارە نووسەری ناوبراو بەڵگەو سەرچاوەی مێژوویی لەبەردەستدا بووە بۆ تۆمارکردنی ئەم زانیارییانە. سەبارەت بە سەودای کڕین و فرۆشتنەکە کە ناوی میرێکی بابانی تێدا هاتووە، ناوبراو ئامـاژە بەوە دەکـات کـە دەقی ڕەسـەنی قـەباڵەکـەی بینیـوەو لەبەردەستی دابووە. بۆ ڕووداوەکانی تایبەت بە (میر حەمزەی بابان)یش پشتی بە سـەرچاوەیەکی مـێـژوویی بەسـتـووە کـە پێـشـتـر ناومـان هێنا.[9] هەرچەندە ئەم سەرچاوەیە نەگەیشتۆتە دەست ئێمە، هەروەها دانەی ڕەسەنی ئەم قەباڵەیەشمان نەبینیـوە تا لەڕاسـتی و دروسـتی ئەم زانیـارییـانە دڵنیـا بین، بەڵام ئەمـە نابێـتـە بەڵگەو بیانوو بۆ ئەوەی ئەم زانیارییانە ڕەت بکرێنەوەو فەرامۆش بکرێن.

لەلایەکی تر ئەوەی گومـان لەسەر ئەم زانیـارییـانە دروست دەکات ئەوەیە کـە لە سـەرچاوە مـێـژووییـەکـانی تایبـەت بە سـەدەکـانی ١٤-١٥ز، بەهیـچ شـێـوەیەک لە ڕووداوەکـاندا ئامـاژە بەمـیـرنشـینێکی کـوردی ناکـرێ بەناوی (بابان). لەکاتێکدا چەندین مـیـرنشین و قـەوارەی تری کـوردی ئەم سـەردەمـە ناویان لەم سـەرچاوانە تۆمـارکـراوە و ڕۆڵیـان لە ڕووداوەکـاندا دیارە. بەتایبـەتی کـە ئەم مـاوە مـێـژووییـە سـەردەمـێکی پڕ لە ڕووداو وگـۆڕانکاری بووە و لەئەنجـامـدا ناوچەکـە چەندین جـار لەنێوان هێزە سیاسییە جیاجیاکان دەستاودەستی کردووە.[10] بەڵام لە سەرچاوەیەکی سـەدەی هەشـتـەمی کـۆچی/چواردەی زایینی باسی کـەسـایەتیـیـەک دەکـرێ بەناوی (رضی الدین) ی ناسـراو بە (البـابا)، کـە لە سـاڵی ٦٦٣ک/١٢٦٤-١٢٦٥ز دا لەلایەن مـەغـۆلەکـانەوە حـوکـمـڕانی (مـوسڵ)ی پێ سـپـێـردراوە.[11] بێـگومـان وێکچـوونـی ئەم نازنـاوە لەگـەڵ وشـەی (بابان) سـەرنجـمـان ڕادەکـێـشێ، بەڵام لە

سەرچاوەی تردا ئاماژە بەوەکراوە کە ئەم کەسایەتییە - کە بە(ناصر الدین)یش ناودەبرێ - لە بنەماڵەی بەکری قەزوینییە[١٢]. بۆیە پێناچێ کورد بێ چ جای ئەوەی بابانی بێ.

سەبارەت بە نەهاتنی ناوی میرنشینی بابان لە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەدا، یەکێک لە نووسەران پێی وایە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لەم ماوەیەدا ئەم ناوچەیە هەمووی گوند و لادێ بووە و زۆربەی دانیشتووانەکەشی لەوانەیە ڕەوەند بووبن، ئیتر شارێکی گەورە و قەڵایەکی ستراتیژی لێ نەبووە تا هێزە سیاسییەکانی ناوچەکە چاوی تێ ببڕن.[١٣] توێژەرێکیش پاڵپشتی ئەم بۆچوونە دەکات و باوەڕ بەوە دەهێنێ کە بابانەکان لە سەدەی پازدەهەمدا هەرچەندە خێڵێکی گەورە بوونە بەڵام نەگەیشتوونەتە ئاستی پەیوەندی سیاسی لەگەڵ هێزەکانی ناوچەکەدا.[١٤]

لەڕاستیدا بۆچوونێکی لەم جۆرە لەبازنەی لۆجیک (منطق) بەدەر نییە، بەتایبەتی مەسەلەی دواکەوتنی ناوچەکە لەڕووی ئاوەدانییەوە، کە تەنانەت تا نیوەی دووەمی سەدەی شازدەش هەر بەم شێوەیە بووە. ئەوەتا لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا کە مێژووی (٢١ی ڕەجەبی ٩٨١ک/ ١٥٧٣ز) بەسەرەوەیە، دەردەکەوێ کە سەرداری بابان لەنووسراوێکیدا بۆ سوڵتانی عوسمانی دەڵێ ناوچەکەی ((لەڕووی ئاوەدانی دواکەوتووە و هیچ جێگایەکی تێدا نییە بۆئەوەی تێیدا دابنیشێ، هۆزەکان لەدژی هەر بزاڤێکی ئاوەدانکاری دەوەستن و لایان باشترە لە چادر ژیان بەسەر ببەن)).[١٥]

بەهەمان شێوە گومان لەوەدانییە کە لە سەدەی پازدەمدا قەوارەیەک بەناوی بابان لەئارادا بووە، چونکە لە سەرچاوەکانی ئەم سەدەیەدا ئەم ناوە بەرچاو دەکەوێ. ئەوەتا (ابن تغری بردی) کە لە ساڵی ٨٧٤ک/١٤٦٩ز مردووە لەکتێبی (النجوم الزاهرة)دا باسی پیاوچاکێک دەکات بەناوی (الشیخ عمر البباني الكردي) کە لە ساڵی ٨٦٨ک/١٤٦٣ز لەوڵاتی میسر مردووە.[١٦] هەروەها (السخاوي)ش کە تا ساڵی ٩٠٢ک/١٤٩٦ز ژیاوە ناوی هەمان پیاوچاک هەر بە نازناوی ((البباني الكردي)) دەهێنێ.[١٧] دیارە ئەم پیاوچاکە کە تەمەنی لە (٦٠) ساڵ زیاتر بووە، بەپێی گوتەی (ابن تغری بردی) بەڕچەڵەک بابانی ((بباني)) بووە، کە لەبارەی ئەم نازناوەوە جارێکیان دەڵێ ((تائیفەیەکە لە کوردان)) و جارێکی تریش پێی وایە ((هۆزێکی کوردان))ە. بەڵام لەهەمان کاتیشدا دەڵێ: ((لەوێ لەدایک بووە و هاتۆتە قاهیرە))[١٨]، کەواتە وەکو (شوێن) یش ئاماژەی پێداوە. بەڵام دەتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین کە لەم سەردەمەدا (بابان) قەوارەیەکی سیاسی (واتە:

میرنشین) بووە، بەوپێیەی (شەرەفخانی بەدلیسی) لەکتێبی (شەرەفنامە) دا -کە گرنگترین سەرچاوەیە لەبارەی میرنشینە کوردییەکان - هەرچەندە باسی دەسەلاتدارانی بەرایی بابانەکان ناکات، بەڵکو لە (میر بۆداقی کوڕی میر ئەبدال)ـەوە دەست پێدەکات کە سەردەمی ئەو هاوکات بووە لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوی (١٥٠١ - ١٧٣٦)، بەلام هەرگیز ئاماژە بەوە ناکات کە ئەم میرە دامەزرێنەری میرنشینەکە بێت.[١٩]

بێگومان هەروەکو لە ناوەکەش ڕادیارە بەر لە (میر بۆداق) باوکیشی (واتە: میر ئەبدال) میرایەتی کردووە، لەبەرئەوەی نازناوی (میر) بەناوەکەیەوە لکاوە. هەروەها خودی (شەرەفخان) لە دێڕەکانی بەرایی باسی ئەم بنەماڵەیەدا دەڵێ: ((دەسەلاتدارانی بابان لەنێو فەرمانڕەوایانی کوردستان و میرەکانی بەزۆری رەعیەت و لایەنگیر و فرەیی هۆز و عەشیرەت ناسراون، بەلام ڕۆژانی حوکمڕانی ئەم چینە [مەبەست بنەماڵەیە] کە گەیشتە میر پیر بۆداقی بەبەیی کە نازناوەکەی زاراوەی بابان دەگرێتەوە، هەروەها براکەی [لەڕاستیدا (برازاکەی) هەروەکو لەلاپەڕەکانی دواتری شەرەفنامەدا دیارە] کە وجاغ کوێر بوون هەروەکو باسی دەکەین، حوکم لە بنەماڵە دەسەلاتدارە دێرینەکەیانەوە گوازرایەوە بۆ نۆکەر و لایەندارانیان)).[٢٠] کەواتە لەمەدا دەردەکەوێ کە بابانەکان هەر لەو سەردەمەدا - واتە سەرەتای سەدەی شازدە - بنەماڵەیەکی دەسەلاتداری دێرین بوونە و پێش (میر بۆداق)یش - واتە لە سەدەی پازدە -چەند میرێک حوکمڕانییان کردووە و میرنشینی بابان لە ئارادا بووە. بەلام دیارە بابانەکان لەم سەردەمەدا چالاکی سیاسی و سەربازییان نەنواندووە تا کاریگەرییان بەسەر ڕووداوەکانەوە هەبێ بەجۆرێک لە سەرچاوەکاندا ناویان یان جموجوولەکانیان تۆمار بکرێ. هەر بۆیە (شەرەفخان)یش لەو دەمەوە زانیارییان لەبارەوە دەنووسێ کە (میر بۆداق) دەکەوێتە جموجوولی سەربازی و پەلهاویشتن بۆ ناوچەکانی دەوروبەری.[٢١]

بەلام سەبارەت بە هەبوونی میرنشینێکی کوردی بەناوی بابان لە سەدەی چواردەی زایینیدا، ئەوا دەبێ چاوەڕێی بەدیارکەوتنی سەرچاوە و بەڵگەی مێژوویی تر بکەین، بۆ ئەوەی لەم بارەیەوە دڵنیابین. تا لەکۆتاییدا سەرەتای دامەزراندنی ئەم قەوارەیە دیاری بکەین.

**ڕەوشی سیاسی بابان لە سەدەی شازدەدا:**

وەک پێشتر باسمان کرد، یەکەم میری بابانی کە زانیاریمان لەبارەیەوە هەبێت

(میر بۆداقی کوڕی میر ئەبدال)ـە، کە لە سەرەتای سەدەی شازدەمدا فەرمانڕەوای میرنشینێکی بچووک بوو بەناوی (بابان) لە ڕۆژهەڵاتی میرنشینی سۆراندا.[22] شەرەفخان کە باسی سەردەمی ئەم میرە دەکات ـ کە هەندێ جار بە (پیر بۆداق)یش ناوی دەبات ـ نە سنووری میرنشینەکە و نە مەڵبەندی حوکمڕانییەکەی دیاری دەکات. بەڵام بەتێڕامان لە فراوانخوازییەکانی میری ناوبراو دەتوانین وا لێک بدەینەوە کە چەقی قورسایی بابان لەو سەردەمەدا لە ناوچەی پشدەر و دەوروبەری بووە،[23] لەبەرئەوەی ئەم شوێنە ناوەندی ئەم ناوچانە پێکدەهێنێ کە پیر بۆداق پەلی بۆ دەهاویشت، وەک لێرە بەدوا دەبینین:

سەرەتا ئاراستەی فراوانخوازییەکانی پیر بۆداق بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، ئەوەبوو ناوچەی (لاجـــان)[24]ی لە هۆزی (زەرزا)و ناوچەی (ســـێـــوی/یان: زێوێ)[25]ی لە میرنشینی سۆران دابڕاند. هەروەها (سولدز=سندوس)[26] ی لەژێر دەستی سەفەوییەکان[27] دەرهێنا. ئنجا قەڵای (ماران)[28] ی ئاوەدان کردەوەو سەردارێکی لەسەر دانا. دواتر کەوتە هەوڵی ملکەچ کردنی هۆزەکانی ئەم ناوە و توانی هەندێ لە هۆزەکانی (موکریان) و (بانە) بەزەبری هێز یان بە دڵڕاکێشان وابەستەی بابان بکات.[29] ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە دەسەڵاتی میرنشینەکەی لەم دەڤەرانە بەتەواوی جێگیر بکا. جێگەی سەرنجە (پیر بۆداق) لەڕێی ژنخوازیش هەوڵی دەدا پەیوەندی لەنێـــوان ســـەرۆک هۆز و ســـەردارانی نێـــو قـــەڵەمـــڕەوی میرنشینەکەی پتەو بکاو هەروەها دڵسۆزییان بۆ خۆی مسۆگەر بکا.[30]

دیارە ئەم سەرکەوتنانە (پیر بۆداق)یان بۆ پەلهاویشتنی زیاتر هانداوە بێ ئەوەی لەزیادبوونی دوژمنەکانی سڵ بکاتەوە. ئەمجارەیان کە ڕوو لەباشوور بوو ناوچەی (شەهربازاڕ/یان: شاربازێڕ) ی لە میرنشینی ئەردەڵان قرتاند، کە یەکێک بوو لە مـــیـــرنشـــینە بەهێـــز و تواناکـــانی کـــوردســـتـــان لەو ســـەردەمـــەدا.[31] هەروەها (کەرکوک)یشی گرت کە لەڕووی کارگێڕییەوە سەر بە بەغدا بوو.[32] شایانی باسە ئەم شارەی دوایی (بەغدا) تاساڵی ١٥٠٨ز مەڵبەندێکی دەوڵەتی (ئاق قۆینلۆ) بوو، بەڵام دوای ئەم ساڵە لەلایەن سەردارێکی سەر بە دەوڵەتی سەفەوی حوکم دەکرا.[33] ئیتر ئێمە مێژووی ڕووداوەکە نازانین تا بڵێین (کەرکوک)ی لەکام دەوڵەت سەندووە. بەڵام هەرگیز لەدەوڵەتی عوسمانی نەسەندووە وەک یەکێک لە نووسەران وای بۆ دەچێ.[34] چونکە هێشتا عوسمانییەکان نەهاتبوونە ناو بازنەی ململانێ لە ناوچەکەدا.[35] هەرچۆنێک بێت دیارە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو میرە بابانییە بەسەربەخۆیی حوکمی میرنشینەکەی کردووە و دانی بەهیچ

دەسەڵاتێکی تر نەناوە. چونکە ئەگەر ناوچەی دەسەڵاتی سەفەوی و ئاق قۆینلۆی داگیر کردبێ و عوسمانییەکانیش هێشتا لەوناوە دەسەڵاتیان پەیدا نەکردبێ، ئیتر دەوڵەتێکی تر لەناوچەکەدا نەبوو کە ئەو گوێڕایەڵی بکا.

دوای ئەم دەستکەوتانە (پیر بۆداق) هەوڵی دا تەواوی قەڵەمڕەوی سۆران بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. بەپێی گوتەی (شەرەفخان) دیارە لەمەشدا سەرکەوتوو بووە، چونکە (میر سەیدی کوڕی شاعەلی بەگ)ی میری سۆرانی نەیتوانیوە بەرەنگاری لەشکری بەهێزی بابان بێتەوە، بۆیە وازی لە دەسەڵاتەکەی هێناوە و پەنای بردۆتە بەر شاخەکان تا دەرفەتی تۆڵەسەندنەوەی بۆ دەڕەخسێ. لەڕاستیدا هاتنی ئەم دەرفەتەش زۆری نەخایاند و پیر بۆداق کە مەترسی دوژمنەکانی بەهەند نەدەگرت، ڕۆژێک لەکاتی ڕاو و شکاردا کەوتە بۆسەی میری سۆران و خۆی و هەموو ئەوانەی لەگەڵی دابوون کوژران.[٣٦] جێگەی سەرنجە یەکێ لە مێژوونووسان دەڵێ ئەم ڕووداوە لە ساڵی ١٥١٤ز ڕووی داوە و بۆ ئەمەش ئاماژە بە شەرەفنامە دەکا، هەر ئەم مێژوونووسە مێژووی چەندین ڕووداوی تریش دیاری دەکا هەر بەئاماژەکردن بەم سەرچاوەیە.[٣٧] لەکاتێکدا (شەرەفخان) بەهیچ شێوەیەک ئاماژە بە مێژووی ئەم ڕووداوە و زۆربەی ڕووداوەکانی تر ناکات.

سەبارەت بەم ڕووداوە (موکریانی) بێ خستنەڕووی سەرچاوە هەندێ وردەکاری زیاترمان دەداتێ و دەڵێ: میری سەرەکی سۆران (عیسای کوڕی شاعەلی) بوو، ئەم (میر سەیدی) یەش کە برای میر عیسا بوو تەنیا سەرداری شەقڵاوە بوو، کە ئەویش (پیر بۆداقی بابان) داگیری کرد. هەروەها باسی داگیرکرانی (هەریر)ی پایتەختی سۆران دەکا دوای کوژرانی (میر عیسا) لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی لەشکری بابان. بەڵام ئاماژە بەوە دەکا کە (میر سەیدی) دوای کوشتنی (پیر بۆداق) کەوتە هەوڵی بەدەستهێنانەوەی ناوچەکانی دەسەڵاتی سۆران.[٣٨]

لەبەرئەوەی (پیر بۆداق) وجاغ کوێر بوو - وەک پێشتر باسمانکرد- هەروەها پێشتر (ڕۆستەم)ی براشی کوشتبوو کە پیلانی لەدژی ئەو گێڕابوو، بۆیە (بۆداقی کوڕی ڕۆستەم) دوای کوژرانی مامی دەسەڵاتی گرتەدەست. بەڵام ئەمیش نەیتوانی بەشێوەیەکی شایستە حوکمڕانی بکا و تەنیا دوای دوو ساڵ فەرمانڕەوایی مرد، بێ ئەوەی وەچەیەک لەدوای خۆی بەجێ بهێڵێ.[٣٩] بەم شێوەیە ماوەی دەسەڵاتی بنەماڵەی یەکەم کۆتایی هات.[٤٠]

هەر لە سەردەمی میر (بۆداقی کوڕی ڕۆستەم) سەرکردەو دەسەڵاتدارانی ناوچەکانی بابان بەتەواوی ملکەچی میری بابان نەبوون. بەڵام دوای مردنی ئەم

مــیــره و برانەوەی وەچەی بنەمــاڵەی دەســەڵاتداری بابان، یەکــێک لە دەست و پێــوەندەکــانیــان بەناوی (پیــر نەزەر کــوڕی بارام) دەســەڵاتی گــرتە دەست و میرنشینەکەی لە دارمان و پەرتەوازەبوون ڕزگار کرد. (موکریانی) باس لەوە دەکا کـە ئەم مـیـره توانی هەمـوو ئەو خـاکـە حـوکم بکا کـە (پیـر بۆداق) بەدەسـتی هێنابوو.[٤١] دیارە ئەمــەش تاڕاددەیەکی زۆر ڕاســتــە بەتایبــەتی ســەبارەت بە ناوچەکانی باشوور، چونکە لە سەردەمی ئەم میرەدا تەنانەت ناوچەی (کفری)ش دەخرێتە چوارچێوەی قەڵەمڕەوی بابان.[٤٢] شایانی باسە (سەعد بەشیر ئەسکەندەر) سەبارەت بە (کفری)ش دەڵێ سەر بەوالی بەغدای عوسمانی بوو.[٤٣] بەڵام ئەمە زۆر لەڕاســتــیــیــەوە دوورە، چونکە دوای نزیکەی (٢٠) ساڵی تر ئنجا سـوڵتـان سولێمانی قانونی (١٥٢٠ - ١٥٦٦ز) لە ساڵی ١٥٣٤ز شاڵاوێک بۆ ناوچەکە دەهێنێ و بەغدا لەژێر دەسەڵاتی سەفەوی دەردەهێنێ، هەروەکو لە (شەرەفنامە)شدا دیارە.[٤٤] کەواتە ڕووداوی گرتنی (کفری) لەلایەن (پیـر نەزەر) لەگرێی دووەمی سەدەی شازدە دابووە و زۆربەی فراوانخوازییەکانی سەردەمی (پیر بۆداق)یش هەر لەگرێی یەکەمدا بووە.

بەمـردنی (پیـر نەزەر) و نەهاتنی کـەسـێکی ئەو بنەمـاڵەیە بۆ سـەر دەسـەڵات حوکمڕانی بنەماڵەی دووەمی بابان کۆتایی دێت. لێرە بەدوا ماوەی فەرمانڕەوایی هەردوو بنەماڵەی سێیەم و چوارەم دەست پێدەکات، چونکە میرنشـینەکە لەنێوان دوو سەرداری ناوچەیی دابەش بوو. یەکێکیان (میـر ئیبراهیم) بوو، ئەوی تریش (میر سلێمان) بووکە بەشەکەی تری میرنشینەکەی لەدەست دابوو. دوای (٩) ساڵ حوکمڕانی بە تەبایی و ئارامی، دوژمنایەتی لەنێوان ئەم دوو میـره سەری هەڵدا و(مـیـر ئیـبـراهیـم) لەلایەن (مـیـر سلێـمـان)ەوە کـوژراو هەردوو بەشی بابان یەکخرایەوە.[٤٥] دەتوانین ئەم ڕووداوە بەیەکەم تۆوی دووبەرەکی دابنێین لەنێـوان مـیـرەکـانی باباندا، دیارە هەر ئەم دووبەرەکـیـیـەش ڕێگە خۆشکەر دەبێ بۆ هەوڵی ڕاکێشانی دەستی دەرەکی بۆ نێو کاروباری بابان.

هەروەها دیارە ئەم ڕووداوە لەدوای ساڵی ١٥٢٤ز بووە، چونکە هەر دوای ئەم ڕووداوە (حاجی شێخ) ی کوڕی (میـر ئیبراهیم) کەوتە هەوڵی تۆڵە سەندنەوەو گێڕانەوەی دەسەڵاتی باوکی، لەم پێناوەشدا پەنای بۆ شا تەهماسپی سەفەوی برد کە لەنێوان ساڵانی (١٥٢٤-١٥٧٦ز) حوکمڕانی کردووە. بەپێی گوتەی زۆربەی سەرچاوەکان ناوبراو هیچ یارمەتییەکی لەوێ دەست نەکەوتووە و دواتر بەهەوڵی خۆی توانی ناوچەکانی (نارین) و (دیالە) لە دەسەڵاتی (میر سلێمان) دابڕێ و

لەوێ پێگەی خۆی دامەزرێنێ. کاتێکیش کە میری ناوبراو دوای پازدە ساڵ حوکمڕانی مرد، (حاجی شێخ) دەستی بەسەر هەموو میرنشینی بابان ڕاگەیشت.[٤٦] بەڵام ئەگەری ئەوە لەگۆڕێ دایە کە میری ناوبراو لەلایەن میری ئەردەڵانەوە داڵدە درابێ و یارمەتی درابێ بۆ گەیشتن بەدەسەڵات. چونکە (مەئمون بەگی کوڕی بێگە بەگ) ی میری ئەردەڵان کە باسی (حاجی شێخ) دەکا دەڵێ: ((لەو میرە کوردانەیە کە بێگە بەگ پەروەردەی کردوون و بەدەسەڵاتی گەیاندوون)).[٤٧]

ئەم دووبەرەکییەی کە لە سەردەمی (میر سلێمان) دا تۆیەکەی چێنرا، لەم ماوەیەدا چەکەرەی کرد و هێزەکانی دەوروبەریش (بەتایبەتی سەفەوی و عوسمانی) بە دەست تێوەردانەکانیان زیاتر ئاویان دا. لە ئەنجامدا هێز و توانای بابان لە کرژبوونەوە دابوو، ڕەوشی ژیانی دانیشتوانیش بەرەو ناهەمواری چوو.

کاتێ (حاجی شێخ) دوای مردنی (میر سلێمان) دەرفەتی وەرگرت و هێرشی هێنا بۆ ئەوەی تەواوی میرنشینی بابان بخاتە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیەوە، کوڕانی (میر سلێمان) نەشیان بەرەنگاری بکەن و بەڕێبەرایەتی (میر حوسێن) -کە گەورەکەیان بوو- هانایان بردە بەر شا تەهماسپی سەفەوی.[٤٨] زۆربەی سەرچاوەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە لەم ماوەیەدا بارگرژی و شەڕ زاڵ دەبێ بەسەر پەیوەندییەکانی نێوان بابان و دەوڵەتی سەفەوی، بەڵام لەبارەی هۆکارەکان بۆچوونی جیاواز هەیە: بەپێی یەکێ لە بۆچوونەکان شا بەهانای (میر حوسێنی کوڕی میر سلێمان)ـەوە چووە[٤٩] و لە هەمان کاتیشدا ئەمەی بەدەرفەت داناوە بۆ لەشکرکێشی کردنەسەر ناوچەکە لە چوارچێوەی ململانێ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی کە لەو دەمە لە ئارادابوو.[٥٠] بەڵام (موکریانی) ئاماژە بەوە دەکا کە شاتەهماسپ مەترسی لە (حاجی شێخ) هەبوو کە چاو لە خاکی ئێرانیش ببڕێ.[٥١] کەچی (شەرەفخان) دەڵێ ناوبراو ((هەمیشە کاری دژ بە شا تەهماسپ ئەنجام دەدا، بۆیە شا ناچار بوو جەنگ لە دژی ئەو ڕابگەیەنێ)).[٥٢] کەواتە دیارە (حاجی شێخ) بەڕاستی فراوانخوازی لە ناوچە کوردییەکانی ژێر دەسەڵاتی سەفەویدا ئەنجام داوە، وەک لەیاداشتەکانی (مەئمون بەگی ئەردەڵان) دا لە گوتەکانی خودی شا تەهماسپدا دەردەکەوێ.[٥٣] هەروەها دیارە ئەگەر مەبەستی شا تەنیا بەهاناهاتنی میرێکی نەیاری بابانی بوایە ئەوا یارمەتی (حاجی شێخ)یشی دەدا کە پێشتر هانای وەبەر ئەو بردبوو.

شا تەهماسپ سێ هەڵمەتی سەربازی یەک لەدوای یەکی هەنارده سەر ناوچەکانی بابان، بەڵام میری بابان تەنیا بەپشت بەستن بە جەنگاوەر و دانیشتوانی میرنشینەکەی خۆی توانی ڕووبەڕووی ئەم هەڵمەتە سەفەوییانە ببێتەوەو دوای

زیانێکی زۆر بەشکست خواردوویی بیانگەڕێنێتە دواوە. بێگومان سەختی ناوچەکانی بابانیش یارمەتیدەر بوو بۆ بەرگری، بەتایبەتی لە هەڵمەتی سێیەمدا کە لە چیای (گەڵاڵە) لە ناوچەیەکی شاخاوی پڕ لەدارستان رووی دا و لەئەنجامدا لەلایەنی لەشکری سەفەوی (٢-٣) هەزار کەس کوژران.(٥٤) جێگەی سەرنجە شا تەهماسپ دوای ئەم شکستانە داخی دڵی خۆی بەکوڕانی (میر سلێمان) ڕشت، کە پێشتر هانایان بۆ بردبوو و ڕێنمایی ئەم هەڵمەتانەشیان دەکرد. ئەوەبوو هەموانی بەند کرد، بەڵام دواتر ئازاد کران و ئەمجارەیان پەنایان بۆ سوڵتانی عوسمانی (سلێمانی قانونی) برد. ئەویش مووچەی بۆ بڕینەوەو لە ڕۆمیللی (بەشی ئەوروپای دەوڵەتی عوسمانی) دایمەزراندن.(٥٥)

سەبارەت بە چارەنووسی (حاجی شێخ)ی میری بابانیش (شەرەفخان) دەڵێ دوای ئەوەی (سوڵتان سلێمان) لەئەنجامی هێرشەکەی ساڵی ١٥٣٤ز (بەغدا)ی داگیر کرد و ماوەیەک لەم شارە مایەوە، میری ناوبراو بەمەبەستی گوێڕایەڵی دەربڕین و بۆ دیتنی سوڵتان کەوتەڕێ. بەڵام کاتێ گەیشتە ناوچەی (مەرگە)، هەندێ لەخەڵکی ئەم ناوە خۆیان لە بۆسە نا و توانییان (حاجی شێخ) و (ئەمیر)ی برای بکوژن.(٥٦) پێدەچێ (شەرەفخان) لێرەدا ڕاستی نەپێکابێ بەتایبەتی لەدیاریکردنی وادەی کوشتنەکە، چونکە لەیاداشتەکانی (مەئمون بەگ) دا بۆمان دەردەکەوێ کە (حاجی شێخ) دوای داگیرکردنی (بەغدا) و تەنانەت تا دانانی دووەم والی عوسمانی لەسەر ئەم شارە هەر ماوە. لەم یاداشتانەدا باسی هێرشێک دەکرێ کە (غازی خان)ی میری برادۆست(٥٧) لەسەر داوای شا تەهماسپ کردوویەتیە سەر (حاجی شێخ)ی میری بابان. دیارە ئەم هێرشە زۆر توندوتیژ بووە و وێرانی و تاڵانکاری زۆری بۆ میرنشینەکە و دانیشتوانەکەی هێناوە، بۆیە میری ناوبراو خۆی لە شاخێکی سەخت قایم کرد و داوای یارمەتی لە والی بەغدا کرد. (محەمەد پاشا)ی والی بەغداش هێزێکی بۆ یارمەتی ئەو نارد. لەئەنجامدا لەشکری سەفەوی پاشەکشەی کرد دوای ئەوەی لە هەڵمەتێکدا سەرنەکەوت کە کردیە سەر بارەگای میری ناوبراو لە شاخە سەختەکە.(٥٨)

ئەگەر بزانین کە (سلێمان پاشا)ی یەکەم والی عوسمانی لە بەغدا لە ساڵی ٩٤٢ک/١٥٣٦زدا لە پۆستەکەی لادراوە،(٥٩) ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە (حاجی شێخ) تا دوای ئەم ساڵە لە حوکمڕانی بابان بەردەوام بووە. کەواتە ڕووداوی کوشتنی میری ناوبراو لە ساڵی ١٥٣٤ز نەبووە، بەڵکو لەکاتێکی تری دوای ساڵی ١٥٣٦زدا بووە. لەلایەکی تر بەهۆی ئەم ڕووداوەوە دەزانین کە میری بابان بەر لەم

مێژووه له هەمبەر فشاری سەفەوی پەیوەندی پاشکۆیەتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا دامەزراندووه، بۆیە داوای یارمەتی له والی بەغدا کردووه. هەر لەئەنجامی ئەمەدا میرنشینی بابان لەنێو لیستی دابەشبوونی کارگێڕی عوسمانیدا دەبینینەوه لەم ماوەیەدا. ئەوەتا بابان یەکێک بوو له (سەنجەق)ەکانی ویلایەتی لوڕستان کە دەوڵەتی عوسمانی دوای داگیرکردنی بەغدا پێکی هێنا.[٦٠] بێگومان ئەم پەیوەندییەش هەروەک میرنشینە کوردییەکانی تر بریتی بووه له ڕازیبوون بەدەسەڵاتێکی سەرزارەکی عوسمانی، بەو پێیەی قەواره و سەربەخۆیی ناوەخۆیی میرنشینەکە و هەروەها مافی بۆماوەیی میری دەسەڵاتدار له حوکمدا پارێزراو بوو.[٦١]

دوای کوژرانی (حاجی شێخ)، (بۆداق)ی کوڕی بەفەرمانی سوڵتان (سلێمانی قانونی) کرایه فەرمانڕەوای بابان. لەژێر حوکمڕانی ئەم میرەدا میرنشینەکە بۆ ماوەی (١٦) ساڵ ئارامی و سەقامگیری بەخۆوە بینی. لەکۆتایی ئەم ماوەیەدا بەهۆی دەست تێوەردانی دەرەکی دیسان شەڕ و دووبەرەکی لەسەر دەسەڵات پەیدا بۆوه. ئەمەش کاتێک ڕووی دا کە (حوسێن بەگی کوڕی میرسلێمان)، کە پێشتر لەگەڵ براکانی پەنای بۆ دەرباری عوسمانی بردبوو، له دیوانی سوڵتانەوه فەرمانی حوکمڕانی بابانی پێدرا. هەر لەگەڵیشیدا بڕیاردرا (سوڵتان حوسێن)[٦٢]ی میری بادینان یارمەتی بدا بۆ گەیشتن بە پلەو پایەکەی. بەڵام ئەنجامدانی ئەم کاره زۆر گران نەبوو، چونکە (بۆداق بەگ) کە زانی توانای بەرگری نییە میرنشینەکەی بەجێهێشت و پەنای بۆ شا تەهماسپ برد.[٦٣]

دیاره سیاسەتی دەسەڵاتدارانی عوسمانی لەم ماوەیەدا له هەمبەر میرنشینی بابان لەسەر بناغەی ئاژاوه نانەوەو دووبەرەکی دروستکردن بنیاد نرابوو، ئەوەتا دوای تێپەڕبوونی تەنیا چەند مانگێک بەسەر ئەم ڕووداوه، (ڕۆستەم پاشا)ی سەدری ئەعزەمی عوسمانی (بۆداق بەگ)ی له ئێرانەوه بانگ کردەوەو بەفەرمان و نیشانەی میرایەتیەوه ڕەوانەی بابانی کردەوه. شتێکی ئاسایی بوو کە لەئەنجامی ئەمەدا ڕووبەڕوو بوونەوه لەنێوان هەردوو میری ڕکابەر بێتە ئاراوه. بەڵام بەر له ڕوودانی شەڕو پێکدادان (حوسێن بەگ) توانی خۆی بگەیەنێتە ئەستانبول و فەرمانێکی سوڵتانی بەدەست بهێنێ، کە تیایدا بڕیار درابوو هەردوو میر، بەهاوبەشی میرنشینەکە بەڕێوه ببەن.[٦٤] واتە میرنشینی بابان کرایە دوو بەش و هەریەکێک لەم دووانە کرایە میری بەشێکیان. بەمەش بابان یەکێتی و هەروەها سەنگی سیاسی خۆشی لەدەست دا.

بێگومان مەسەلەیەکی چاوەڕوانکراو بوو کە ئەم دوو میرە ڕکابەرە لەگەڵ یەکتردا هەڵ نەکەن و شەڕ لەنێوانیاندا بەرپابێ. لە ڕاستیشدا ئەمە ڕووی دا و لە ئەنجامدا (حوسێن بەگ) لەگەڵ یەکێ لە براکانی کوژرا. بەڵام (بۆداق بەگ)یش دوای ئەم ڕرووداوە ڕووبەڕووی ڕقی سوڵتان بۆوەو نەیتوانی دەست بە میرنشینەکەیەوە بگرێ. ئەگەرچی دواتر بەهەوڵی (سوڵتان حوسێن)ی میری بادینان لەلایەن سوڵتانی عوسمانییەوە فەرمانی لێخۆشبوونی بۆ دەرکرا، بەڵام لەجیاتی بابان کرایە سەنجەق بەگی (عینتاب) کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای کوردستان. ئەو بەشەی میرنشینی بابانیش کە پێشتر بەو سپێردرابوو، کرایە سەنجەقێک و کەسێک بەناوی (وەلی بەگ)[٦٥] لەسەری داندرا. بەڵام بەشەکەی تری میرنشینی بابان کە ناوچەی (مەرگە)ی دەگرتەوە درایە (خدر بەگی کوڕی میر حوسێن).[٦٦] بەم شێوەیە بەشێکی بابان خرایە ژێر کارگێڕی ڕاستەوخۆی عوسمانی و حوکمڕانی خۆجێیی یان بەواتایەکی تر سەربەخۆیی ناوەخۆیی لەدەست دا.

ئەم کەرتبوونەی میرنشینی بابان لە دابەشبوونە کارگێڕییەکانی ئەم ماوەیەدا ڕەنگی داوەتەوە، ئەوەتا لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا کە بریتییە لە دەفتەرێکی تایبەت بە دابەشبوونە کارگێڕییەکانی ساڵانی ١٥٦٣ - ١٥٧٤ز، لەنێو ویلایەتی شارەزووردا سەنجەقێک بەناوی (مەرگە) و یەکێکیش بەناوی (ناوچەی بابان) هەیە.[٦٧] لە دەفتەرێکی تردا کە دابەشبوونە کارگێڕییەکانی ساڵانی ١٥٧٤-١٥٨٣ز لەخۆ دەگرێ، ناوی ئەم دوو سەنجەقە دووبارە دەبێتەوە لەنێو هەمان ویلایەتدا، بەڵام ئەمجارەیان لەلای ناوی (بابان) ئاماژە بەوەکراوە کە ئەم سەنجەقە ناوچەیەکی جیاکراوەیە لە (بابان).[٦٨] کەواتە ناوی (بابان) بەفەرمی بۆ ئەو بەشەی میرنشینەکە بەکارهاتووە کە خراوەتە ژێر سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی عوسمانی.

یەکێ لە مێژوونووسان کە کۆمەڵێک بەڵگەنامەی عوسمانی لەبارەی بابان دەستکەوتووە و بڵاوی کردۆتەوە، بۆچوونێکی وا دەخاتەڕوو کە لە حەفتاکانی سەدەی شازدەدا میرنشینی بابان هەڵوەشاوەتەوە، لەسەر ئەو بناغەیەی کە لەم بەڵگەنامانەدا (بابان) وەکو یەکەیەکی کارگێڕی ئاسایی بەدیاردەکەوێ و فەرمانبەری عوسمانی بەڕێوەی دەبەن.[٦٩] کەچی لەڕاستیدا میرنشینەکە هەرچەندە سنووری بەرتەسک بووە و تەنیا ناوچەی (مەرگە)ی دەگرتەوە، بەڵام وەکو قەوارەیەکی خۆجێیی کوردی لەژێر دەسەڵاتی میرێکی بابانی (خدر بەگی کوڕی میر حوسێن) تا هەشتاکانی سەدەی ناوبراو هەرمابوو، وەک دواتر بۆمان بەدیاردەکەوێ.

هەرچی ئەم بەڵگەنامانەیە ئەوا باس لەم بەشەی بابان دەکەن کە درایە (وەلی بەگ) و کەوتە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی عوسمانی، وەک پێشتر باسمان کرد.

ئەم بەڵگەنامە نێوبراوانە باسی نائارامی ڕەوشی ئەم بەشەی دوایی دەکەن کە بەنێوی (لیوای بابان) بانگی دەکەن. هەر ئەم نائارامییە وای کردبوو کە مەڵبەندێکی شارستانی ئەوتۆ لە دەڤەرەکەدا نەبێت، بەتایبەتی کە هۆزەکانی ئەم ناوە زۆربەیان چادرنشین بوون و دژی هەر بزاڤێکی ئاوەدانکاری دەوەستان لە دەڤەرەکەدا. بۆیە لە ساڵی ١٥٧٠ز بەدواوە مەسەلەی بنیادنانی قەڵایەک بابەتێکی سەرەکی چەندین نامە و نووسراوی فەرمی بووکە لەنێوان بەرپرسانی ناوچەکە و سوڵتانی عوسمانی ئاڵوگۆڕ کران.[٧٠] بێگومان ئەم قەڵایە بۆ ئەوەبوو کە ببێتە ناوەندێکی کارگێڕی لە ناوچەکە، لە هەمان کاتیشدا وەک بارەگای سەربازی بەکاربهێنرێت بۆ بەرگریکردن لە بەرامبەر هێرشە ناوەخۆیی و دەرەکییەکان. بۆیە لە بەڵگەنامەیەکی ساڵی ١٥٨٢زدا باس لە دابینکردنی ئازووقە و پێداویستی سەربازی بۆ قەڵای بابان و هەندێ قەڵای تری ناوچەکە کراوە.[٧١]

سەرەڕای ئەمەش ناوچەی بابان سەقامگیری بەخۆوە نەبینی و دەسەڵاتدارانی عوسمانی ئاستەنگی زۆریان هاتە ڕێ لە چەسپاندنی دەسەڵاتیان لە ناوچەکەدا، بەتایبەتی بەهۆی ناڕەزایی هۆزەکانەوە. ئەوەتا لە بەڵگەنامەیەکی ساڵی ١٥٧٣ز دا (عزالدین بک) ناوێک کە لەلایەن دەوڵەتەوە وەک سەرداری نوێی بابان داندرابوو، ڕووبەڕووی هەڵوێستی نەیاری هەردوو هۆزی (ئاکۆ) و (بلباس) بۆوە لەکاتێکدا کە بەڕێوەبوو بۆ وەرگرتنی پایە نوێیەکەی. لەئەنجامدا چەند پیاوێکی کوژران و خۆشی تالان کرا دوای ئەوەی دوو ڕۆژ ئابڵوقە درا.[٧٢] دیارە ئەم ڕووداوە تەنیا کارێکی ڕێگری و تالانکاری نەبووە لەلایەن ئەم هۆزانەوە، بەڵکو ڕاپەڕینێک بوو کە لە هەڵوێستی ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتی عوسمانی لە ناوچەکە سەرچاوەی گرتبوو. چونکە بەڵگەنامەیەکی عوسمانی ساڵی ١٥٧٤ز هەواڵی ئەوە دەدا کە هەندێ خەڵکی (لیوای بابان) دژی دەسەڵاتی عوسمانی وەستاون ـ یان ((یاخی بوون)) بەپێی گوزارشتی بەڵگەنامەکە ـ و سەردارێکیان بۆ خۆیان داناوە بە ناوی (حوسێن) کە گوێڕایەڵی دەکەن.[٧٣]

شێوازێکی تری ملکەچ نەبوونی خەڵکی ناوچەی بابان بۆ دەسەڵاتی عوسمانی خۆی لە نەدانی باج و پیتاک بینیوەتەوە. دیارە ئەم هەڵوێستەش نیگەرانییەکی زۆری لای دەسەڵاتدارانی عوسمانی دروست کردووە بۆیە لە بەرزترین ئاستدا (کە سوڵتانە) بایەخیان پێداوە. تەنانەت لەباری جیاجیادا داوا لە والی و سەردارانی

دەوروبەر (وەک: والی شارەزوور، والی بەغدا، میری سۆران، سەرداری هەولێر) کراوە بۆ ئەوەی بەخۆیان یان بەهێزەکانیان هاریکار بن بۆ کۆکردنەوەی باج لە ناوچەی بابان، وەک لە ژمارەیەک بەڵگەنامەی عوسمانی ساڵانی ١٥٧٤-١٥٨١دا دەردەکەوێ.[٧٤]

سەبارەت بە بەشەکەی تری میرنشینی بابان کە لە ناوچەی (مەرگە) پێکدەهات و درابووە (خدر بەگی کوڕی میر حوسێن)، زانیاری ئەوتۆمان نییە. بەڵام پێناچێ رووبەرووی کێشەی لەم شێوەیە بووبێتەوە، چونکە لەلایەن میرێکی بابانی حوکمڕانی کراوە، کە بەپێی نەریتی ناوچەکە شەرعیەتی هەبووە بۆ ئەم کارە. ئەوەتا (شەرەفخان)یش پێمان دەڵێ کە ئەم میرە لە دەسەڵات بەردەوام بووە تا هاتنی سەردەمی سوڵتان (مورادی سێیەم ١٥٧٤-١٥٩٥).[٧٥] بەڵگەنامەیەکی عوسمانی ساڵی ١٥٧٨ ئاماژە بەوە دەکا کە (خضر)ی میری بابان لەگەڵ چەندین میری کوردی تر بەشدارییان کردووە لە هەڵمەتێکی دژ بە دەوڵەتی سەفەوی.[٧٦] گومان لەوەدا نییە کە ئەم (خضر) ناوە هەر (خدر بەگی کوڕی میر حوسێن)ە، چونکە ناوبراو تا ئەو کاتەش لە حوکمڕانی ناوچەکەی ژێر دەسەڵاتی هەر بەردەوام بووە.

بەڵام لە ساڵی ٩٩١ک/١٥٨٢-١٥٨٣ز رووداوێک هاتە پێش کە بەخراپی لەسەر (خدر بەگ) و ناوچەی بابان شکایەوە. ئەویش ئەوەبوو کە لەم ساڵەدا (ئەمیر بەگی موکری)[٧٧] و هەندێ میر و سەرداری کوردی تر لە دەوڵەتی سەفەوی یاخی بوون و روویان لە دەوڵەتی عوسمانی کرد. دەسەڵاتدارانی عوسمانیش لە چوارچێوەی پاداشتکردنێکدا بڕیاریاندا ناوچەی (مەرگە) لەژێر دەسەڵاتی (خدربەگ) دەربێنن و بیدەنە یەکێ لەکوڕانی (ئەمیر بەگی موکری)، یان خودی (ئەمیر بەگ) هەروەکو (شەرەفخان) لە شوێنێکی تردا وادەڵێ.[٧٨] لە راستیشدا مەسەلەکە جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە، چونکە دیارە ئەگەر درابێتە میری ناوبراویش ئەوا بەهۆی خەریکبوونی بەشوێنەکانی تر نەیتوانیوە ئەم ناوچەیە بەڕێوە ببات و بەیەکێ لە کوڕانی سپاردووە. جێگەی سەرنجە هەر (شەرەفخان) کاتێ لەبۆنەی تردا باسی ئەم رووداوە دەکا، لەجیاتی (مەرگە) ناوی (بابان) دەهێنێ.[٧٩] هەندێ مێژوونووسی تریش هەر ئاماژە بە (بابان) دەکەن.[٨٠] بێگومان ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە (خدر بەگ) ئەگەرچی تەنیا حوکمڕانی ناوچەی (مەرگە)شی کردبێ، بەڵام خۆی وەکو میری بابان و ناوچەی دەسەڵاتیشی هەر بە(بابان) ناسراوە.

هەرچۆنێک بێ (خدر بەگ) ی میری بابان بەم کارەی دەسەڵاتدارانی عوسمانی رازی نەبوو، لەئەنجامدا ناکۆکی و ململانێ لەنێوان هەردوو میر دەستی پێکرد و

درێژەی کێشا. لە هەلومەرجێکی وەهادا (خدر بەگ) مرد و ناوچەکە بێ سەرۆک مایەوە، چونکە هەر لەم ماوەیەدا حکومەتی عوسمانی (بابان)ی لە (ئەمیر بەگی موکری) سەندبۆوە.[81] دیارە (خدر بەگ) یش هیچ وەچەیەکی نێرینەی نەبووە.[82]

لێرەدا ماوەی حوکمڕانی بنەماڵەی چوارەم کۆتایی هات و میرنشینی بابان لەبارێک هەڵوەشایەوە، لەبەرئەوەی سەردار و سەرۆک هۆزەکانی نێو قەڵەمڕەوی میرنشینەکە ڕازی نەبوون ملکەچی کەسێکی بێگانە بکەن، دیارە لەنێو خۆشیاندا ڕێک نەکەوتوون لەسەر دانانی میرێک لەخۆیان. لەئەنجامدا هەریەکەیان کاروباری ناوچەکەی خۆی گرتەدەست و بەڵێنیان دا ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن، بەتایبەتی سەبارەت بەکۆکردنەوەی باج و پیتاک. بەڵام ناوچەکە بەگشتی بەزەویوزاری تایبەتی دەربار یان سوڵتان (خەواسی هەمایۆن) ئەژمارکراو لەڕووی کارگێڕیشەوە سەر بەویلایەتی شارەزوور بوو. دیارە دەسەڵاتدارانی عوسمانی کە بەم هەلومەرجە ڕازی بوون لەبەر ئەوە بوو کە لە توانایاندا نەبوو حوکمی ڕاستەوخۆ بەسەر ئەم ناوچە سەختەدا بسەپێنن، کە خاوەنی چوار هەزار سوارەی چەکداری ئازاو دلێر بوو لەگەڵ چەندین سەرۆک و سەرکردەی سەرکەشی زەبر بەدەست، هەروەکو لە قسەکانی (شەرەفخان)دا بەدیار دەکەوێ.[83]

لەنێو لیستێکی سەنجەقەکانی ئیالەتی شارەزوور کە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەم هیچ سەنجەقێک بەناوی (بابان) بەدی ناکەین، لەکاتێکدا سەنجەقی (مەرگە) هەبوونی هەیە.[84] ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێ کە لەم ماوەیەدا قەوارەیەکی سیاسی و هەروەها کارگێڕی بەناوی (بابان) لەئارادا نەبوو. بەڵام ئەم زاراوەیە وەکو ناوێک بۆ ناوچەکە هەر مابوو، وەکو دواتر بۆمان بەدیار دەکەوێ.

**فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە و بووژانەوەی قەوارەی بابان:**

بارودۆخ بەم شێوەیە مایەوە تا (فەقێ ئەحمەد) ناوێک لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەم[85] لەگوندی (دارەشمانە)[86] ی ناوچەی پشدەر، سەرلەنوێ بناغەی میرنشینی بابانی دامەزراندەوە. بەمەش حوکمڕانی بنەماڵەی پێنجەمی[87] بابان ـ کە بە بابانییەکانی سلێمانی دەناسرێن ـ دەستی پێکرد و تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم بەردەوام بوو.[88]

بەدیارکەوتنی (فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە) و بنیادنانەوەی میرنشینی بابان لەسەر دەستی ئەو بۆتە بابەتی هەندێ چیرۆک و ئەفسانەی جۆراوجۆرکە بەتایبەتی

له ناوچەی پشدەر بڵاوبوونەوە.[89] ئەمەش وای کردووە کە ئەم ڕووداوە ڕەهەندێکی ئەفسانەیی وەربگرێت و زانیاری دروست و خەیاڵ تێکهەڵکێش بکرێن. بەڵام ئەوەی جێگەی گومان نییە ئەوەیە کە (فەقێ ئەحمەد) لەگوندی (دارەشمانە) دەسەڵاتێکی خۆجێیی دامەزراندووەو توانیویەتی بەزیرەکی و لێهاتوویی خۆی دەسەڵات و هەژموونی بەسەر خەڵکی ناوچەکەدا بسەپێنێ و هەردوو دەڤەری مەرگە و پشدەر یەکبخات.[90] لە سەردەمی (خان بۆداق) ی کوڕیشی ئەم دەسەڵاتە فراوان بووە و هەندێ ناوچە و هۆزی دەوروبەریشی گرتۆتەوە بەتایبەتی (ئاکۆ) و (بلّباس)،[91] هەروەها ناوچەکانی (ماوەت) و (شارباژێڕ).[92] لە ئەنجامدا ئەم میرە بۆتە دەسەڵاتدارێکی زەبر بەدەست لەم دەڤەرانە.[93]

لە سەردەمی (سلێمان بەبە)ی کوڕی (خان بۆداق)یش (١٦٦٩- ١٦٩٩ز) میرنشینەکە زیاتر شێوەی قەوارەیەکی سیاسی وەرگرت. هەروەها فراوانبوونی زیاتری بەخۆوە بینی و ناوچەکانی (شارەزوور) و (قزلجە) و (سرۆچک) و (قەرەداغ) و (بازیان) خرانە نێو قەڵەمڕەوی بابانەوە.[94] هەر لەم سەردەمەدا مەڵبەندی دەسەڵات گوازرایەوە بۆ (قەڵاچواڵان) و لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیشەوە دانی پێدانرا.[95]

ئەوەی بەڵگەی زیندووبوونەوەی میرنشینی بابان لەم ماوەیەدا بەدەستەوە دەدا ئەوەیە کە لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەمدا سەرلەنوێ ناوی (بەبە - یان /بابان) لەنێو لیستی سەنجەقەکانی ئیالەتی شارەزووردا دەبینینەوە.[96]

**بنەچەی ناوی (بەبە ـ بابان):**

ئاشکراکردنی ڕەگ و ڕیشەی ناوی (بابان) و چۆنیەتی بەدیارکەوتنی ئەم وشەیەو واتاکەی بووەتە بابەتێکی ئاڵۆز و نادیار، کە سەرەڕای ئەوەی چەندین بۆچوونی جیاجیای لەبارەیەوە خراوەتە ڕوو، بەڵام هێشتا بەتەواوی پەردەی لەڕوو لانەدراوە و ڕاستی مەسەلەکە نەپێکراوە. دیارە لەبەرئەوەی بنەماڵەی پێنجەمی بابان (بابانییەکانی سلێمانی) زیاتر ناسراوە و هەواڵی چوار بنەماڵەکەی تر لەلایەن خەڵکانێکی زۆرەوە - بەتایبەتی لەساڵانی پێشوو - نادیار و نەزانراو بوو، بۆیە زۆربەی هەوڵەکان لەوەدا چڕبووەتەوە کە سەرەتای بەکارهێنانی زاراوەی بابان لەلای میرە بەراییەکانی بنەماڵەی پێنجەم بدۆزرێتەوەو واتاکەی دیاری بکرێ. بۆیە هەندێ لەم هەوڵانە سادە و ساویلکانە دێنە بەرچاو، بەتایبەتی ئەو بۆچوونانەی لەناو خەڵکی ئاساییدا بڵاون. بۆ نموونە (عەبدولقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان) کە

لەساڵی ١٨٧١ز دا کتێبێکی داناوە، بەبڕوایەکی تەواوەوە دەڵێ (بابان) لەناوی (بابە سلێمان)ـەوە داکەوتووە، ئەمەش کاتێک ڕووی داوە کە ناوبراو دوای ئەوەی لەشەڕێکی سەختدا سەرکەوتنی بۆ لەشکری عوسمانی مسۆگەر کردووە، لەلایەن سەرداری لەشکری عوسمانییەوە پێشوازی لێکراوەو وەک دەست لەپشت دانێک پێی گوتووە ((بابام سولەیمان)). گوایا لەمەوە ئەم ناوەی بەسەردا براو دواتریش نەوەکانی بە(بابان) ناسران.[٩٧]

پیرەمێردێکی بەساڵاچووی سلێمانیش لەساڵی ١٨٢٠دا بە (ریچ) ی جێنشینی بریتانی گوتووە کە (بابا سلێمان) بۆیە نازناوی (بابا)ی دراوەتە پاڵ چونکە بەر لەدایکبوونی باوکی مردووە.[٩٨] هەرچی (ئەمین زەکی) یە لەپەراوێزی یەکێ لە کتێبەکانی نووسیویەتی: دەگێڕنەوە گوایا (سلێمان بەگ) لە ئەستانبول بەجلی کوردییەوە چووە بۆ لای سوڵتانی عوسمانی، ئەمیش پێی سەرسام بووە و گوتوویەتی ((وای بەبەم))، ئیتر بە (سلێمان بەبە) ناسراوە.[٩٩] لە سەرچاوەیەکی تر ئەم ڕووداوە بە (فەقێ ئەحمەد) بەستراوەتەوە.[١٠٠] بێگومان هەموو ئەم سەربردە و چیرۆکانە لەڕاستییەوە دوورن و دەچنە قالبی ئەفسانە وگوتەی هەڵبەستراو، چونکە گومان لەوە دانییە کە زاراوەی (بابان) زۆر لەوە کۆنترە.

هەندێ لە نووسەران بۆچوونی تر دەخەنەڕوو کە ئەوانیش هەندێکیان تەنیا مەزەندەن و هەندێکیشیان لەسەر زانیاری نادروست و بێ بنەما دامەزراون. بۆیە لەگەڵ ڕووداوە مێژووییەکان تێک ناکەنەوە، بەتایبەتی بۆچوونەکەی (موکریانی): کە لەشوێنێکدا دەڵێ (تەیمورخان)ی میری ئەردەڵان کە هاوسەردەمی سوڵتان موورادی سێیەمی عوسمانی (١٥٧٤-١٥٩٥) بوو، کاتێ خاکی شارەزووری کردە دوو بەش دوو ناوی بۆ داندرا، یەکێکیان بوو بە (بابان) و ئەوی تریش بووە (ئەردەڵان) لەبەرئەوەی ناوبراو ناوی (بابا ئەردەڵان)ی باپیرە گەورەیانی کردە دوولەت و هەر بەشێکی شارەزوور لەتێکی بەرکەوت.[١٠١] کەواتە (موکریانی) لێرەدا دەڵێ ناوی (بابان) لەچارەکی کۆتایی سەدەی شازدە لەم بەشەی شارەزوور نرا. بەڵام دوای چەند لاپەڕەیەکی تر کە دێتە سەر باسی (میر بۆداقی کوڕی میر ئەبدال) کە لەسەرەتای سەدەی شازدەدا میری بابان بووە، دەڵێ: ((کە میر بۆداق کەوتە سەر حوکمداری بەجارێک ناوی حوکمداری خۆی گۆڕی لە هەموو جێگایەکدا بە بابان ناوبانگی پەیداکرد... دامەزرێنەری ئەو ناوە میر بۆداقە ئەگەرچی لەپاش ئەو تەیمورخان پاشا دەکۆشا ناوی بابان لەسەر خاکی یەکێک لە ئەولادەکانی دانێ و بە بابان ناوبانگیان پێ بکا)). دواتر (موکریانی) درێژەی دەداتێ و دەڵێ: میر

بۆداق ((لەگۆڕینی ئەم نێوەدا دڵخوازی ئەوەبوو لە مام و خزمەکانی ڕزگار بیبت...لەبەرئەوە... دەیگوت کە بابا ئەردەڵانی باپیرە گەورەیان ناوی باباقوباد بووە، مادامە لەو بنەچەکەین دەبێ بابان یاخود بابا قوبادیمان ناوببرێ، بابا قوباد لەگوتندا درێژە بابان بەتەنها چاکترە)).[١٠٢] بێگومان دیارە ئەم دوو گوتەیەی پێشوو تێک ناکەنەوە، هەروەها لەگەڵ ڕاستی مێژووییشدا نایەنەوە، چونکە وەک لەلاپەڕەکانی بەرایی ئەم توێژینەوەیەدا بۆمان بەدیار کەوت، بەر لەم ڕووداوانە کە ئەو باسیان دەکات ناوی بابان هەبووە.

سەرەڕای ئەمەش (جەمال بابان) باوەڕ بەم بۆچوونەی (موکریانی) دەهێنێ و دەیکاتە پاڵپشتێک بۆ بۆچوونێکی خۆی. کاتێ دەڵێ وشەی بابان لەبنەڕەتدا لەوشەی (باب - بابا - بابە) هاتووە کە واتا (باوک)، ئەمیش نازناوێکی ڕێزلێنانە بۆ گەورەی کۆمەڵێک. وەک (بابا سلێمان) و (بابا عەلی) و (بابا تاهیر) و هیتر. بەڵام بەتێپەڕبوونی کات گۆڕاوە بۆ (بابان) یان (بەبە). ئەمە لەکاتێکدایە کە ناوبراو بۆچوونێکی وا ڕەت دەکاتەوە کە ناوەکە لەوشەی (بەبە - واتە منداڵی ساوا) هاتبێ.[١٠٣] مێژوونووسێکی عیراقیش بۆچوونێکی هاوشێوەی ئەمە دەخاتە ڕوو، کاتێ ئاماژە بەوە دەکا وشەی (بابا) کە دەکاتە شێخ یان باوک وەکو نازناوێک بەسەرۆکی ئەو بنەماڵانە دراوە کە سەرکردایەتی هاوپەیمانێتی هۆزەکانی ناوچەکەیان کردووە، دواتریش بنەماڵەکانیان بەم ناوە ناسران.[١٠٤] (ڕۆژبەیانی)ش دەڵێ (بابان) لە وشەی (بابا) یان (باوە) هاتووە کە نازناوی چەندین لە پیاوچاکانی کاکەییە[١٠٥]وەک (بابا تاهیری عوریان) و (باوەشاسوار) و (بابا یادگار). ناوبراو مەبەستی ئەوەیە بڵێ ئەم نازناوە لە (بابا ئەردەڵان)ەوە بۆ بابانییەکان گوازراوەتەوە.[١٠٦] دیارە ئەم بۆچوونە (تۆفیق وەهبی) هانداوە بۆ ئەوەی گوتارێک بنووسێ و تیایدا وشەی (بەبە) بگێڕێتەوە بۆ (باوە) و ئنجا بەپشت بەستن بەمە بڵێ میرەکانی بابان لەبنەڕەتدا لەپیاوچاکانی کاکەیی بوون.[١٠٧] بەڵام ئەم بۆچوونانە لە مەزەندە و لێکدانەوەی تیۆری زیاترنین و هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی یان لۆجیکی لەئارادان نییە بۆ سەلماندنیان. دەبێ ئەوەش بزانین کە لەگەڵ ناوی هەندێ کەسی ئاساییش پێشگری (بابە) هەیە.

بۆ ئەوەی لە ڕەگ و ڕیشەی ناوی (بابان) بکۆڵینەوە دەبێ چەند پێمان دەکرێ بگەڕێینە دواوە، بەڵام سەرەتا با لەڕووی زاراوەوە سەیری وشەکە بکەین: پێشتر ئاماژەمان بەوە دا کە لە سەرچاوەکانی سەدەی پازدەدا نازناوی (بەبانی-الببانی) بۆ کەسێک بەکارهاتووە. بێگومان دیارە پاشگری (ان) بۆ ناوی (کۆ) بەکاردێ

لەزمـانی کـوردیدا، کـەواتە وشـەکـە لەبنەڕەتدا (بەبە) یە. بۆیە لە سـەرچاوەو بەڵگەنامەکانی سەدەکانی شازدە و حەڤدە و هەروەها دواتریش، ناوەکە زۆرجار هەر بەشێوەی (بەبە) نووسراوە.[١٠٨] تەنانەت (مەحمود پاشا)ی میری بابانیش لەساڵی ١٨٢٠دا بە (ریچ) ی گوتووە کە وشەی (بەبە) نازناوی بنەماڵەکەیانە.[١٠٩] ڕاستە لەسەردەمی ئێستا وشەی (بەبە) بۆ منداڵی ساوا بەکاردێ، بەڵام مەرج نییە لەو ماوەیەی ئێمە باسی دەکەین وشەکە ئەم واتایەی بەخشیبێ، یان بەم شێوەیە بەکارهاتبێ. چونکە گومان لەوەدا نیە کە بەکارهێنانی وشەو زاراوەکان تەنانەت لەناو یەک زمانیشدا لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر دەگۆڕێ. کەواتە ناتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین وشەی (بەبە) لە چییەوە هاتووەو لەڕووی زاراوەوە چی دەگەیەنێ.

بەڵام لەڕووی واتاوە لێکدانەوەی ناوەکە ئاسانترە، چونکە سەرچاوەکان هەندێ زانیاریمان لەم بارەیەوە دەدەنێ: پێشتر گوتمان (ابن تغری بردی) سەبارەت بەزاراوەی (البباني) جارێک دەڵێ: ((تائیفەیەکە لەکوردان)) و جارێکی تریش وای بۆ دەچێ کە ((هۆزێکی کوردان)) بێ.[١١٠] کەواتە زاراوەکە لەسەدەی پازدەدا وەکو ناوی گروپێکی مرۆیی بەکارهاتووە، چونکە کەسانێک نازناوی (البباني)یان هەبووە کەسەر بەو گروپە بوون. بەڵام ئەم گروپە مەرج نییە هۆز یان خێڵ بێت وەک هەندێ لە نووسەران وایان وەرگرتووە.[١١١] چونکە (ابن تغری بردی) وەکو ئەگەر ئاماژە بەوە دەکا کە (هۆزێک بێ لەکوردان). بەڵام بێ ئەگەر دەڵێ تائیفەیەکن (واتە کۆمەڵێکن) لەکوردان. بۆیە دەتوانین بڵێین (بەبان) یان (بابان) لەبنەڕەتدا ناوی بنەماڵەیەکی دەسەڵاتداری ناوچەکە بوو نەک هۆزێک. ئەوەتا (شەرەفخان)یش هیچ ئاماژەیەک بەوە ناکا کە بابانەکان هۆز یان عەشیرەت بن، بەڵکو پێیان دەڵێ: ((دەسەڵاتدارانی بابان)). لەکاتێکدا سەبارەت بە هەندێ میرنشینی کوردی تر بەڕوونی دەڵێ کە هۆزن. وەک میرنشینی (دونبولی) و (کەلهوڕ).[١١٢] هەروەها سەبارەت بە دەسەڵاتدارانی بابان دەڵێ: ((بە فرەیی هۆز و عەشایر)) ناسراون.[١١٣] واتە ئەوان بەسەر ئەم ژمارە زۆرەی هۆزانەدا حوکمیان کردووە نەک خۆیان هۆزێک بن لەم هۆزانە. لە شوێنێکی تریش دەڵێ ((هۆزەکانی ناوچەی بابان)) و ناڵێ هۆزەکانی یان هۆزی بابان.[١١٤] کاتێ ناوبراو باسی (پیر بۆداق) یش دەکا نازناوی (بەبەیی- ببئي) بۆ دادەنێ و دەڵێ واتای ئەم نازناوە زاراوەی (بابان) دەردەبڕێ.[١١٥] واتە میری ناوبراو وەک کەسێکی بنەماڵەکەی نازناوی (بەبە)ی هەڵگرتووە. لەڕاستیدا بابانییەکانیش هەر خۆیان بە بنەماڵە داناوە،

ئەوەتا (مەحمود پاشای بابان) لەساڵی ١٨٢٠دا بۆ (ریچ) دەدرکێنێ کە ((وشەی (بەبە) نازناوی بنەماڵەکەیانە)).[١١٦] هەروەها (حەمدی بەگی بابان) یش دەڵێ: ((بابان ناوی بنەماڵەیەکی کوردییە... بابان واتا بنەماڵەی بابا)).[١١٧] نموونەی تری لەم جۆرەشمان هەیە لەمێژووی کوردستاندا، وەک (دزەیی) کە تەنیا بنەماڵەیەکی دەرەبەگ و خاوەن زەویوزار بوون لەدەشتی هەولێر، کەچی لە هەندێ سەرچاوەدا وەکو هۆز یان عەشیرەت ناویان تۆمارکراوە.[١١٨]

کەواتە (بابان) لە بنەڕەتدا ناوی بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار بوو، بۆیە ئەم قەوارە سیاسییەی کە بنیادیان نابوو هەر بەم ناوە ناسرا. دواتریش وشەی (بابان) ڕەهەندێکی سیاسی و هەروەها جوگرافیشی وەرگرت. بەجۆرێک دوای نەمانی بنەماڵەی دەسەڵاتداری رەسەنیش لە حوکمڕانیدا ناوی میرنشینەکە هەر بە (بابان) مایەوە، تەنانەت بوو بەناونیشانێک بۆ ناوچەی دەسەڵاتی میرنشینەکەش. ئەوەتا لە (شەرەفنامە)دا چەندین جار دەستەواژەی ((ناوچەی بابان)) و ((ولاتی بابان)) دووبارە دەبێتەوە.[١١٩] هەروەها لەسەرچاوەی تریشدا ئاماژەی لەم جۆرە دەبینین.[١٢٠] هەروەها (بابان - یان/ بەبە) بوو بەناوی یەکەیەکی کارگێڕی کاتێک میرنشینەکە خرایە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی عوسمانی و بوو بە سەنجەقێکی سەربە ئیالەتی شارەزوور، وەک پێشتر بینیمان.

دیارە زاراوەی (بابان) وەکو ناوێک بۆ ناوچەکە ئەوەندە ڕیشەداکوتراو بوو کە تەنانەت دوای هەڵوەشانەوەی میرنشینەکە و تێپەڕبوونی نزیکەی نیو سەدە هێشتا لەبیر نەکرابوو. بۆیە کاتێ (فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە) لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەدا قەوارەیەکی سیاسی لەناوچەکە دامەزراند، ئەم قەوارەیە هەربە بابان ناسرا.[١٢١] تەنانەت خەڵکی ناوچەکەش هەر بەم ناوە دەناسرێن، ئەوەتا لە بەڵگەنامە عوسمانییەکان و سەرچاوەکانی ئەم سەردەمە زۆر جار دەستەواژەی ((کوردانی بەبە)) یان ((یاخی بووانی بەبە))مان بەرچاو دەکەوێ.[١٢٢] هەندێ لەنووسەران ئاماژە بەوە دەکەن کە نازناوی (بەبە) یان (بابان) بەسەر (فەقێ ئەحمەد)یشەوە بڕاوە.[١٢٣] بەڵام لەهیچ سەرچاوەیەک نازناوی (بەبە) لەگەڵ ناوی (فەقێ ئەحمەد) نابینین. لەڕاستیدا (میر سلێمان)ی سێیەم میری ئەم بنەماڵەیە بووکە بۆ یەکەم جار لەنێو میرانی ئەم بنەماڵەیە نازناوی (بەبە)ی بەناوەکەوە لکا.[١٢٤] سەرەڕای ئەوەش گومان لەوەدا نییە کە هەر لەسەردەمی (فەقێ ئەحمەد)ەوە بنەماڵەکەی بەناوی (بابان)ەوە ناسراوە.[١٢٥] پێدەچێ ئەم ناوەشیان هەر لەناوی ناوچەکە یان میرنشینەکە بۆ هاتبێ.

**ڕچەڵەکی بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی بابان:**

دیارە کە یەک بنەماڵەی دەسەڵاتدار حوکمڕانی میرنشینی بابانی نەکردووە، بەڵکو بەدرێژایی مێژووی ئەم میرنشینە پێنج بنەماڵە پەیدابوون، کە چواریان یەک لەدوای یەک و ئەوی پێنجەمیشیان دوای ماوەیەک خامۆشی، دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست. کەواتە نابێ چاوەڕێی ئەوە بکەین کە ڕچەڵەکی هەر پێنج بنەماڵە بچێتەوە سەر یەک بنەڕەت.

ئەگەر لەبنەماڵەی یەکەم میری ناسراوی بابانییەوە دەست پێبکەین کە (پیر بۆداقی کوڕی میر ئەبدال)ە، دەبێ سەرەتا ئەوە بڵێین کە هەرچەندە ئەمانە بە یەکەم بنەماڵەی دەسەڵاتداری بابانی دادەنرێن، بەڵام مەرج نییە یەکەم بن. چونکە ئێمە پێشتر سەلماندمان کە میرنشینەکە بەلایەنی کەم لەسەدەی پازدەدا هەبوونی هەبووە، ئیتر دڵنیا نین لەوەی کە ئایا پێش ئەم بنەماڵەیە بنەماڵەی تر حوکمڕانییان کردووە یان نا. بەڵام لەبەرئەوەی هەواڵمان لەهیچ بنەماڵەیەکی تر نییە بەر لەبنەماڵەی (پیر بۆداق)، کە (شەرەفخان) بە ((بنەماڵەیەکی دەسەڵاتداری دێرین)) یان دادەنێ،(١٢٦) بۆیە ناچارین ئەمان بە یەکەم بنەماڵەی دەسەڵاتداری بابان لەقەڵەم بدەین.

بێگومان ئەگەر لە تواناماندا نەبێ سەرەتای دەست بەکاربوونی ئەم بنەماڵەیە دیاری بکەین، ئەوا پەیداکردنی زانیاری لەسەر ڕچەڵەکی ئەم بنەماڵەیەش کارێکی زۆر گرانە ئەگەر ئەستەم نەبێ. چونکە سەرچاوەیەکی ئەوتۆمان لەبەردەستدا نییە کە زانیاریمان لەم بارەیەوە بداتێ، بێجگە لە هەندێ بۆچوونی نووسەران، کە ئەوانیش ناچنە قالبی ڕاستی مێژووییەوە. (موکریانی) کە خاوەنی یەکێ لەم بۆچوونانەیە دەڵێ: ڕچەڵەکی میرانی بابان و ئەردەڵان هاوبەشە و هەردوولا دەگەڕێنەوە سەر (بابە ئەردەڵان).(١٢٧) هەروەها (ڕۆژبەیانی)ی وەرگێڕی (شەرەفنامە)ش پاڵپشتی بۆچوونێکی وادەکات.(١٢٨) بەڵام لەڕاستیدا هیچ سەرچاوەیەک لەئارادا نییە بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە، هەروەها گوتەکانی (موکریانی) خۆیان یەکتر ڕەت دەکەنەوە وەک پێشتر بینیمان.

بەپێی بۆچوونێکی تر دەبێ بابانەکان لە بنەڕەتدا لەپیاوچاکانی کاکەیی بن.(١٢٩) مێژوونووسێکی تر باس لەوە دەکات کە لەسەدەی پازدەی زایینی تیرەیەکی هۆزی گەورەی (گۆران) هەبوو بەناوی (بابونی)، ئنجا لەسەر بنەمای لێکچوونی وشەکان ئەگەری ئەوە دەخاتەڕوو کە ئەمانە لەگەڵ (بابانی) پەیوەندیدار بن.(١٣٠) لەڕاستیدا ئەم بۆچوونانەی دواییش پێویستیان بە بەڵگە و سەلماندن هەیە. بەڵام دەکرێ

بۆچوونێکی لەم جۆرە پەسند بکەین کە بنەماڵەی دەسەلاتداری بابان لەبنەڕەتدا خاوەن پێگەیەکی ئایینی بوونە. ئەویش نەک لەسەر ئەو بنەمایەی کە (جەمال بابان) ئاماژەی پێدەکات گوایا نازناوی (بابان) لە ووشەی (بابا- یان/ بابە) هاتووە کە لەنێو کورددا بۆ کەسایەتییە ئایینییە ڕێزدارەکان بەکاردەهات،[131] بەڵکو بە پشت بەستن بەوەی کە (میر بۆداقی کوڕی میر ئەبدال) پێی گوتراوە (پیر بۆداق)،[132] دیارە وشەی (پیر)یش لەزمانی کوردیدا لەجیاتی (شیخ)ی عەرەبی بۆ کەسایەتییە ئایینییەکان بەکاردێ.[133] هەروەها میری ناوبراو لەجیاتی پێشگری (بابا) لەدواوەی ناوەکەی نازناوی (بەبەیی) هەبوو.[134] ئەم پێگەیە ئایینییە کە بێگومان ڕەهەندی کۆمەلایەتیشی هەبووە، دیارە یارمەتیدەر بووە بۆ ئەم بنەماڵەیە بۆ دەستڕۆیشتن و پیادەکردنی دەسەلاتێکی ناوچەیی کە دواتر بەرەبەرە فراوان بووە و ڕەهەندێکی سیاسی وەرگرتووە، بەتایبەتی کە (پیر بۆداق) ئەو فراوانخوازییانەی کردووە کە پێشتر باسمان کرد.

ئەوەی ئەم بۆچوونە بەهێز دەکا ئەوەیە کە دەبینین دوای بڕانەوەی ئەم بنەماڵەیە، لە بارودۆخێکی هاوشێوەدا بنەماڵەی دەسەلاتداری دووەم پەیدا دەبێ. ئەوە بوو کاتێ میرنشینەکە دوای مردنی (میر بۆداقی کوڕی ڕۆستەم) بەرەو پەرتەوازە بوون چوو، (پیر نەزەری کوڕی بەهرام) بەدیار کەوت و بابانی لەژێر دەسەلاتی خۆیدا یەکخستەوە، وەک پێشتر بینیمان. ڕاستە ئەم کەسایەتییە یەکێک لەگەورە فەرمانبەرانی میرنشینەکە بوو، یان وەک (محەمەد ئەمین زەکی) دەڵێ لە گەورە پیاوانی (پیر بۆداق) بوو.[135] بەلام نازناوی (پیر) کە پێشگری ناوەکەیتی بەڵگەی ئەوەیە کە ئەویش پێگەیەکی ئایینی هەبووە، دیارە هەر ئەمەش یارمەتی داوە بۆ گەیشتن بەدەسەلات و ئنجا ئاکارە جوانەکانی کە (شەرەفخان) باسیان دەکات ( بەتایبەتی دادپەروەری و ئازایەتی و دەستکراوەیی) وایان کردووە ملکەچی دانیشتوان و لەشکر مسۆگەر بکا.[136] لەکاتێکدا پێشتر (بۆداقی کوڕی ڕۆستەم) کە هەرچەندە لە بنەماڵەی ڕەسەنی بابانیش بوو، بەلام ئەو کەسایەتییە بەهێزەی نەبوو کە بتوانێ هەژموونی خۆی بەسەر سەرۆک هۆز و سەردارە نێوچەییەکاندا بسەپێنێ، وەک لەپێشوودا بینیمان.

هەلومەرجی پەیدابوونی هەردوو بنەماڵەی سێیەم و چوارەم جیاواز بوو. هەرچەندە ڕچەڵەکی ئەم دوو بنەماڵەیە ناناسرێ، بەلام گومان لەوە دانیە کە خاوەن پێگەیەکی ناوچەیی و لەنزیکانی بنەماڵەی دەسەلاتداری بابان بوون. چونکە هەریەکە لە (میر سلێمان)[137] و (میر ئیبراهیم) کە بناغەی ئەم دوو بنەماڵەیان

داناوه، لەبنەڕەتدا بەڕێوەبەرایەتی دەڤەرێکی میرنشینی بابانیان لەدەستدا بوو. دوای مردنی (پیر نەزەر)یش ئەم بارودۆخەیان قۆستەوەو هەریەکەیان خۆی کرد بە میر لەسەر بەشێکی میرنشینەکە. (شەرەفخان) ئاماژە بەوە دەکا کە (میر ئیبراهیم) و باوکی لەژێر سایەی (پیر بۆداق)دا گەورە بوون و پێگەیشتن، هەر لەسەردەمی ئەویشدا هەریەکەیان کرایە سەرداری دەڤەرێکی بابان.[١٣٨]

بەڵام ڕەگ و ڕیشەی بنەماڵەی پێنجەم ئاڵۆزترە و زیاتر جێگەی کێشەیە، لەبەرئەوەی ئەم بنەماڵەیە لەپێشدەر لە((بنەڕەتێکی نادیار)) پەیدابوون، بەپێی دەربڕینی (ئینسایکلۆپیدیای ئیسلام).[١٣٩] هەروەها ئەم بنەماڵەیە زۆرتر ناسراون و نووسەران و مێژوونووسان چەندین بۆچوونی جیاوازیان لەبارەیەوە خستۆتە ڕوو.

هەندێ لە مێژوونووسان باوەڕیان وایە کە جۆرێک لە پەیوەندی ڕچەڵەک لەنێوان (فەقێ ئەحمەد)ی دامەزرێنەری بنەماڵەی پێنجەم و بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی پێشووی بابان لەئارادایە، وەک (موکریانی) کە بەدڵنیاییەوە دەڵێ ناوبراو لەوەچەی بنەماڵەی یەکەمە.[١٤٠] یان (ئەمین زەکی) کە پێی وایە (فەقێ ئەحمەد) کوڕی یان کوڕەزای (خدر بەگ)ی دوا میری بنەماڵەی چوارەم، یان (بۆداق بەگ)ی کوڕی (ئەمیر بەگی موکری)یە کە ماوەیەک دەسەڵاتی بابانی پێ سپێردرابوو.[١٤١]

ئەمە لەکاتێکدایە کە میرانی دوایی بابان بانگەشەی هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان نەکردووە لەنێوان بنەماڵەکەیان و چواربنەماڵە دەسەڵاتدارەکەی پێشوو، تەنانەت زانیاریشیان نەبوو لەبارەی هەبوونی ئەم بنەماڵانەی دوایی و مێژووی بنەماڵەی خۆشیان بەباشی نەدەزانی، وەک لە ئاخاوتنی نێوان (ریچ) و (مەحمود پاشا)ی میری باباندا دەردەکەوێ.[١٤٢] لە ڕاستیشدا هیچ بەڵگە و سەرچاوەیەک بەدەستەوە نییە کە ئەم پەیوەندییەی نێوان بنەماڵەی پێنجەم و بنەماڵەکانی پێشتر بسەلمێنێ.

هەندێ لە سەرچاوەکان سەبارەت بەم بابەتە بۆچوونی سەیر دەخەنە ڕوو، وەک گەڕیدەی ئەڵمانی (نیبوور) کە لەساڵی ١٧٦٦زدا هاتۆتە ناوچەکە و لە باسی (قەڵاچوالان) دا دەڵێ: ((فراوانترین ناوچەیە لەوڵاتی کوردستانی ژێردەسەڵاتی سوڵتان، وە لەلایەن بنەماڵەی سۆران حوکم دەکرێ کە تیرەیەکە لە هۆزی بوبە)).[١٤٣]بێگومان دیارە ئەمەش زانیارییەک بووە کە ناوبراو تێکەڵی کردووە و بە هەڵە تۆماری کردووە. چونکە بنەماڵەی سۆران بەهیچ شێوەیەک بەشێک نەبوون لە بابان.

هەندێ مێژوونووسی عەرەب پێشگری (فەقێ) لەناوی (فەقێ ئەحمەد) سەرنجیان ڕادەکێشێ و ئەمە دەکەنە بەڵگە بۆ ئەوەی بڵێن کە میری ناوبراو لە

بنەڕەتدا خاوەن پێگەو دەسەڵاتێکی ئایینی بووە. هەر ئەمەش یارمەتی داوە بۆ دامەزراندنەوەی میرنشینی بابان. ئەوانە وشەی (فەقێ) بە واتا عەرەبییەکەی (الفقیە) وەردەگرن کە دەکاتە زانای ئایینی پایە بەرز و شارەزا لە شەریعەت.[١٤٤] بەڵام لەکوردیدا وشەکە بۆ کەسێک بەکاردێ کە قوتابی خوێندنی ئایینییە و هێشتا نەبۆتە مامۆستای ئایینی.[١٤٥] هەندێ جاریش بەکەسێک دەگوترا کە تەنیا بڕێک خوێندەواری هەبوو یان بەجۆرێک پابەندی بەجێگەیاندنی پەرستشەکان بوو کە لە خەڵکی ئاسایی زیاتر بوو.

بەپێی بۆچوونێکی تر (فەقێ ئەحمەد) خانەدانێکی دەرەبەگ بووە لە پشدەر،[١٤٦] یان سەرۆک هۆزێک بووە لەم ناوچەیە.[١٤٧] لەڕاستیدا ئەم بۆچوونە لەهەمووان زیاتر لەڕاستی نزیکترەو هەندێ مێژوونووسی تریش پەسندی دەکەن.[١٤٨]چونکە پێشتر زانیمان کە میرنشینی بابان لەکۆتاییەکانی سەدەی شازدە هەڵوەشایەوە و سەرۆک هۆز و سەرداره ناوچەییەکانی نێو قەڵەمڕەوی میرنشینەکە هەریەکە لەناوچەی خۆی دەسەڵرت و پێگەی بەرقەرار کرد. کەواتە زۆر ڕێی تێدەچێ کە بنەماڵەی (فەقێ ئەحمەد)یش لە یەکێک لەم سەرۆک هۆز و سەرداره نێوبراوانە داکەوتبێ. بەتایبەتی کە یەکێک لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکا کە باپیرانی (فەقێ ئەحمەد) لەدەست و پێوەند و نۆکەرانی دەسەڵاتدارانی پێشووی بابان بوون.[١٤٩] هەروەها لە یەکێک لەو ڕیوایەتانەی لەناوچەی پشدەردا باو بوو، بۆمان بەدیار دەکەوێ کە باوک و مامی (فەقێ ئەحمەد) هەریەکەیان لە دەڤەرێکی پشدەردا دەسەڵاتدار و خاوەن موڵک بوون.[١٥٠] بێجگە لەمە گوتەکانی (مەحمود پاشا)ی میری بابانیش پاڵپشتی ئەم بۆچوونە دەکەن. ئەوەتا ناوبراو لەبارەی ڕچەڵەکی بنەماڵەکەی بە (ریچ)ی ڕاگەیاندکە ئەو: ((نەوەی بنەماڵەیەکی ڕەسەنە و لە هۆزێکی بەخشندەیە...ناوی هۆزەکەی لە نەژاددا (کرمانج)ە، بەڵام وشەی بەبە نازناوی بنەماڵەکەیانە و ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە سەرداری پشتاوپشتی ئەو خێڵەن...هۆزەکەش لە بنەچەدا لە (پشدەر)، لە شاخەکانی باکووری نزیک (سی کەنە)ی سەر سنووری ئێران دروستبووە)).[١٥١] هەروەها (ریچ) ئەم زانیارییەی دەست کەوتووە کە (دارەشمانە) مەڵبەندی بنەڕەتی بابانەکان بووەو تەنانەت بەپێی گوتەی ئەو ((دانیشتووانی ئێستای گوندەکە [ساڵی ١٨٢٠] هەموویان لەو بنەماڵەیەن، یان بەواتایەکی تر خانەوادەی بابانی لەوانن و، شانازیشی پێوە دەکەن)).[١٥٢] بێگومان دیارە (دارەشمانە)ش و هەموو پشدەریش یەکێک بووە لە ناوچە بنەڕەتییەکانی بابان پێش پووکانەوەی بنەماڵەی چوارەم و هەڵوەشانەوەی

میرنشینەکە.

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەک جێگەی گفتوگۆیە ئەویش ناوی ئەو هۆزەیە کە (مەحمود پاشای بابان) باسی دەکات، چونکە وەک زانراوە (کرمانج) ناوی هۆز نییە، بەڵکو یەکێکە لە چوار لقە گەورەکەی نەتەوەی کورد.(١٥٣) بۆیە دەکرێ بڵێین میری ناوبراو مەبەستی ئەوەبوو کە ئەوان لە نەژادی (کرمانج)ن. دیارە لەڕووی هۆزایەتیشەوە سەربەهۆزەکانی پشدەر بوون،(١٥٤) و دەکرێ بڵێین لە خێڵی (نورەددینی) بوون کە یەکێ بوو لە تیرەکانی ئەم هۆزانە.(١٥٥)

## دەرەنجام

بەپێی ئاماژەی سەرچاوەیەک میرنشینێک بەناوی (بابان) لە سەدەی چواردەی زایینی هەبووە، بەڵام ناتوانین لەم زانیارییە دڵنیا بین. چونکە ئەو بەڵگە و سەرچاوانەی لەبەر دەستدان تەنیا ئەوە دەسەلمێنن کە ئەم میرنشینە لەسەدەی پازدە لەئارادا بووە. بەڵام دیارە کاریگەری ئەوتۆی بەسەر ڕووداوەکانی ناوچەکەوە نەبووە. تەنانەت لە سەرەتای سەدەی دواتریشدا (بابان) تەنیا میرنشینێکی بچووک بووە لە ناوچەی پشدەر. بەڵام هەر لەم ماوەیەدا بەهۆی هەوڵەکانی (پیر بۆداقی کوڕی میر ئەبدال) سنووری فراوان بووە بەجۆرێک لە ڕۆژهەڵاتدا (شنۆ) و (لاهیجان) ی گرتۆتەوەو هۆزەکانی (موکریان) و (بانە)ش ملکەچی بووە. لە باشووریشدا (شاربازێڕ) و (کەرکوک) و هەندێ ناوچەی سۆرانی لەگەڵدا بووە. لەم سەردەمەدا بابان کێشی سیاسی خۆی هەبووە و سەربەخۆیی خۆشی پاراستووە.

دوای ڕانەوەی بنەماڵەی دەسەڵاتداری یەکەم (پیر نەزەری کوڕی بەهرام) بابانی لە هەڵوەشانەوە ڕزگار کرد و تەنانەت پەرەی بەدەسەڵاتی میرنشینەکەش دا. بەڵام لە سەردەمی بنەماڵەی سێیەم و چوارەم (بابان) یەکێتی خۆی لەدەست دا و دووچاری شەرو ململانێی ناوەخۆیی بوو. ئەمەش ڕێخۆشکەر بوو بۆ دەستکاری دەرەکی لە کاروباری میرنشینەکە و لە ئەنجامدا هێز و توانای بابان لە کورژبوونەوەدا بوو. هەر لەم سەردەمەدا میری بابان لە بەرامبەر فشاری سەفەوی پەیوەندی پاشکۆیەتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی دامەزراند. بەڵام دەسەڵاتدارانی عوسمانی ئاگری دووبەرەکییان لەنێوان میرانی بابان خۆشتر کرد. ئاکامەکەی ئەوەبوو کە لەناوەڕاستی سەدەی شازدەدا بەشێکی میرنشینەکە خرایە ژێر کارگێڕی ڕاستەوخۆی عوسمانی، بەناوی لیوا (سەنجەق)ی بابان. بەڵام بەهۆی هەڵوێستی نەیاری دانیشتووان، پیادەکردنی دەسەڵاتی عوسمانی لە ناوچەکە ئاستەنگی زۆری هاتە

ڕێ. بەشەکەی تریش کە دەڤەری (مەرگە)ی دەگرتەوە، لەژێر حوکمڕانی دواهەمین میری بابانی (خدر بەگی کوڕی میر حوسێن)دا مایەوە. ئەگەرچی دەسەڵاتی ئەم میرە درێژەپێدەری میرنشینی بابان بوو، بەڵام لەڕووی فەرمییەوە ناوی (سەنجەقی مەرگە)ی لێ نرابوو. دواتریش لەکۆتاییەکانی سەدەی شازدەدا میرنشینەکە لەبارێک هەڵوەشایەوە. بەڵام لەناوەڕاستی سەدەی دواتر (فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە) قەوارەیەکی سیاسی خۆجێیی بەهەمان ناونیشان لە پشدەر دامەزراندەوە.

زاراوەی (بابان) لە بنەڕەتدا لەوشەی (بەبە)وە هاتووە کە لەگەڵ پاشگری (ان) بووەتە (بابان) بۆ ئەوەی گوزارشت لەناوی بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار بکات. کە دواتر گۆڕاوە بۆ ناوی قەوارەیەکی سیاسی ئنجا ناوی ناوچەکە و هەروەها بووەتە ناونیشانێکیش بۆ خەڵکی ناوچەکە. ئەم بنەماڵەیە سەرەتا پێگەیەکی ئاینی - کۆمەڵاتییان هەبووە کە یارمەتیدەر بووە بۆ دەستڕۆیشتن و پیادەکردنی دەسەڵات. بنەماڵەی دەسەڵاتداری دووەمیش پێگەیەکی هاوشێوەی هەبوو، بەڵام بنەماڵەی سێیەم و چوارەم تەنیا سەرداری ناوچەیی بوون و لە بنەڕەتدا لە نۆکەرانی بنەماڵەی ڕەسەنی بابان بوون. (فەقێ ئەحمەد)ی دامەزرێنەری بنەماڵەی پێنجەمیش بەرچەڵەک دەگەڕێتەوە سەر یەکێ لەو سەرۆک هۆز و سەردارە نێوچەییانەی کە دوای هەڵوەشانەوەی قەوارەی بابان دەسەڵاتی خۆیان لە دەڤەرێکی بابان بەرقەرار کرد. ئەم دەڤەرەی کە بنەماڵەی ناوبراوی تێدا بەدیارکەوت ناوەندەکەی گوندی (دارەشمانە) بوو.

**پەراوێزەکان**

(١) جمال بابان، بابان في التأريخ ومشاهير البابانيين، بغداد ١٩٩٣، ص ١٢ - ١٣.

(٢) عبدربه ابراهيم الوائلي، تاريخ الامارة البابانية/١٧٨٤ - ١٨٥١، ط١، دار الزمان، دمشق - سوريا ٢٠٠٨، ص ٩٠.

(٣) بڕوانە: عباس العزاوي، عشائر العراق، ج٢ الكردية، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٤٧، ص ٩٩.

(٤) لەبارەی سەردەمی ئەم میرە بڕوانە: شرفخان البدليسي، شرفنامه، ت: محمد جميل الملا أحمد الروژبياني، ط٢، مؤسسة موكرياني، اربيل ٢٠٠١، ص ٤٧٤.

(٥) حسێن حزنی موکریانی، ئاوڕێکی پاشەوە، ب١(حوکمدارانی بنەماڵەی ئەردەڵان و بابان لە شارەزووردا)، ڕەواندوز ١٩٣١، ل ٣٠.

(٦) لەم بارەیەوە بڕوانە: د. زرار صديق توفيق، كردستان في القرن الثامن الهجري/ دراسة في

تأريخها السياسي والاقتصادي، مؤسسة موكرياني، اربيل ٢٠٠١، ص ١٤٠ – ١٤٣.

(٧) لەسەرچاوەی ناوبراودا بۆ مێژووی قەباڵەی فرۆشتنەکە ڕۆژی پێنج شەممەی پێنجی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٦٧٥ک نووسراوە (بڕوانە: چمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان/ چەند لاپەڕەیەکە لەکتێبی (نور الانوار)ی (سید عبدالصمدی توداری) کە لە ١٠٩٩ی هیجرەتدا نووسیویە، محمد مەلا کەریم وەریگێڕاوەتە سەر کوردی، چاپخانەی (سلمان الاعظمی)، بەغدا ١٩٧٠، ل ١٤ – ١٥) بەڵام دەبێ (ناسخ)ی دەستنووسەکە لە ساڵەکە هەڵەی کردبێ و ساڵە ڕاستەکە ٧٧٥ک بێ، چونکە پێنجی ڕەبیعی یەکەمی ٧٧٥ک دەکەوێتە ڕۆژی پێنج شەممە، لەکاتێکدا پێنجی ڕەبیعی یەکەمی ٦٧٥ک لەجیاتی پێنج شەممە ڕێکەوتی دووشەممە دەکا. ( زرار صديق، كردستان في القرن الثامن، ص٢٨٤) هەروەها لە خودی دەستنووسەکەشدا ئاماژە بەوە کراوە کە (شێخ زەکەریا)ی کڕیاری زەویوزارەکە لە ساڵی ٧٧٥ک مردووە (چمکێکی مێژووی هەورامان، ل٢١) بێگومان ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ساڵی ٦٧٥ک هەڵەیە، چونکە ئاساییی نییە کە کەسێک دوای ئەوەی تەمەنێک ژیابێ و توانای کڕینی زەویوزاری هەبووبێ دواتر (١٠٠) ساڵی تر ژیابێ.

(٨) چمکێکی مێژووی هەورامان، ل ١٤ – ١٦، ٤٣.

(٩) هەمان سەرچاوە، ل ٨، ١٤، ٤٣.

(١٠) وەک دەوڵەتەکانی : ئیلخانی و جەلایری و تەیموری و قەرەقۆینلۆ و ئاق قۆینلۆ. لەبارەی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە و ناوی هەندێ لە قەوارەو میرنشینە کوردییەکان بڕوانە: عماد احمد الجواهري، صراع القوي السياسية في المشرق العربي (من الغزو المغولي حتى الحكم العثماني)، مطابع التعليم العالي، جامعة القادسية ١٩٩٠. هەروەها: د. زرار صديق، كردستان في القرن الثامن.

(١١) كتاب الحوادث لمؤلف من القرن الثامن الهجري، تحقيق: د. بشار عواد معروف و د. عماد عبدالسلام رؤوف، ط١، دار الغرب الاسلامي، بيروت ١٩٩٧، ص٣٨٥. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم کەسایەتییە بڕوانە هەمان سەرچاوە، ل٣٩٣، ٤٠١، ٤٣٥.

(١٢) د. عماد عبدالسلام رؤوف، الاسر الحاكمة ورجال الادارة والقضاء في العراق في القرون المتأخرة، دار الحكمة للطباعة والنشر، بغداد ١٩٩٢، ص ١٦٢، ١٦٣.

(١٣) نەوشیروان مستەفا ئەمین، میرایەتی بابان لەنێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەمدا، چ٢، سلێمانی ١٩٩٨، ل ٣٥.

(١٤) ڕابیعە فەتاح شێخ محەمەد، کوردستان لە سەدەی پازدەی زایینییدا، چاپکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٥، ل ٣٣٢.

(١٥) د. عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تأريخ الكرد الحديث وحضارتهم، منشورات وزارة الثقافة، اربيل ٢٠٠٨، ص ١٠٢.

(١٦) جمال الدين ابي المحاسن يوسف بن تغري بردي، النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، تحقيق: د. جمال الدين الشيال وفهيم محمد شلتوت،ج١٦، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة ١٩٧٢، ص ٣٢٨ – ٣٢٩. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم پیاوچاکە بابانییە بڕوانە هەمان سەرچاوەو لاپەڕەکان.

(١٧) شمس الدين محمد بن عبدالرحمن السخاوي، الضوء اللامع لأهل القرن التاسع، منشورات مكتبة الحياة، بيروت، (د.ت)، ج٦، ص ٦٤.

(١٨) النجوم الزاهرة، ج ١٦، ص ٣٢٨ - ٣٢٩.
(١٩) بڕوانە: شرفنامە، ص ٤٧٣ - ٤٧٤.
(٢٠) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.
(٢١) هەمان سەرچاوە، ل ٤٧٤.
(٢٢) هەمان سەرچاوە، ل ٤٧٤، د. سعدى عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية/ دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان (١٥١٤ - ١٨٥١)، مؤسسة موكرياني - اربيل، مطبعة خاني، دهوك ٢٠٠٨، ص ٢٩.
(٢٣) هەندێ لە توێژەرانیش ئاماژە بەوە دەکەن کە سەرەتای حوکمڕانی پیر بۆداق لەگوندی (دارەشمانە)ی قەزای پشدەر بووە، (بڕوانە: عبدربە الوائلي، م. س، ص ٩٠، جمال بابان، بابان في التأريخ، ص ٣٢) شایانی باسە ئەمەی دوایی وەکو ئەگەرێکی تر باسی (مەرگە) دەکات کە ئەویش هەر لەپشدەرە. بەڵام لەڕاستیدا ناکرێ ئاماژە بە گوندێکی دیاریکراو بکەین، چونکە بەڵگەی تەواومان بەدەستەوە نییە.
(٢٤) لە (شەرەفنامە)دا نووسراوە (لارجان)، بەڵام دیارە هەر ناوچەی (لاجان = لاهیجان)ە کە دەکەوێتە دەڤەری موکریانی کوردستانی ڕۆژهەڵات. بڕوانە: شرفخان، م. س، ص ٤٧٤.
(٢٥) لە (شەرەفنامە)دا نووسراوە (سیوی)، بەڵام وەرگێڕی شەرەفنامە (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) دەڵێ لەوانەیە ناوچەی (سماقولی) ئێستا یان (شنۆ) ی کوردستانی ڕۆژهەڵات بێ، بڕوانە: هەمان سەرچاوە و لاپەڕە. لەکاتێکدا (موکریانی) و (جمال بابان) هەر بە (شنۆ)ی دادەنێن، بڕوانە: ئاوڕێکی پاشەوە، ل٣٢، بابان في التأريخ، ص٣٢، بەڵام زیاتر پێدەچێ (زێوێ) بێ چونکە ئاوەدانییەکە لە ناوچەکە و هەروەها لە وشەی (سیوی) نزیکترە.
(٢٦) شارۆچکەیەکی دەڤەری موکریانە، دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای مەهاباد.
(٢٧) سەفەوییەکان بنەماڵەیەکی سۆفیگەری بوون، باپیرە گەورەیان (شێخ سەفییەدین ئیسحاقی ئەردەبیلی) یە کە ساڵی ١٣٣٤ز مردووە. لەسەر دەستی (شا ئیسماعیلی سەفەوی١٥٠١ - ١٥٢٤) دەوڵەتێکیان لە ئێران بەناوی خۆیانەوە دامەزراند، کە لەماوەی نێوان (١٥٠١ - ١٧٣٦ز) حوکمڕانی کرد. لەبارەی ئەم دەوڵەتە بڕوانە: ڕاجر سێیڤری، ئێرانی سەردەمی سەفەوی، و: سەلاحەددین ئاشتی، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٦.
(٢٨) بەپێی گوتەی (جمال بابان) شاخێکی سەختە لەنێوان مەهاباد و بۆکان . بڕوانە: بابان فی التأریخ، ص ٣٢.
(٢٩) شرفخان، م. س، ص ٤٧٤.
(٣٠) هەمان سەرچاوە، ل ٤٧٥. هەروەها: عماد عبدالسلام، الاسر الحاكمة، ص ٢٤٨.
(٣١) میرنشینی ئەردەڵان لەم ماوەیەدا بەشێکی گرنگی ناوچەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستانی لەژێر دەست دابوو، بڕوانە: ماهشەرەفخانم مەستوورەی کوردستانی: مێژووی ئەردەڵان، و: د. حسن جاف و شکور مستەفا، چ ١، بەغدا ١٩٨٩، ل ٢٥ - ٢٦، ستيفن همسلي لونكريك، أربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ت: جعفر الخياط، ط ٦، بغداد ١٩٨٥،ص ٦١.
(٣٢) شرفخان، م. س، ص ٤٧٥.
(٣٣) عماد الجواهري، م. س، ص ٥٥ - ٥٧. ئاق قۆینلۆ: هۆزێکی تورکمانی بوون، دەوڵەتێکیان دامەزراند کە لەماوەی نێوان (١٤٦٧ - ١٥٠٨ز) حوکمی ناوچەکەی کرد، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

هەمان سەرچاوە، ل ٣١ و دواتر.

(٣٤) شایانی باسە هەر ئەم نووسەرە (شەهربازار)یش بە (شهرزور) تێدەگا، ئەگەرچی لە شەرەفنامەدا بەڕوونی نووسراوە شەهربازار، بڕوانە: د. سعد بشیر اسکندر، قیام النظام الاماراتي في کردستان وسقوطه/ مابين منتصف القرن العاشر ومنتصف القرن التاسع عشر، ط٢، السليمانية ٢٠٠٨، ص ١٢٥.

(٣٥) لەبارەی وەرگەڕانی ئاراستەی فراوانخوازی عوسمانی بەرەو ڕۆژهەلات و پەیداکردنی دەسەلات لە ناوچەکەدا بڕوانە: سعدی هروتی، کوردستان والامبراطوریه، ص ٣٥ ومابعدها.

(٣٦) شرفنامه، ص ٤٧٥.

(٣٧) بڕوانە: عبدربه الوائلي، م. س، ص ٩١ – ٩٣.

(٣٨) ئاوڕێکی پاشەوە، ل ٣٣ – ٣٨.

(٣٩) شرفخان، م. س، ص ٤٧٥، ٤٧٦.

(٤٠) محمد امين زکي، تاريخ السليمانية وانحائها، ت: الملا جميل الروزبياني، بغداد ١٩٥١، ص ٤٥.

(٤١) ئاوڕێکی پاشەوە، ل ٤٢.

(٤٢) شرفخان، م. س، ص ٤٧٧.

(٤٣) بڕوانە:قيام النظام الاماراتي، ص ١٢٥.

(٤٤) شرفخان، م. س، ص ٤٧٧ – ٤٧٨.

(٤٥) هەمان سەرچاوە، ل ٤٧٧.

(٤٦) هەمان سەرچاوە، ل ٤٧٧ – ٤٧٨، محمد امين زکي، تاريخ السليمانية، ص ٤٦ – ٤٧، حسين حزني موکرياني، س، پ، ل ٤٦.

(٤٧) مذکرات مأمون بک بن بيکه بک، ت: محمد جميل الروژ بيانی وشکور مصطفی، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد ١٩٨٠،ص ٣٣.

(٤٨) حسين حزنی موکريانی، س، پ، ل ٤٦، محمد امين زکي، تاريخ السليمانية، ص ٤٧.

(٤٩) محمد امين زکي، تاريخ السليمانية، ص ٤٧.

(٥٠) نەوشێروان مستەفا، س. پ، ل ٣٧.

(٥١) ئاوڕێکی پاشەوە، ل ٤٧.

(٥٢) شرفنامه، ص ٤٧٨.

(٥٣) مذکرات مأمون بک، ص ٣٤.

(٥٤) شرفخان، م. س، ص ٤٧٨، محمد امين زکی، تاريخ السليمانية، ص ٤٧. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم ڕووداوانە بڕوانە سەرچاوەی یەکەم، ص ٤٨١.

(٥٥) شرفخان، م. س،ص٤٨١، محمد امين زکی، تاريخ السليمانية، ص ٤٧.

(٥٦) شرفنامه، ص ٤٧٨.

(٥٧) لەبارەی ئەم میرە و هەروەها میرنشینی برادۆست بڕوانە: شرفخان، م. س، ص ٤٩٦ – ٤٩٧.

(٥٨) مذکرات مأمون بک، ص ٣٤.

(٥٩) عباس العزاوي، تأريخ العراق بين احتلالين، مج ٤، شرکة التجارة والطباعة المحدودة، بغداد ١٩٤٩، ص ٤٦، عماد عبدالسلام، الاسر الحاکمة، ص ٥١.

**(60) Sahillioglu, Halil:Osmanli Doneminde Irakíin Idari Taksimati, Ceviren: Mustafa Ozturk, Belleten, Ankara, cilt. Iiv, sayi:211, 1990, s. 1237.**

سەنجەق کەوشەیەکی تورکییە و بەواتای ئالا یان لیوا دێت، یەکەیەکی کارگێڕی بچووکتر بوو لە ویلایەت یان ئیالەت. ئەو کەسەی کە ئەم یەکەیەی بەڕێوە دەبرد پێی دەگوترا (سەنجەق بەگ). بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە هەمان سەرچاوە، ل ١٢٣٣.

(٦١) بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی پەیوەندی میرنشینە کوردییەکان و دەسەلاتی عوسمانی بڕوانە: سعدي هروتي، كوردستان والامبراطورية، ص٦١-٦٦.

(٦٢) یەکێک لەمیرە زەبر بەدەست و بەتواناکانی بادینان بوو، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. عماد عبدالسلام رؤوف، السلطان حسين الولي/امير بهدينان من ٩٤٠ الى ٩٨١هـ/ ١٥٣٣ - ١٥٧٣م، مطبعة (گۆڤار) هەولێر ٢٠٠٩. بەپێی گوتەی (شەرەفخان) هەر لەسەر داوای ئەم میرە (حوسێن بەگ) و براکانی لە ڕۆمیللییەوە هێنرانەوە و حوکمڕانی بابانیان پێدرا. شرفنامە، ص ٤٨١.

(٦٣) شرفخان، م. س، ص ٤٧٨ - ٤٧٩.

(٦٤) هەمان سەرچاوە، ل ٤٧٩، حسين حزنی موکریانی، س، پ، ل ٥٥ - ٥٦.

(٦٥) ئەم (وەلی بەگ)ـە لەوانەیە هەر ئەو کەسە بێ کە لەساڵی ١٥٥١ز دا لەهێرشێکی عوسمانی بۆ سەر شارەزوور بەشداری کردووەو دواتریش کراوەتە میرلیوا لەم هەرێمەدا. بڕوانە: عباس العزاوي، تاريخ العراق، مج٤، ص ٥٩ - ٦٠.

(٦٦) شرفخان، م. س، ص ٤٧٩ - ٤٨٠. سەبارەت بە ئاکامی (بۆداق بەگ) و بنەماڵەکەی بڕوانە هەمان سەرچاوە، ل ٤٨٠.

(٦٧) بڕوانە زانیارییەکانی بەڵگەنامەکە لە: (**Sahillioglu,op.cit,s.1241**) شایانی باسە لەم سەرچاوەیە لەجیاتی (مەرگە) نووسراوە (مۆژگاوە)، بەڵام لەلاپەڕە (١٢٥٠)ی هەمان سەرچاوە ئاماژە بەوە کراوە کە ئەم (مۆژگاوە)یە (مەرگاوە)یە، بێگومان ئاشکرایە ئەمەی دواییش دەکاتە (مەرگە).

**(68) Sahillioglu.op.cit,s.1244.**

(٦٩) بڕوانە: عماد عبدالسلام، دراسات وثائقية، ص ٩٩، ١٠٠.

(٧٠) بڕوانە دەقی ئەم نامە و نووسراوە فەرمییانە لە: هەمان سەرچاوە، ل ١٠٠ - ١٠٣.

(٧١) بڕوانە دەقی بەڵگەنامەکە لە: هەمان سەرچاوە، ل ١٠٤.

(٧٢) هەمان سەرچاوە، ل ١٠١.

(٧٣) بڕوانە دەقی بەڵگەنامەکە لە: هەمان سەرچاوە، ل ١٠٤ - ١٠٥.

(٧٤) بڕوانە دەقی بەڵگەنامەکان لە: هەمان سەرچاوە، ل ١٠٥ - ١١٠.

(٧٥) شرفنامە، ص٤٨٢. شایانی باسە (موکریانی) دەڵێ (خدر بەگ) دوای ماوەیەک توانی بەفێڵ (وەلی بەگ) لەناو ببات و بەشەکەی تری بابانیش حوکم بکا (ئاوڕێکی پاشەوە، ل ٥٨) بەڵام لەمەدا ڕاستی نەپێکاوە چونکە لەم بەڵگەنامانەی پێشوو دەردەکەوێ کە دوای (وەلی بەگ) چەندین سەرداری تری عوسمانی حوکمڕانی بابانیان کردووە، وەک: عزالدين بک و اسماعيل بک و حمزە بک و قنبر بک. بڕوانە: عماد عبدالسلام، دراسات وثائقية، ص ١٠١، ١٠٢، ١٠٥، ١٠٨.

(٧٦) بڕوانە دەقی بەڵگەنامەکە لە: هەمان سەرچاوە، ل ١٠٨ - ١٠٩.

(٧٧) ئەمیر بەگی کوڕی شێخ حەیدەری موکرییە کە ماوەیەک لە میرنشینی موکریان دەسەڵاتدار بوو. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: الآثار الكاملة للمؤرخ الكردي محمد امين زكي/ مشاهير الكرد وكردستان، اعداد: رفيق صالح، ج٢، (بنکەی ژین) السليمانية ٢٠٠٥، ص ١٢٣ -١٢٤.

(٧٨) شرفنامە، ص٤٨٢، ٤٨٨. هەندێ مێژوونووسی تریش هەر باسی ئەوە دەکەن کە (ئەمیر بەگ) ئەم بەخششەی وەرگرتووە. بڕوانە: محمد امين زكي، تاريخ السليمانية، ص ٥٠، عباس العزاوي، شهرزور - السليمانية / اللواء والمدينة، تحقيق: محمد علي القرةداغي، ط١، بغداد ٢٠٠٠، ص ١٧٧، محمد جميل ڕۆژبەیانی، فەرمانڕەوایی موکریان، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا ١٩٩٢، ل ٤٨.

(٧٩) شرفنامە، ص ٤٨٨، ٤٩٠.

(٨٠) عباس العزاوی، شهرزور، ص ١٧٧ - ١٧٨، محمد جميل ڕۆژبەیانی، س. پ، ل ٤٨.

(٨١) شرفخان، م. س، ص ٤٨٢، ٤٩٠، محمد امين زكي، تاريخ السليمانية، ص ٥٠.

(٨٢) (جەمال بابان) ڕەخنە لە بۆچوونێکی لەم جۆرە دەگرێ و پێی وایە وەچەی (خدر بەگ) نەبڕاوەتەوە، لەبەر ئەوەی گوایا لە (مەرگە) بنەماڵەیەک هەیە ڕەچەڵەکی خۆی دەباتەوە سەر ئەم کەسایەتییە. بڕوانە: بابان فی التأریخ، ص٣٣. بەڵام تەنیا بانگەشەی بنەماڵەیەک نابێتە بەڵگەیەکی مێژوویی.

(٨٣) شرفنامە، ص ٤٨٢ - ٤٨٣.

**(84) Ayni Ali Efendi, Osmanli Imparatorlugunda Eyalet Taksimati, Toprak Dagitmi ve Bunlarin Mali Gucleri, Ceviren: Hadiye Tuncer, Ankara 1964, s.18; Sahillioglu, op.cit,s1250.**

بۆ ناوی سەنجەقەکانی تری نێو لیستەکە بڕوانە هەمان دوو سەرچاوە.

(٨٥) هەندێ سەرچاوە ئاماژە بە ساڵێکی دیاریکراو دەکەن وەک (موکریانی) کە ساڵی ١٠٥٥ک/ ١٦٤٥-١٦٤٦ز دادەنێ (ئاوڕێکی پاشەوە، ل٨٤)، هەروەها (سعد بشير اسكندر) کە ئاماژە بە دەوروبەری ساڵی ١٦٧٨ز دەکا (قيام النظام الاماراتي، ص ١٢٥). بەڵام لەبەر ئەوەی سەرچاوە و بەڵگەی پێویستمان لەبەردەستدا نییە، بۆیە ناتوانین ساڵێکی دیاریکراو بۆ ئەم ڕووداوە دابنێین.

(٨٦) دەکەوێتە دووری چەند کیلۆمەترێک لە (قەڵادزە)ی ئێستا کە مەڵبەندی ناوچەی پشدەرە. جمال بابان، أصول اسماء المدن والمواقع العراقية، ط٢، بغداد ١٩٨٦، ص ١١١.

(٨٧) جێگەی سەرنجە یەکێ لە نووسەران ئەمە بە بنەماڵەی سێیەمی بابان دەزانێ و هەرسێ بنەماڵەی دووەم و سێیەم و چوارەمیش تێکەڵ دەکا و بەبنەماڵەی دووەمیان دادەنێ. (بڕوانە: سعد بشير، م. س، ص١٢٥) بەڵام لەمەدا بەهەڵە چووە چونکە وەک پێشتر بینیمان پێنج بنەماڵە حوکمی میرنشینەکەیان کردووە نەک سێ بنەماڵە.

(٨٨) توێژەر لە هەندێ نووسینی تری پێشوودا ئەم مەسەلەیەی بەدرێژتر باس کردووە، بۆیە بەپێویست نەزانرا لێرەدا وردەکارییەکانی ئەم ڕووداوە دووبارە بکرێنەوە. بڕوانە: سعدي عثمان حسين، امارة بابان في النصف الاول من القرن الثامن عشر، اربيل ٢٠٠٠، ص ١٢ -١٣. د. سعدي عثمان حسين،كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر/ دراسة في علاقاتها السياسية والادارية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل، اربيل ٢٠٠٦، ص ١٥٤ - ١٥٥.

(٨٩) لەم بارەیەوە بڕوانە: کلودیوس جیمس ریچ، گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و: محەمەد حەمە باقی، چ١، تەوریز ١٩٩٢، ل ٢٩٨ - ٣٠١، عبدالقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان، ڕەوشی کوردان (مێژووی کوردستان)، و: کەریمی حیسامی، چ١، سوید ١٩٩١، ل ٨٥ - ٨٨، حسین ناظم بیگ، تاریخ الامارة البابانیة، ت: شکور مصطفی ومحمد الملا عبدالکریم المدرس، مؤسسة موکریاني للطباعة والنشر، اربیل ٢٠٠١، ص ٥٥ - ٥٩.

(٩٠) حسین ناظم بیگ، م. س، ص٥٧، هەروەها بڕوانە: احمد جودت، تأریخ جودت/ از ترتیب جدید، ج١، مطبعة عثمانیة، استانبول ١٣٠١، ص٢٧٣، ستیفن لونکریك، م. س، ص١٠٥.

(٩١) حسین ناظم بیگ، م. س،ص٦١.

(٩٢) احمد جودت،، م. س،ج١، ص٢٧٣.

(٩٣) دائرة المعارف الاسلامیة، (الترجمة العربیة) اعداد وتحریر: ابراهیم زکي وأحمد الشنتناوي و د. عبدالحمید یونس، القاهرة (د.ت)، مج٥ (مادة بابان - لونکریك)، ص ٥٣١.

(٩٤) حسین ناظم بیگ، م. س، ص ٦٥ - ٧٥، تۆفیق قەفتان، مێژووی حوکمدارانی بابان لە قەڵاچوالان تا دروستکردنی شاری سولەیمانی ١٠٨٠ - ١١٩٩ک/ ١٦٦٩ - ١٧٨٤ز، چاپخانەی سلمان الاعظمي، بەغدا ١٩٦٩، ص ١٨ - ١٩.

(٩٥) احمد جودت، م. س، ج١، ص ٢٧٣، دائرة المعارف الاسلامیة، مج٥، ص ٥٣١. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی سەردەمی ئەم میرە و فراوانخوازییەکانی بڕوانە: سعدي عثمان حسین،کوردستان الجنوبیة،ص ٢٤٩ - ٢٥٣.

(٩٦) بڕوانە: خلیل علي مراد، تأریخ العراق الاداري والاقتصادي في العهد العثماني الثاني ١٦٣٨ - ١٧٥٠/ ١٠٤٨ - ١١٦٤هـ، رسالة ماجستیر، کلیة الاداب جامعة بغداد/ ١٩٧٥، ص ٦١ - ٦٢.

(٩٧) ڕەوشی کوردان، ل ٨٩.

(٩٨) گەشتی ریچ، ل ٣٠٤.

(٩٩) تاریخ السلیمانیة، ص ٥٣.

(١٠٠) جمال بابان، بابان في التأریخ، ص ١٠.

(١٠١) ئاوڕێکی پاشەوە، ل ٢٣ - ٢٤.

(١٠٢) هەمان سەرچاوە، ل ٣٠ - ٣١.

(١٠٣) بابان في التأریخ، ص ٩ - ١١.

(١٠٤) عماد عبدالسلام، الاسر الحاکمة، ص ٢٤٨.

(١٠٥) کاکەیی: گرووپێکی ئایینی کوردن کە خاوەن داب و نەریتی تایبەت بەخۆیانن، مەڵبەندی سەرەکییان گوندی هاوارە لە ناوچەی هەورامان، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عباس العزاوي، الکاکائیة في التاریخ.

(١٠٦) شرفخان، م. س،ص٤٧٣ (پەراوێزی وەرگێڕ)، هەروەها: مذکرات مأمون بک، ص ١٦ (پەراوێزی وەرگێڕ).

(١٠٧) مذکرات مأمون بک، ص ١٦ (پەراوێزی وەرگێڕ).

(١٠٨) بۆ نموونە بڕوانە: شرفخان، م. س، ص ٤٧٣، عماد عبدالسلام، دراسات وثائقیة، ص ١١٨ ومابعدها، نظمي زادە مرتضی افندي، گلشن خلفا، ت: موسی کاظم نورس، مطبعة الاداب،

النجف ١٩٧١، ص ٢٩٦، ٣٢٨.
(١٠٩) گەشتی ریچ، ل ١٠٢.
(١١٠) النجوم الزاهرة، ج ١٦، ص ٣٢٨، ٣٢٩.
(١١١) بڕوانە: رابیعة فەتاح، س. پ، ل ٣٣٢، د. زرار صدیق توفیق، القبائل والزعامات القبلیة الكردیة في العصر الوسیط، اربیل ٢٠٠٧، ص ٢٤. شایانی باسە ئەمەی دوایی لەهەمان کاتدا ئاماژە بەوە دەکا کە بابان زیاتر ناوی چەند بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدارە.
(١١٢) شرفنامە، ص ٤٧٣، ٥١٤، ٥٣٤.
(١١٣) هەمان سەرچاوە، ل ٤٧٣.
(١١٤) هەمان سەرچاوە، ل ٤٨٢.
(١١٥) هەمان سەرچاوە، ل ٤٧٣.
(١١٦) گەشتی ریچ، ل ١٠٢.
(١١٧) عباس العزاوي، عشائر العراق،ج٢، ص ٩٩.
(١١٨) مارك سایكس، القبائل الكردیة في الامبراطوریة العثمانیة، ت: د. هوراز سوار علي، تقدیم ومراجعة: د. عبدالفتاح علي یحیی، دهوك ٢٠٠٢، ص ٣٤، ٩٧.
(١١٩) شرفخان، م. س، ص ٤٧٧، ٤٨٢.
(١٢٠) بڕوانە: گەشتی ریچ، ل١٠٢ ، عماد عبدالسلام، دراسات وثائقیة، ص ٩٩.
(١٢١) احمد جودت،، م. س، ج١، ص ٢٧٣، حسین ناظم بیگ، م. س، ص ٥٥ ومابعدها.
(١٢٢) بڕوانە: عماد عبدالسلام، دراسات وثائقیة، ص ١١٠، ١٢٠، ١٢١، ١٣٥، نظمي زادە، م، س، ص ٢٩٦.
(١٢٣) عەلی سەیدۆ گۆرانی، لە عەممانەوە بۆ ئامێدی / گەشتێک بەکوردستانی باشووردا، و: تالیب بەرزنجی، سلێمانی ٢٠٠، ل ٧٣، عبدربه الوائلي، م. س، ص ٩٩.
(١٢٤) عماد عبدالسلام، دراسات وثائقیة، ص ١١٦.
(١٢٥) ستیفن لونكریك، م. س، ص ١٠٥.
(١٢٦) شرفنامە، ص ٤٧٤.
(١٢٧) ئاوڕێکی پاشەوە، ل ٢٤، ٣١.
(١٢٨) شرفخان، م. س، ص ٤٧٣ (پەراوێزی وەرگێڕ).
(١٢٩) بڕوانە: مذكرات مأمون بك، ص ١٦ (پەراوێزی وەرگێڕ).
(١٣٠) زرار صدیق، القبائل والزعامات القبلیة، ص ٢٠، ٢٤.
(١٣١) اصول اسماء المدن، ص ٣٦، هەروەها بڕوانە: بابان في التأریخ، ص ١٠ - ١١.
(١٣٢) شرفخان، م. س، ص ٤٧٣، ٤٧٥.
(١٣٣) ئیستاش بەشێخ و کەسایەتییە ئایینیەکان دەگوترێ (چاک و پیر).
(١٣٤) شرفخان، م. س، ص ٤٧٣.
(١٣٥) بڕوانە: مشاهیر الكرد وكردستان، ج٢، ص ١٤٩.
(١٣٦) شرفنامە، ص ٤٧٦ - ٤٧٧.
(١٣٧) جێگەی سەرنجە یەکێ لە مێژوونووسان وادەزانێ ئەم (میر سلێمان)ـە کوڕی (پیر نەزەر) بوو (بڕوانە: عماد عبدالسلام، الاسر الحاكمة، ص٢٥١) بەڵام لە (شەرەفنامە)دا دیارە کە ئەو تەنیا

سەرداری دەڤەرێکی بابان بووەو هیچ ئاماژە بەوە نەکراوە کە ئەوان کوڕو باوک بن. بڕوانە: شرفخان، م. س، ص ٤٧٧.
(١٣٨) هەمان سەرچاوە، ص ٤٧٧.
(١٣٩) دائرة المعارف الاسلامية، مج٥، ص ٥٣١.
(١٤٠) ئاوڕێکی پاشەوە، ل ٨٤.
(١٤١) تاريخ السليمانيه، ص ٥٣ - ٥٤. شایانی باسە مێژوونووسێکی تریش پێی وایە ڕچەڵەکی فەقێ ئەحمەد دەگەڕێتەوە سەر (ئەمیر بەگی موکری)، (بڕوانە: عماد عبدالسلام، الاسر الحاكمة، ص ٢٥٣، ٢٥٤). لەکاتێکدا هەندێ سەرچاوەی تر بەپێچەوانەی ئەمەش ئاماژە بەوە دەکەن کە بنەماڵەی میرانی موکریانیش بە ڕچەڵەک دەگەڕێنەوە سەر بابانییەکان. بڕوانە: شرفخان، م. س،ص٤٨٥، عبدالقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان، س. پ، ل ٨٨، ٨٩، جمال بابان، بابان في التأريخ، ص ١٥.
(١٤٢) بڕوانە دەقی ئاخاوتنەکە لە: گەشتی ریچ، ل ٣٠٦.
(١٤٣) كارستن نيبور، رحلة نيبور الي العراق في القرن الثامن عشر، ت: د. محمود امين حسين، مراجعة وتعليق: سالم الآلوسي، بغداد ١٩٦٥، ص ٧٤.
(١٤٤) عباس العزاوي، شهرزور، ص ١٨٥، عبدربه الوائلي، م. س، ص ٩٩.
(١٤٥) لەم بارەیەوە بڕوانە: حەمە کەریم هەورامی، مێژووی پەروەردەو خوێندن لە حوجرەکانی کوردستاندا، ب١ ،چ١، هەولێر ٢٠٠٨، ل ٣٠٤.
(١٤٦) سعد بشيراسكندر، م. س، ص ١٢٥.
(١٤٧) لە سەرچاوەیەکی عوسمانی بەناوی (سجل عثماني) ئاماژە بەوە کراوە کە (سلێمان بەبە) سەرۆک هۆز بووە و پێشی ئەویش چەندانی تر هەبوون. (بڕوانە: عباس العزاوي، شهرزور، ص ١٨٤) کەواتە (فەقێ ئەحمەد)ی باپیریشی یەکێک بووە لەوانە.
(١٤٨) عماد عبدالسلام، الاسر الحاكمة، ص ٢٥٣، عبدربه الوائلي، م. س، ص ٩٨. شایانی باسە خودی توێژەریش لە هەندێ نووسینی پێشوویدا بۆچوونێکی وای خستۆتە ڕوو. بڕوانە: سعدی عثمان، اماره بابان، ص ١٣، سعدی عثمان،كوردستان الجنوبيه، ص ١٥٥.
(١٤٩) محەممەد ئیبراهیم ئەردەڵانی، ذەیلی شەرەفنامە، لە کتێبی: دوو ذەیلی شەرەفنامەی بدلیسیی، ئامادەکردنی: ئەنوەر سولتانی، سلێمانی ٢٠٠٥، ل ٩٩.
(١٥٠) بۆ دەقی ڕیوایەتەکە بڕوانە: حسين ناظم بيگ، م. س، ص ٥٥ - ٥٩، هەروەها: محمد امين زكي، تاريخ السليمانية، ص ٥٨ - ٥٩.
(١٥١) گەشتی ریچ، ل ١٠٢.
(١٥٢) هەمان سەرچاوە، ل ٢٩٨.
(١٥٣) محمد امين زكي، تاريخ السليمانية، ص ٥٢ (پەراوێزی وەرگێڕ)، لەبارەی چوار لقەکە بڕوانە: شرفخان، م. س، ص ٥٠.
(١٥٤) عباس العزاوي، عشائر العراق، ج٢، ص ٩٩.
(١٥٥) محمد امين زكي، تاريخ الدول والامارات الكردية في العهد الاسلامي، ت: محمد علي عوني، مطبعة السعادة، القاهرة ١٩٤٨، ص ٤١٧، جمال بابان، بابان في التأريخ، ص ٣٤، نەوشیروان مستەفا، س. پ، ل ٤٥.

**لیستی سەرچاوەکان**

**یەکەم:بەڵگەنامەی بڵاوکراوە:-**

**-Ayni Ali Efendi, Osmanli Imparatorlugunda Eyalet Taksimati, Toprak Dagitmi ve Bunlarin Mali Gucleri, Ceviren: Hadiye Tuncer, Ankara 1964.**

**-Sahillioglu, Halil: Osmanli Doneminde Irakíin Idari Taksimati, Ceviren: Mustafa Ozturk, Belleten, Ankara, cilt. Iiv, sayi:211,1990.**

- د. عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تأريخ الكرد الحديث وحضارتهم، منشورات وزارة الثقافة، اربيل ,٢٠٠٨.

**دووەم: کتێب:**

**أ- بەزمانی تورکی:**

- احمد جودت، تأريخ جودت/ از ترتيب جديد، ج١، مطبعة عثمانية، استانبول ١٣٠١.

**ب- بەزمانی کوردی:**

- تۆفیق قەفتان، مێژووی حوکمدارانی بابان لە قەڵاچوالان تا دروستکردنی شاری سولەیمانی ١٠٨٠-١١٩٩ک/ ١٦٦٩-١٧٨٤ز، چاپخانەی سلمان الاعظمي، بەغدا ١٩٦٩.
- چمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان/ چەند لاپەڕەیەکە لەکتێبی (نور الانوار)ی (سید عبدالصمدی توداری) کە لە ١٠٩٩ی هیجرەتدا نووسیویە، محمد مەلا کەریم وەریگێڕاوەتە سەر کوردی، چاپخانەی (سلمان الاعظمي)، بەغدا ١٩٧٠.
- حسین حزنی موکریانی، ئاوڕێکی پاشەوە، ب١(حوکمدارانی بنەماڵەی ئەردەڵان و بابان لە شارەزووردا)، ڕەواندوز ١٩٣١.
- حەمە کەریم هەورامی، مێژووی پەروەردەو خوێندن لە حوجرەکانی کوردستاندا، ب١،چ١، هەولێر ٢٠٠٨.
- رابیعە فەتاح شێخ محەمەد، کوردستان لە سەدەی پازدەی زاینیدا، چاپکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٥.
- ڕاجر سێیڤری، ئێرانی سەردەمی سەفەوی، و: سەلاحەددین ئاشتی، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٦.
- عبدالقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان، ڕەوشی کوردان (مێژووی کوردستان)، و: کەریمی حیسامی، چ١، سوید ١٩٩١.
- عەلی سەیدۆ گۆرانی، لەعەممانەوە بۆ ئامێدی / گەشتێک بەکوردستانی باشووردا، و: تالیب بەرزنجی، سلێمانی ٢٠٠.
- کلودیوس جیمس ریچ، گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و: محەمەد حەمە باقی، چ١، تەوریز ١٩٩٢.
- ماهشەرەفخانم مەستوورەی کوردستانی: مێژووی ئەردەڵان، و: د. حسن جاف و شکور مستەفا، چ١، بەغدا ١٩٨٩.
- محمد جمیل ڕۆژبەیانی، فەرمانڕەوایی موکریان، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا ١٩٩٢.
- محەممەد ئیبراهیم ئەردەڵانی، ذەیلی شەرەفنامە، لە کتێبی: دوو ذەیلی شەرەفنامەی بدلیسیی،

ئامادەکردنی: ئەنوەر سولتانی، سلێمانی ٢٠٠٥.
- نەوشێروان مستەفا ئەمین، میرایەتی بابان لەنێوان بەرداشی رۆم و عەجەمدا، چ٢، سلێمانی ١٩٩٨.

**ج- بەزمانی عەرەبی:**

- جمال الدين ابي المحاسن يوسف بن تغري بردي، النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، تحقيق: د. جمال الدين الشيال وفهيم محمد شلتوت،ج١٦، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة ١٩٧٢.
- جمال بابان، أصول اسماء المدن و المواقع العراقية، ط٢، بغداد ١٩٨٦.
- ـــــ، بابان في التأريخ ومشاهير البابانيين، بغداد ١٩٩٣.
- حسين ناظم بيگ، تاريخ الامارة البابانية، ت: شكور مصطفي ومحمد الملا عبدالكريم المدرس، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل ٢٠٠١.
- د. زرار صديق توفيق، القبائل والزعامات القبلية الكردية في العصر الوسيط، اربيل ٢٠٠٧.
- ـــــ، كردستان في القرن الثامن الهجري/ دراسة في تأريخها السياسي والاقتصادي، مؤسسة موكرياني، اربيل ٢٠٠١.
- ستيفن همسلي لونكريك، أربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ت: جعفر الخياط، ط٦، بغداد ١٩٨٥.
- د. سعد بشير اسكندر، قيام النظام الاماراتي في كردستان وسقوطه/ مابين منتصف القرن العاشر ومنتصف القرن التاسع عشر، ط٢، السليمانية ٢٠٠٨.
- سعدي عثمان حسين، امارة بابان في النصف الاول من القرن الثامن عشر، اربيل ٢٠٠٠.
- ـــــ،كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر/ دراسة في علاقاتها السياسية والادارية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل، اربيل ٢٠٠٦.
- ـــــ، كوردستان والامبراطورية العثمانية/ دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان (١٥١٤-١٨٥١)، مؤسسة موكرياني- اربيل، مطبعة خاني، دهوك ٢٠٠٨.
- شرفخان البدليسي، شرفنامة، ت:محمد جميل الملا أحمد الروژبياني، ط٢، مؤسسة موكرياني، اربيل ٢٠٠١.
- شمس الدين محمد بن عبدالرحمن السخاوي، الضوء اللامع لأهل القرن التاسع، منشورات مكتبة الحياة، بيروت، (د.ت)، ج٦.
- عباس العزاوي، تأريخ العراق بين احتلالين، مج٤، شركة التجارة والطباعة المحدودة، بغداد ١٩٤٩.
- ـــــ، شهرزور - السليمانية/ اللواء والمدينة، تحقيق: محمد علي القرەداغى، ط١، بغداد ٢٠٠٠.
- ـــــ، عشائر العراق، ج٢ الكردية، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٤٧.
- عبدربه ابراهيم الوائلي، تاريخ الامارة البابانية/١٧٨٤ - ١٨٥١، ط١، دار الزمان، دمشق - سوريا ٢٠٠٨.
- عماد احمد الجواهري، صراع القوي السياسية في المشرق العربي (من الغزو المغولي حتي الحكم العثماني)، مطابع التعليم العالي، جامعة القادسية ١٩٩٠.
- د. عماد عبدالسلام رؤوف، الاسر الحاكمة ورجال الادارة والقضاء في العراق في القرون المتأخرة،

دار الحكمة للطباعة والنشر، بغداد ١٩٩٢.
- ــــــــــ، السلطان حسين الولي/امير بهدينان من ٩٤٠ الى ٩٨١هـ/ ١٥٣٣-١٥٧٣م، مطبعة (گۆڤار) هەولێر ٢٠٠٩.
- كارستن نيبور، رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر، ت: د. محمود امين حسين، مراجعة وتعليق: سالم الالوسي، بغداد ١٩٦٥.
- كتاب الحوادث لمؤلف من القرن الثامن الهجري، تحقيق: د. بشار عواد معروف و د. عماد عبدالسلام رؤوف، ط١، دار الغرب الاسلامي، بيروت ١٩٩٧.
- مارك سايكس، القبائل الكردية في الامبراطورية العثمانية،ت:د.هوراز سوار علي،تقديم ومراجعة:د. عبدالفتاح علي يحيى، دهوك ,٢٠٠٢
- محمد امين زكي، الاثار الكاملة للمؤرخ الكردي محمد امين زكي/ مشاهير الكرد وكردستان، اعداد: رفيق صالح، ج٢، (بنكەی ژين) السليمانية ٢٠٠٥.
- ــــــ، تاريخ الدول والامارات الكردية في العهد الاسلامي، ت: محمد علي عوني، مطبعة السعادة، القاهرة ١٩٤٨.
- ــــــ، تاريخ السليمانية وانحائها، ت: الملا جميل الروزبياني، بغداد ١٩٥١.
- مذكرات مأمون بك بن بيكة بك، ت: محمد جميل الروژ بياني وشكور مصطفي، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد ١٩٨٠.
- نظمي زاده مرتضى افندي، گلشن خلفا، ت: موسي كاظم نورس، مطبعة الاداب، النجف , ١٩٧١

**سێيەم:نامەی زانكۆيی:**
- خليل علي مراد، تأريخ العراق الاداري والاقتصادي في العهد العثماني الثاني ١٦٣٨ - ١٧٥٠م/ ١٠٤٨ -١١٦٤هـ، رسالة ماجستير، كلية الاداب جامعة بغداد/ , ١٩٧٥

**چوارەم:ئينسايكلۆپيديا:**
- دائرة المعارف الاسلامية، (الترجمة العربية) اعداد وتحرير: ابراهيم زكي وأحمد الشنتناوي و د. عبدالحميد يونس، القاهرة (د.ت)، مج٥ (مادة بابان - لونكريك).

ملخص البحث باللغة العربية:

## ظهور الامارة البابانية
## دراسة تحليلية حول تأسيس الامارة وجذور بابان

أ. م. د. سعدي عثمان هروتي
قسم التاريخ - كلية الآداب - جامعة صلاح الدين - اربيل

كانت الامارة البابانية من الامارات الكردية التي كانت قائمة في القرن (١٥م). ولكنها كانت امارة صغيرة في منطقة (پشدر) حتي بدايات القرن التالي، حيث بادر الامير (بوداق بن ابدال) الي توسيعها شرقا وجنوبا وصار لها ثقلها السياسي. وبعد انقراض الاسرة الحاكمة الاولي، تمكن (پير نظَر بن بهرَام) من انقاذ الامارة من الانحلال وقام بتطويرها. ولكن بابان قد خسرت وحدتها في عهد الاسرتين الثالثة والرابعة وتعرضت للنزاعات الداخلية والتدخلات الخارجية. وحينما اصبحت تابعة للدولة العثمانية، ساهم العثمانيون في اذكاء نار الخلافات بين امراء بابان. فكانت النتيجة خضوع جزء من الامارة الي الادارة العثمانية المباشرة منذ اواسط ذلك القرن. اما الجزء الآخر فقد بقيت للامير البابانی الاخير (خضر بك) الذي توفي في نهايات القرن (١٦)، فتفككت الامارة بأكملها. وبقيت علي هذه الحالة حتي تمكن (فقي احمد) من اعادة تأسيسها في اواسط القرن التالي.

ان مصطلح (بابان) قد اشتق من كلمة (به به) واضيفت اليها لاحقة (ان) التي تفيد الجمع، لتعبر عن اسم عائلة حاكمة، ثم اسم كيان سياسي وبعدها اصبح اسما للمنطقة وعنوانا لاهلها. كانت العائلة البابانية الاولي تتمتع في الاصل بنفوذ ديني - اجتماعي، الامرَ الذي ساعدها على ممارسة السلطة في المنطقة. وكانت العائلة الثانية لها نفوذ مماثل، ولكن الاسرتين الثالثة والرابعة فكانتا من حاشية الاسرتين السابقتين. اما (فقي احمد) فينتسب الي احدي الاسر التي تمتعت بنفوذ اقطاعي - عشائري في المنطقة، في اعقاب انحلال الامارة في نهايات القرن (١٦).

Abstract

**THE EMERGENCE OF BABAN EMIRATE**

**Analyzing study about establishment of the emirate and its roots**

**Dr.Saadi Uthman Haruti**

**History Dep. College of Art - Salahaddeen university -Erbil**

**Baban Emirate was one of the Kurdish Emirates in 15th century. And it was a small Emirate in Pishder district until the beginning of next century. But the frontiers of this Emirate extend to the east and south by the attempts of Emir Bodaq bin Abdal, and its political situation became strong. After the dying out of the first dynasty of Baban, Pir Nazar bin Bahram rescue Baban from disintegration. But the unity of the Emirate forfeited in the era of third and fourth dynasty. And it bring under the internal conflicts and the external interference. And when it became under the influence of Ottoman Empire, the Ottoman authorities attempted to increase the conflict between the Baban emirs, which conclude bringing a part of Baban under the Ottoman direct administration at the middle of this century. But the other part it abide by the last emir of Baban, who day in the end of 16th century. This is led to disintegration of the Emirate. But Faqe Ahmed succeeds to re- constituting it in the middle of next century.**

**The term of Baban is derivative the word (baba) and suffix (an) in Kurdish, which made it plural. This term in origin is the name of a dynasty, but its change to be a title of the Emirate. After that itís became a name of the region. The first dynasty of Baban probably has a religious- social influence. Which give them the authority in the region. The second dynasty also has this influence. But the third and fourth dynasty are descends from the decorum of first and second dynasties. The family of Faqe Ahmed (the head of fifth dynasty) has a feudal -tribal base in the region at the beginning of 17th century.**

# ژنانی کورد له مێژوودا*

**پ. د. جەبار قادر**
**ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی**

هەر لە سەرەتاوە دەبێ دان بەو راستییەدا بنێین کە لێکۆڵینەوەی زانستی لە سەر مێژووی کۆمەڵایەتی و کولتووری کۆمەڵگەی کوردی دەگمەنن. رەنگبێ هەژارترین لاپەڕەی ئەو لایەنانەش رەوش و پێگەی ژنانی کورد بێ لەو کۆمەڵگەیەدا، نەک تەنها لە سەردەمە مێژووییەکانی رابردوودا، بەڵکو ئەم بارە بۆ رۆژانی ئەورۆش تا ئاستێکی بەرچاو راستە. پشتگوێ خستنی مێژووی کۆمەڵایەتی و ژیاری و گرنگیدانی تەنها بە مێژووی سیاسی بارێکە هەموو گەلانی رۆژهەڵات دەگرێتەوە. لێ لە لای کورد بە هۆی ئەو رەوتە مێژووییە ئاڵۆزەوە کە ئەم گەلە پێیدا تێپەڕیوە لە بارێکی خراپتردایە بە بەراورد کردن لەگەڵ ئەو گەلانەدا. لە بەر ئەم هۆیانە و گەلێ هۆی تر ناکرێ لە لێکۆڵینەوەیەکی وا کورتدا چاوەڕوانی ئەوە بکرێ دیمەنێکی راستەقینەی ژنانی کورد لە مێژوودا بکێشرێ. بۆیە بە ناچاری هەر دەبێ پەنا ببەینە بەر ئەو ئیماژ و ناوانەی کە مێژوو بۆی تۆمار کردووین تایبەت لەم یەک دوو سەدەیەی دواییدا و تەنها سەردێڕەکانی ئەم بابەتە گرنگە بخەینە روو.

هەروەها دەبێ لایەک لەو راستییەش بکەینەوە کە زۆربەی هەرە زۆری گەڕیدە بیانییەکان ئاماژە بە هەندێ جیاوازی دەکەن لە نێوان پێگە و بار و دۆخی ژنانی کورد و ژنانی گەلانی دراوسێدا. دەبێ ئەو جیاوازییانە لە چوارچێوە و لە بەر رۆشنایی باری جوگرافی و تۆپۆگرافی کوردستان و شێوازی بەرهەمهێنان و گوزەران و ژیان و ئاو و هەوای وڵاتی کوردەوارییدا لێکبدرێنەوە.

ئەو دەڤەرە جوگرافییە کە کوردستانی تێدا هەڵکەوتووە یەکێ لە ناوەندە شارستانی و ژیارییە هەرە کۆنەکانی جیهانە. واتا وڵاتی کوردان خاوەن مێژوویەکی دێرینە و لە مێژووی گەلی کورد گەلێ کۆنترە. نە بەڵگەی مێژووییمان لە بەردەستدان و نە هۆیەکی زانستی باوەڕ پێکراوی وا لە ئارادایە وامان لێبکا بیر لەوە بکەینەوە کە باری ژنانی کورد بە درێژایی سەدەکانی مێژوو جیاوازییەکی

---

* رێکەوتی وەرگرتن ٢٠٠٩/١٠/٢٨

ئەوتۆی هەبووبێ لەگەڵ بار و گوزەرانی ژنانی گەلانی دراوسێدا. ئەو باس و خواسانەی کە دەڵێن نەفەرتیتی لە کوردستانەوە براوە بۆ میسر و گوایە باخچە دڵڕفێنەکانی بابل و باشووری میزۆپۆتامیا لە بەر چاوی کاڵی کچێکی چیایی کوردستانی، کە ژنی ئیمپراتۆر بووە و تەنها بە دیمەنی چیا و قەڵای بەرز دڵی کراوەتەوە، دروست کراون شتێکی ئەوتۆ لە مەسەلەکان ناگۆڕن. هەروەها ئەوەی کە تۆما بوا دەیگێڕێتەوە کە ژنانی گۆتییان، کە بە باوە گەورەی کوردانی ئەوڕۆ دادەنرێن، گەلێ جار سەرکێشیی سوپا و هێرشەکانی ئەو گەلەیان کردووە، هەرچەندە مایەی شانازین بۆ کورد، لێ هیچیان لە باری پڕ لە مەینەتی ژنانی کورد بە درێژایی مێژوو سووک نەکردووە[١].

ئەگەر خۆمان بەم باسانەوە خەریک نەکەین و بە وردی لە بار و دۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری کۆمەڵگەی کوردەواری بکۆڵینەوە، ئەوا رەنگبێ بتوانین زانیاری زیاتر لە بارەی ژنی کوردەوە لە سەردەمە مێژووییە جیاوازەکاندا بخەینە روو. ئەو بارە جوگرافی و تۆپۆگرافی و شێوازی ژیان و گوزەرانەی لێ درەچێ، ژنانی کورد هەر وەکو ژنانی گەلانی تری دراوسێی کۆن و نوێ، چ ئەوانەی لە شار و دێ نیشتەجێ ببوون و چ ئەوانەی ژیانی کۆچەرییان بە سەر دەبرد بە هەمان شێوە دەژیان و پێگەیان لە نێو کۆمەڵگاکانیاندا وێک دەچوون.

بۆ لێکدانەوەی ئەو جیاوازییانە و هۆکار و ئاکامەکانیان و هەموو پرس و ئەگەرەکان لەم بارەیەوە پێویستی زۆرمان بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئەتنۆگرافی و کولتووری قووڵ و هەمەلایەنە هەیە.

مخابن لە سەرچاوەکانی مێژووی کۆن و سەدەکانی ناوەڕاستدا کە زیاتر بۆ باس و خواسی پادشا و میر و سەرداران و شەڕ و شۆڕی هێز و دەوڵەتان تەرخان کراون زانیاری و هەواڵی گرنگمان لە بارەی پێگە و رۆڵی ژنانەوە بە گشتی و ژنی کوردەوە بە تایبەتی لە بەردەستدا نین، بۆیە بە ناچاری دەبێ هەر باس لە نموونەکانی مێژووی نوێ و هاوچەرخی کوردستان بکەین.

سەرچاوەکانی تایبەت بەم یەک دوو سەدەیەی دوایی بە شانازییەوە باسی پلە و پێگەی هەندێ ژنی نێوداری کۆمەڵگەی خێڵەکی و دەرەبەگی کوردمان بۆ دەکەن. هەڵبەتە ئەو رۆڵ و پێگەیە دەبێ لە چوارچێوەی مێژوویی خۆیاندا سەیر بکرێن و هەڵبسەنگێنرێن. ئەو نموونە مێژووییانە زیاتر پەیوەندییان بە دەسەڵاتەوە هەیە. تەنها لە سەدەی بیستەمدا دەتوانین باس لە بزاڤێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی ژنان لە نێوان کورداندا بکەین. لەگەڵ هەموو کۆسپ و تەگەرەکاندا بزاڤی ژنان لەم چەند

ساڵەی دواییدا پەرە دەستێنێ و پیاوسالاران ناچار دەکات هەندێ بە هەڵوێستەکانی خۆیاندا بچنەوە.

ئەگەر باسی ئازایەتی و پێگەی ژنانی میر و سەردارانی کوردستان لەم چەند سەدەیەی دواییدا بکەین ئەوا سەرچاوە مێژووییەکان نێوی هەندێ ژنی بە توانا و ئازامان بۆ تۆمار دەکەن. مخابن ئەو سەرچاوانە گەلێ جار لە نێوەکانیان بەولاوە هیچ زانیارییەکی ترمان لە بارەیانەوە پێشکەش ناکەن. بۆ نموونە باوکی مێژوونووسانی کورد شەرەفخانی بدلیسی باسی دەوڵەت خانمان بۆ دەکات کە لە ساڵی ١٣١٦ - ١٣١٧ زاینیدا لە میرنشینی لوڕی بچووک لە دوای مردنی هاوسەرەکەی دەسەڵاتی گرتۆتە دەست. هەروەها باسی ئەوەشمان بۆ دەکات کە لەو دەڤەر و کۆمەڵگە خێڵەکییە سەردارانی هۆز و خێڵەکان لەو سەردەمەدا ئامادە نەبوون مل بۆ دەوڵەت خانم بدەن و ئەویش بەناچاری دەستی لە دەسەڵات هەڵگرت بۆ میر عیزەدین حوسێنی برای. هەروەها شەرەفخان باسی حەلیمە خانی هەکاری و کوێخا نێرگزی شوانمان بۆ دەکا کە لە نێو کوردەکانی ئەو دوو دەڤەرەدا نێوبانگییان دەرکردبوو[٢]. مخابن شەرەفخان لەوە زیاتر هیچ زانیارییەکمان لە بارەیانەوە پێشکەش ناکات.

## لە نێو خانمانی شاعیر و نووسەری سەدەکانی رابردوودا
## ماە شەرەف خانمی کوردستانی (١٨٠٥ - ١٨٤٧)

کە بە مەستوورە خانم نێوی رۆیشتووە جێگەیەکی تایبەتی هەیە. مەستوورە خانم سەرباری دیوانی شیعرەکەی کە بیست هەزار بەیتە و لە ساڵی ١٩٢٦ لە ژێر نێوی (دیوان ماه شرف خانم کردستانی - مستوره) لە چاپ دراوە، خاوەنی کتێبی (تاریخی ئەردەڵان) یشە. ئەم کتێبەی ماە شەرەف خانم بە وتەی خانمە رۆژهەڵاتناسی رووس ڤاسیلیێڤا شوێنێکی تایبەتی لە مێژوونووسیی ئەردەڵاندا لە رۆژهەڵاتی کوردستان هەیە. مەستوورە خانم بە جیاواز لە نووسەرانی پێش خۆی، کە زۆر ورد نەبوونە لە گێرانەوەی هەواڵ و زانیارییەکاندا و زۆر گوێیان بە رێکوپێک کردنی سەرچاوە و هەواڵەکان نەداوە، بە چاوێکی رەخنەگرانە لە هەواڵ و سەرچاوە و باس و خواسەکانی کۆڵیوەتەوە و نرخاندوونی. دەستنووسەکەی ماە شەرەف خانم لە ساڵی ١٩٤٦ لە سنە لە چاپ دراوە و لە ساڵی ١٩٩٠ هەر ئەو رۆژهەڵاتناسە بە خۆی کردوویەتی بە رووسی و لە مۆسکۆ بڵاوی کردۆتەوە. زانیارییەکانی مەستوورە خانم بە وتەی ڤاسیلیێڤا زۆر گرنگن بۆ تێگەیشتن لە

هاوسەنگیی هێزەکان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا[٣].

ڕەنگبێ هەمــوو لایەک بزانین کــە خــانزاد خــانمی خــوشکی مــیــر سلێــمــان فەرمانڕەوای میرنشینی سۆران بووە لەو کاتەی کە هەریر پایتەختی ئەو میرنشینە بووە و دوای ئەوەی والی بەغدا میر سلێمان دەکوژێ. ئەو خانمە میرزادەیە وەکو ئەمــیــرەی سۆران لە مــێــژوودا نێـوی دەرکـردووە و بە وتەی مــێــژوونووســان گــەلێ شوێنەواری لە دوای خۆی بەجێهێشتوە کە بە نێوی خۆیەوە ماونەتەوە وەکو پرد و مزگەوت و قوتابخانە. تا ئێستاش شوێنەواری کۆشکی خانزاد لە هەریر ماوە. لە کاتی خانزادا شەقڵاوە زۆر گەشەی کردووە و هاوینەهەواری قەرالیچە بووە و لە سەر لووتکەی چیای سەفینیش گۆڕەپانێک بە نێـوی خانزادەوە هەیە و دەڵێن گوایە هاوینان لەوێ هەواری هەڵداوە. هەروەها سەرچاوەکان باسی ئەوە دەکەن کە خانزاد بە خۆی لە شەڕەکاندا بەشداری دەکرد و خاوەن ڕۆشنبیری و زانیارییەکی باش بووە[٤].

مەلا مەحمودی بایەزیدیش باس لە ئازایەتی و سەرکردایەتی قەرە فاتم دەکات کە لە کاتی شەڕی ١٨٧٧ دا لە نێوان دەوڵەتی ئۆسمانی و ڕوسیادا سەرکێشیی ٥٠٠ سواری کوردی دەکرد لە ناوچەکانی قارس و ئەرزەڕۆم. پیۆتەر لێرخیش باس لە بەشداری چالاکانەی ژنانی کورد دەکا لە ڕاپەڕین و سەرهەڵدانەکاندا لە دژی سوپا و پاشایانی دەروازەی بالآدا[٥].

مێجەرسۆنی ئینگلیز، کە لە ساڵی ١٩٠٩ لە ژێر نێوی بازرگانێکی فارسدا دەچێتە هەڵەبجە و لە نزیکەوە عادیلە خانمی هاوسەری ئۆسمان پاشای جاف دەناسێ، وێنەیەکی دڵگیری ئەو ژنە زیرەک و هێژایە دەکێشێ. بە وتەی سۆن عادیلە خانم ژنێکی بێ هاوتا و تێگەیشتوو و خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز بوو. فەرمانڕەوای ڕاستەقینەی دەڤەری شارەزوور بوو نەک تەنها لە ئاستی دەسەڵاتی سیاسیدا، بەڵکو دادگای خۆی هەبوو و زیندانی دروست کردبوو و بە خۆی سەرپەرشتی دادگای دەکرد و پیاوخراپانی سزا دەدا. هەروەها کۆشک و تەلاری جوان و بازاڕی ڕێکوپێکی لە هەڵەبجە دروست کرد و لە گوندێکی لە بیرکراوی ئۆسمانییەوە کردی بە ناوەندێکی سیاسی و بازرگانی کە پاشایانی دەوڵەتی ئۆسمانی بە چاوی ئیرەییەوە مرخیان لێ خۆش کردبوو. لێ عادیلە خانم بە هیچ شێوەیەک ڕێگەی نەدەدا بە دەسەڵاتی ئۆسمانی بنە و بارەگای خۆی لە هەڵەبجە دابمەزرێنێ. لەو دەڤەرە کەس لە قسەی عادیلە خانم دەرنەدەچو و هەموو لایەکی ناچار کردبوو ڕێزی لێ بگرن و ملکەچی ڕێنمایی و

بڕیارەکانی بن[٦]. ئێدمۆندزیش، کە یەکێ لە نوێنەرە چالاکەکانی دەسەڵاتی کۆلۆنیالی بەریتانی بوو لە کوردستان و هەموو عیراق، دوای مێجەر سۆن بە زیاتر لە دە ساڵ دەچێتەوە لای عادیلە خانم و بەهەمان شێوەی سۆن و بگرە زیاتریش باسی لێوە دەکا. عادیلە خانم لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی و لە دوای کۆچی هاوسەرەکەی سەرکردایەتی گەورەترین هۆزی کوردی دەکرد کە هۆزی جاف بوو. ئۆسمان پاشای هاوسەری پیاوێکی نەرم و نیان بوو و تەنانەت لە ژیانیدا کەم لە هەڵەبجە دەمایەوە و هەمیشە بە ڕێگەی سلێمانی و کەرکوک و موسڵەوە بوو و هەموو کارو ئەرکەکانی بە عادیلە خانم سپاردبوو. دەسەڵاتی عادیلە خانم ئەوەندە مەزن بوو کە بە شاژنی شارەزوور نێو دەبرا. دەسەڵاتی کۆلۆنیالی بەریتانی لە عیراق نازناوی پایەبەرزی هیندی (خان بەهادوری) پێ بەخشیبوو و نوێنەری سەرلەشکری گشتیی بەریتانیا دەچووە خزمەتی و سوپاسی دەکرد و ئینگلیزەکان لە نێو خۆیاندا هەر بە خانم نێویان دەبرد[٧].

ئێدمۆندز باس لە حەپسە خانی نەقیبیش دەکا کە هاوسەری شێخ قادری برای شێخ مەحمودی حەفید بوو و بە ژنێکی زیرەک و نێودار پێناسەی دەکا و دەڵێ لە سیاسەتی ناوچەکەدا ڕۆڵێکی مەزنی دەگێڕا و سەرگەورەی ئافرەتانی شاری سلێمانی بوو. ئافرەتێکی دڵنەرمی ڕەوشت بەرزی زمان شیرینی دەروونپاک بووە. لە ساڵی ١٩٣٠ نامەی بۆ کۆمەڵەی گەلان ناردووە و داخوازی مافەکانی گەلی کوردی کردووە و هەوڵی داوە قوتابخانەیەکی ئێواران بۆ ژنانی کورد لە سلێمانی بکاتەوە و تەنانەت خانوویەکی خۆی لە سەر کۆمەڵەی زانیاری تاپۆ کردووە بۆ ئەوەی بکرێ بە قوتابخانە. یارمەتی کۆماری کوردستانی لە مەهاباد داوە و پێشەوا نامەیەکی پڕ لە ڕێز و سوپاسی بۆ ناردووە.

هەروەها باسی ڕابیعە خانمان بۆ دەکا، کە سەرگەورەی نانەواکان بووە لە شاری سلێمانیدا. بە وتەی ئێدمۆندز ڕابیعە خانم ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە دابینکردنی ناندا لە کاتی قات و قڕی و ئاژاوەدا. دابینکردنی نان خاڵێکی لاوازی هەموو شارەکان بووە لە ڕۆژهەڵاتدا و ئەو ژنە بە شێوەیەک سەرپەرشتی کارەکەی دەکرد کە ڕێگەی بە هیچ کێشە و ئەستەنگیەک نەدەدا. هەروەها باسی فاتیمە خانمی ڕەواندزمان بۆ دەکا کە لە دوای مردنی هاوسەرەکەی کارو باری هەشت گوندی ئەو دەڤەرەی گرتبووە ئەستۆی خۆی و هەموو جۆرە بازرگانیەکیشی دەکرد. خەڵکی دەڤەرەکە ئەوەندە باوەڕیان پێی هەبوو بە نوێنەری خۆیان دایاننابوو بۆ بەشداری کردن لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی عیراقدا هەرچەندە قانونی هەڵبژاردنی سەردەمی

پاشایەتی ئەو مافەی بە ژنان نەدەدا لە هیچ کام لە پلەکانی هەڵبژاردندا بەشدار بن. ئێدمۆندز ئاماژە بەوە دەکا کە هێز و توانایەکی زۆر لە پێکهاتەی ژنی کوردا هەیە و هەمیشە هەوڵدەدەن خۆیان پێشبخەن و لەم بارەیەوە دەڵێ (هەمیشە و لە یەکەم رۆژی دەست بە کاربوونمانەوە لە ناوچە کوردییەکاندا بێ وچان داوامان لێ دەکرا قوتابخانە بۆ کچان بکەینەوە، نەک تەنها لە شار و شارۆچکەکان بەڵکو تەنانەت لە گوندەکانیش). شایەتی ئەوەش دەدا کە تەنانەت لە شارێکی بچووکی وەکو کۆیە کارێکی ئاسایی بوو باوک و دایکێکی رۆشنبیر هیچ تەگەرەیەک لەوەدا نەبین کە کچەکانیان لەگەڵ کوڕاندا لە هەمان پۆل و لە سەر هەمان تەختە لە تەمەنی ١٢ - ١٣ ساڵیدا دابنیشن بۆ ئەوەی فێری خوێندن بن[٨]. ئێدمۆندز لێرەدا باس لە مەلای گەورەی کۆیە دەکا کە لە ساڵی ١٩٢٥ دا کچەکەی خۆی ناوەتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی کوڕاندا. ئەم کارە رەنگبێ بۆ ئەورۆ کارێکی ئاسایی بێ، لێ بۆ ئەو دەمەی کۆمەڵگەی دواکەوتووی کورد و رۆژهەڵات هاوتای شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بووە. هەر بۆیە دەبێ لە چوارچێوەی مێژوویی خۆیدا سەیری بکرێ. پیاوێکی ئاینی و بەنێوبانگ بێ ئەوەی گوێ بداتە بیر و بۆچوونی ئەو سەردەمە و لە شارۆچکەیەکدا کچەکەی خۆی بنێتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی کوڕاندا هەنگاوێکی بوێرانە و مەزن بووە(٩).

یەکێک لە گەڕیدە پێشەنگەکانی ئەوروپایی لە رۆژهەڵات **Pietro Della Valle**، کە لە سەرەتای سەدەی هەڤدەدا چووەتە رۆژهەڵات و لە دواییدا گەشتەکەی لە ساڵی ١٦٥٠ لە رۆما لە ژێر ناونیشانی (گەشتێک بۆ رۆژهەڵات) بڵاو کراوەتەوە، لە رێگەی نێوان بەغدا و کرماشاندا لە کانونی دووەمی ساڵی ١٦١٧ دا گەلێ جار تووشی بە تووشی کوردەوە بووە و بەم شێوەیە باسی ژنانی کوردمان بۆ دەکا (ژنەکانیان بێ روو داپۆشین بە سەربەستی دێن و دەچن و لەگەڵ پیاواندا چ کورد و چ بیانی بە ئازادی گفتوگۆ و هەڵسوکەوت دەکەن)[١٠].

دەتوانم بڵێم زۆربەی هەرە زۆری گەڕیدە و رۆژهەڵاتناس و تەنانەت رۆژنامەوانە ئەوروپاییەکانیش بە شێوەیەک لە شێوەکان دید و بۆچوونێکی لەم جۆرەی دیللا ڤالێیە لە بارەی ژنی کوردەوە دووبارە دەکەنەوە. تۆما بوا، نیکیتین، مێجەر سۆن، ئێدمۆندز، مینۆرسکی، ڤیلچێڤسکی و گەلێکی تر وتەی لەو جۆرە لە مەڕ ژنی کورد تۆمار دەکەن. نەک هەر ئەمە بەڵکو بەلای هەندێ لە رۆژهەڵاتناسانەوە تورک و فارس ژنانی کورد زۆر بە سەربەست دەزانن و پێیان وایە کە ئەوان (کورد) گوایە وەکو ئەوروپاییەکان لە ژیانی خێزانیدا هەڵسوکەوت دەکەن[١١].

ئەم بۆچوونە باس و خواسی زۆر هەڵدەگرێ و لەم بارەیەوە گەلێ پرسیار بێ وەڵام دەمێننەوە. دەبێ هۆی ئەو بارە چی بێ کە گەڕیدە و ڕۆژهەڵاتناسەکان ئاماژەی پێدەکەن بە دەر لەوەی لە سەرەوە باسمان لێوە کرد ؟. ئەگەر ژنی کورد ئەو پێگە و پلەیەی لە کۆمەڵگەی کوردیدا هەبووبێ، چۆن بوو وا لەم یەک دوو سەدەیەی دواییدا بەو جۆرە ترسناکە پاشەکشەی کردووە و تووشی ئەو بارە خراپەی ئێستا هاتووە کە کولتووری باوک و پیاوسالاری هەمموو سنوورەکانی بەزاندووە ؟. ئەم ڕەوتەی ڕووداوەکان بە هەموو سەنگ و پێوانێک دژی لۆژیک و بنەمای زانست و ڕەوتی مێژووە. لە ڕاستیدا ئەمانە و دەیان پرسیاری گرنگی تر لەم بوارەدا پێویستییان بە لێکۆڵینەوەی زانستیی مێژوویی و کۆمەڵناسی و کولتووری هەمەلایەنە و خوێندنەوەیەکی ژنانەی مێژووی کورد هەیە. ئەمەش پێموایە دەبێ یەکێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی بزاڤی ژنانی ئازادیخواز و خوێندەواری کورد بێ.

ئەو ئازادی و سەربەستییەی ژنانی کورد، کە گەڕیدە و ڕۆژهەڵاتناسان باسی لێوە دەکەن هیچیان لە باری سەخت و ژیانی ژنانی کورد کەم نەکردۆتەوە. تۆما بوا کە لە نزیکەوە کۆمەڵگەی کوردەواری ناسیوە باسی ژیانی پڕ لە مەینەتی ژنانی کورد دەکا بە تایبەتی لە گوند و لای هۆزە کۆچەرەکان، کە هەر ئەوان بە خۆیان زیاتر سەرنجی ئەو گەڕیدە و ڕۆژهەڵاتناسانەیان بە سەربەستی و ئازادییان ڕاکێشابوو و بە دەگمەن هەواڵ و زانیاری لە سەر ژنانی کورد لە کۆمەڵگەی داخراوی شارەکاندا لە بەرهەمی ڕۆژهەڵاتناسان و گەڕیدەکاندا دەبینین. تۆما بوا لە بارەی ژیانی ژنانی کوردی لادێوە دەڵێ (ژنانی کورد لە کاتژمێری پێنجی بەیانییەوە لە سەر پێن و خەریکی کارکردنن تاوەکو یازدەی شەو. هەمموو کاری ماڵ تەنها بە کۆڵی ئەمانەوەیە. هەروەها مەڕ دۆشین و کەرە و پەنیر دروستکردن و نانکردن و ئاوهێنان، کە زۆر جار کانی و سەرچاوەکەی چارەکە سعاتێک لە گوندەوە دوورە و هەر دەبێ بە پێ ئەو ڕێگەیە ببڕن، هەر ئەرکی ژنانە. سەرباری هەمموو ئەمانەش دەبێ ژنان سووتەمەنی بۆ ماڵ دابین بکەن. هەڵبەتە چێشت لێنان و خواردن ئامادەکردن و پێگەیاندن و پەروەردەکردنی منداڵیش هەر بە کۆڵی ژنانەوەیە. دوای مردنی پیاوەکانیشیان جێگەیان دەگرنەوە لە ڕابەرایەتی ماڵ و هۆز و تەنانەت لە گۆڕەپانی شەڕیشدا)[١٢].

لێرخی ڕۆژهەڵاتناسیش پێش تۆما بوا بە سەدەیەک لە تەک باسی ئازادی و سەربەستی پەیوەندییە خێزانی و هاوسەرییە بێگەردەکانی ژنانی کورد و باوەڕ و متمانەی پیاوانی کورد بە ژنەکانیان، بەم شێوەیە باس لە ژیانی سەختی ژنان دەکا

(ژنانی کورد لە تەک کاری ماڵدا لە تەک پیاوەکاندا لە کێڵگەکان کار دەکەن و منداڵ بەخێو دەکەن و جل و بەرگ دەدوورن و تەونکاری دەکەن. لە راستیدا ژنی کورد زۆر ئازا و چالاکە. لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا وەکو باوە پیاوان زیاتر لە ژنێ ناهێنن و هاوسەرێتی هەتا هەتاییە لە نێو کورداندا. هەڵبەتە ژیانی خەڵکی کۆچەر و شار لە یەک جودان)(١٣). ئەم رۆڵە مەزنەی ژنانی کورد لە فۆلکلۆر و پەندی پێشینانی کوردیدا رەنگی داوەتەوە و ژن بە کۆڵەگەی ماڵ و قەڵا و رووبار نێو دەبرێ.

ئەگەر لە باسی باری ژنان لە کۆمەڵگەی کۆچەر و گوند و میرنشین و لە نێو خێڵ و عێڵی کوردەوە بگوێزینەوە بۆ کۆمەڵگەی هاوچەرخی مەدەنی و هەوڵی ئەوە بدەین پێگە و رۆڵی ژنی کورد دەستنیشان بکەین و باس لە ژنانی پێشەنگ بکەین لە بوارەکانی خوێندن و پەروەردە و نووسین و بزاڤی ژناندا، دەبێ لە چارەکەی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە دەست پێبکەین.

لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی و لە ساڵی ١٩١٩ بۆ یەکەمین جار، لە گۆر زانیاری و هەواڵەکانی سەرچاوە مێژووییەکان، یەکەمین رێکخراوی ژنانی کورد لە ئەستەموڵ دامەزرێنراوە. کۆمەڵێ لە هاوسەرانی گەورە پیاوانی نێودار و رۆشنبیر و کاربەدەستی کورد لە بەهاری ١٩١٩ دا کۆمەڵەی پێشخستنی ژنانی کوردیان (**Krüt Kadinlari Teali Cemiyeti**) لەو شارەدا دامەزراند. ئەم کۆمەڵەیە لە سێبەری کۆمەڵەی پێشخستنی کوردستاندا (**Kürdistan Teali Cemiyeti**)، کە زۆربەی هەرە زۆری سەرکردە بەنێوبانگ و رۆشنبیرە کوردەکانی ئەو سەردەمەی لە ریزەکانی خۆیدا کۆ کردبووەوە، سازکرا و دەست بەکار بوو. مخابن زانیاری زۆرمان لە بەر دەستدا نییە لە بارەی ئەم کۆمەڵەیەوە. ئەنجوم خانمی هاوسەری مستەفا پاشای یامولکی سەرۆکی کۆمەڵەکە بووە و لە شەوی مەولودی ئەو ساڵەدا وتارێکی بە نێوی کۆمەڵەکە و ژنانی کوردەوە پێشکەش کردووە. دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە لەو سەردەمە زووەی مێژووی رێکخراوەییدا لە نێو کورداندا هەنگاوێکی سەرنج راکێشە. دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە لە سێبەری کۆمەڵەی پێشخستنی کوردستان و بە هانی پیاوانی رۆشنبیری کورد و بە چاولێکردن لە ژنانی گەلانی تری دەوڵەتی ئۆسمانی زۆر لە گەوهەر و نێوەرۆکی مەسەلەکە ناگۆڕن. ئەنجوم خانم دەسپێکی کاری کۆمەڵەکەیان، کە بۆ بەدیهێنانی ئامانجی بەرز و پیرۆز سازکرابوو، بەم بۆنە پیرۆزە بە نیشانەیەکی باش داناوە. ئەنجوم خانم لە وتەکەیدا باس لە برایەتی گەلانی موسوڵمان و خواستی کورد بۆ گەیشتن بە مافەکانی خۆی دەکا و سۆز و

پەیمان دەدا کە کۆمەڵەکەیان هەرچی لە دەستبێ بۆ پێشخستنی کورد و خەبات لە پێناو مافە رەواکانیدا درێخی نەکا. لێرەدا دەکرێ وتەکانی ئەنجوم خانم لەو بۆنەیەدا وەکو پرۆگرامی سیاسی کۆمەڵەی پێشخستنی ژنانی کورد سەیر بکرێن. بەلای ئەنجوم خانمەوە دەبێ کۆمەڵە یارمەتی پێشکەش بە ژنان و منداڵانی کورد بکات، کە بە هۆی کارەساتەکانی شەری یەکەمی جیهانییەوە تووشی مەینەتی زۆر هاتوون و پێویستییان بە یارمەتی و هاریکاری هەیە. ئەو یارمەتییانە بە لای ئەنجوم خانمەوە بریتین لە دۆزینەوەی کار و قوتابخانە و ناوەندی فێرکردن و سەرپەرشتیی بۆ ژنان و منداڵانی کورد. هەروەها زۆری لا مەبەست بووە کە رێکخراوەکەیان کاری زۆر بکات بۆ گەشەکردنی ناسنامەی کوردی و یارمەتیدانی خێزان و ئاوارە کوردەکان لە ئەستەموڵ و شارە گەورەکانی تری دەوڵەتی ئۆسمانی تێکشکاو. هەندێ لە چالاکییەکانی کۆمەڵەی پێشخستنی ژنانی کورد لە سەر لاپەرەی رۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە بە تایبەتی گۆڤاری (ژین) رەنگیان داوەتەوە. لە رێگەی وتارێکی عەبدولعەزیز یامولکییەوە لەو گۆڤارەدا دەزانین کە ئەو رێکخراوەیە کۆبوونەوەیەکی فراوانی بۆ ژنانی کورد لە ئەستەموڵ ساز کردووە بۆ چارەسەرکردنی کێشە خێزانییەکانی کورد بە گشتی و لەو شارەدا بەتایبەتی. هەروەها رێکخراوەکە خەتەنەکردنی منداڵانی نەداری کوردی لە نەخۆشخانەی شیشلی لە ئابی ١٩١٩ دا گرتۆتە ئەستۆی خۆی. لە رێگەی ئەو چالاکییانەوە ئەم رێکخراوەیە هەوڵی دەدا ژنانی کورد بکێشێتە نێو گۆرەپانی خەباتی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە. هەوڵدانی کۆمەڵەی پێشخستنی ژنانی کورد لە بوارەکانی ناسنامەی نەتەوەیی و پەروەرد و فێرکردن و هاریکاری ژنان و زارۆیانی کورددا خەسڵەتی رێکخراوەییەکی ژنانی هاوچەرخیان داوەتە ئەو کۆمەڵەیە. چالاکییەکانی کۆمەڵەی ژنانی کورد بە جۆرێک هەست و سۆزی نووسەران و شاعیرانی ئەو سەردەمەی بزواندبوو کە شاعیری کورد عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری شیعرێکی پر لە سۆزی بە بالای کۆمەڵەدا هەڵداوە. لەیلا خانمی ژنی شەریف پاشا، کە ئەو کاتە لە پاریس بوو، لە لایەن ژنانی کوردی ئەستەموڵەوە بە سەرۆکی شانازی کۆمەڵە هەڵبژێردراوە و ئەویش لە وەڵامدا سوپاسنامەی بۆ کۆمەڵە ناردووە. یەکێک لە نووسەرانی ئەو رۆژانە بەم شێوەیە باسی ئامانجەکانی کۆمەڵەی ژنانی کوردی کردووە (بۆ بەدەستهێنانی پێگەیەکی هاودەم بۆ ژنی کورد و ریفۆرمێکی ریشەیی لە ژیانی کۆمەڵایەتی و خێزانیی لە کۆمەڵگەی کوردیدا و دەستی یارمەتی درێژکردن بۆ ئەوانەی بە هۆی شەری جیهانییەوە بە ناچاری پەراگەندە بوونە و هاتوونەتە ئەستەموڵ و ژیانێکی پر لە

مەینەتی بەسەر دەبەن، کۆمەڵەی پێشخستنی ژنانی کورد دامەزراوە، ڕێکخراوی ژنانی کورد ناوەندێکی کردۆتەوە بۆ ئەوەی ئەرکی کوردایەتی خۆی بەجێ بێنێ)[١٤].

ئەم کۆمەڵەیە وەکو هەموو کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردییەکانی تری ئەستەمولّ لە دوای ماوەیەکی کورت بە هۆی سەرهەڵدانی بزاڤی کەمالییەوە لە کار کەوت و ئەندامەکانی پەرتەوازە بوون و بڵاوەیان لێکرد. هەندێکیان لە تەک هاوسەرەکانیاندا گەڕانەوە بۆ باشووری کوردستان و عیراق و لەوێ لە بواری تردا، بە تایبەتی لە بواری پەروەردە و فێرکردندا، ڕۆڵی بەرچاویان بینی و ئەوانی تر کە لە تورکیا مانەوە خۆیان و هاوسەر و بنەماڵەکانیان کەوتنە بەر شاڵاوی بێبەزەییانەی کەمالیستان و بە ناچاری ژیانی بێدەنگییان هەڵبژارد.

لێکدانەوەی ڕۆڵ و پێگەی ئەم ڕێکخراوەیە لە مێژووی کوردا بە گشتی و مێژووی بزاڤی ژنانی کوردا بە تایبەتی و بەسەرهات و چارەنووسی ئەندامەکانی باس و خواسی زیاتر هەڵدەگرن کە لێرەدا جێگەیان نابێتەوە. پێموایە یەکێ لە ئەرکە سەرەکییەکانی کۆمەڵ و ڕێکخراوەکانی ژنانی کوردە لەو پرسانە بکۆڵنەوە و پەند لە ئەزموونەکانی وەربگرن.

بوارێکی تری گرنگی چالاکی و هەوڵی ژنانی کورد بواری پەروەردە و فێرکردنە. بە بێ گەشەکردنی ئەم بوارە مەحاڵە ژنی کورد لە کۆت و بەندی سیستەمی پیاوسالاری ڕزگاری ببێ و ئازادیی ڕاستەقینە بە دەست بێنێ. ڕۆڵی ژنانی پێشەنگ لە بواری پەروەردە و فێرکردنی کچانی کوردا تا بڵێی مەزنە و هاوتای شۆڕشێکی کۆمەڵایەتییە. بە بێ خستنە رووی ڕۆڵی ئەم پەری و پەریزادانە، بە وتەی زانای گەورەی کورد دکتۆر کەمال مەزهەر، ناکرێ باس لە بزاڤی ژنانی کورد بکرێ. ئەمانە ئەو مۆمە داگیرساوانە بوون کە شەوەزەنگی تاریکی کۆمەڵگەی کوردییان ڕوون دەکردەوە. فاتیمە محێدین یەکەمین ژنی کوردی باشووری کوردستانە کە بۆتە مامۆستا و سی و پێنج ساڵی تەمەنی خۆی بۆ فێرکردنی کچانی کورد لە شاری سلێمانیدا تەرخان کردووە. فاتیمە محێدین و گوزیدە خانمی هاوسەری عەبدولعەزیز یامولکی، ئەو دوو ژنە کوردە بوون کە زەنگی کاروانی خوێندنی کچانیان لێخست لە شاری سلێمانی. یەکەمین قوتابخانەی کچان کە هەر بە ناوی فاتیمە محێدینەوە نێونرا (ئەلزەهراء - ئاماژەیە بۆ فاتیمەتولزەهرای کچی پێغەمبەر) لە ساڵی ١٩٢٥ لە شاری سلێمانی کرایەوە. ئەم قوتابخانەیە لە لایەن ئەحمەد بەگی تەوفیق بەگی ڕۆشنبیر و هاوسەری فاتیمە خانەوە کرایەوە. لە نزیکی

مزگەوتی گەورە بوو و لە ساڵانی هەفتادا قوتابخانەی گوڵاڵەی کچان لە جێگەی ئەو قوتابخانەیە بوو. گوزیدە خانم بەڕێوەبەر و فاتیمە خانم تەنها مامۆستا بووە لە قوتابخانەکەدا. گوزیدە خانم ژنە کوردێکی باکوری کوردستان بووە و فاتیمە خانم بە ژنێکی پێگەیشتووی داناوە و دەمێکی ژیانی لە ئەستەمول بردۆتە سەر کە ئەو کاتە بە ناوەندی سەرەکی رۆژهەڵات دەژمێردرا و لە چاو باژێڕێکی وەکو سلێمانی گەلێ بە پێشکەوتوو دادەنرا. هەروەها ((گوزیدە خانم یەکێ بووە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی پێشخستنی ژنانی کورد لە ئەستەمول و دوای گەڕانەوەی هاوسەرەکەی بۆ باشووری کوردستان لە بواری پەروەردە و فێرکردندا کاری کردووە). لە بارەی کردنەوەی ئەو قوتابخانەیەوە فاتیمە محێدین دەگێڕێتەوە (کە خەڵکی پاشکەوتوو کەوتنە قسە و قسەلۆک لێ گوزیدە خانمی دنیادیتە هانی دەدام گوێ بەو قسانە نەدەم و لە سەر کار بەردەوام بم. ئەگەر ئەو نەبوایە رەنگبێ زوو دەستم لە کار هەڵبگرتایە). بەلای خەڵکەوە کچان لە قوتابخانەدا عابا و پێچەیان دادەکەند، ئەوەش ئەو کاتە بە کوفرێکی گەورە دادەنرا. دایکان بە ترس و لەرز و دڵەڕاوکێوە کچەکانیان دەهێنایە قوتابخانە و هەردوو مامۆستا هەزار سوێندیان بۆیان دەخوارد کە کچەکانیان بە خوێندن و فێرکردن لەکەدار نابن. تاوەکو پەنجاکان و بگرە شەستەکانیش بە لای گەلێ کەسەوە لە هەندێ ناوچە و دەڤەری پاشکەوتووی کوردستاندا قوتابخانە (زانستی شەیتانی) فێری منداڵان دەکرد، بۆیە پێیان وابوو نابێ کوڕەکانیان، با باسی کچان لەولاوە بوەستێ، بنێنە بەر خوێندن لەو قوتابخانانەدا. هەڵبەتە کۆڵکە مەلاکانی کوردستان کە زوو هەستیان بەوە کرد، کە ئەم قوتابخانانە جێگەیان پێ لەق دەکەن، سەدان قسەی پڕوپووچ و درۆ و دەلەسەیان لە بارەی قوتابخانە و پرۆگرامەکانی خوێندنەوە لە نێو خەڵکدا بڵاو دەکردەوە. لە بەر رۆشنایی ئەو بارە دواکەوتووەی کۆمەڵگەی کوردەواری دەبێ هەوڵ و کۆشش و قوربانی ئەم پەریزادانە بنرخێنین.

لە پۆلی یەکەمینی یەکەمین قوتابخانەی کچاندا کچی وا هەبوون تەمەنیان ٢٠ و ٢٥ساڵ دەبوو. فاتیمە خان دەڵێ کچان زۆر باش هەوڵیاندەدا فێری خوێندن بن. هەر بەوەش کار نەوەستا بەڵکو دوای ماوەیەکی کورت شاگردانی قوتابخانەی (زەهرا) شانۆگەری (دایک) یان پێشکەش کرد. خوشکی فاتیمە خان بەهیجە خانم و شەفیقە سەعید، کە ئەمانیش دوو پێشەنگی تری کاروانی پڕ لە سەروەری پەروەردە و فێرکردن بوون لە باشووری کوردستان رۆڵیان لەو شانۆگەرییەدا بینیوە. سەدان و بگرە هەزاران کچی کورد لە بەر دەستی ئەمان فێری خوێندن و نووسین

بوون و له شـەوە زەنگی تاریکی نەخـوێندەواری رزگـاریان بوو. ئەو ژنانە هەوڵی هۆشیـار کردنەوەی ژنان و کۆمەڵگەیان دەدا و له رێگەی ئەو شانۆگەرییەوە لە دژی خـوو و نەریت و دیاردەی خـراپ وەکـو داو دەرمـانی عـەتار و سـەرتاش و فـاڵچی خـەباتیـان دەکـرد. سـەدان ژنی گـەڕەک و دایکانی قـوتابیـان هاتوونەتە دیتنی ئەو شانۆگەرییە. گوزیدە خانم سێ ساڵ بەڕێوەبەرایەتی کرد و دوایی چووەتە بەغدا. لە دوای ئەو زەهرە خانمی کچی مستەفا پاشای یامولکی دەوروبەری سێ ساڵ بوو بە بەڕێوەبەر و دوای ئەویش نزیکی سی ساڵ فاتیمە محێدین بۆ خۆی بەڕێوەبەرایەتی ئەو قـوتابخـانەیەی کـرد. یەکێک لە گـەورەترین هاندەران و پشـتگیـرانی فـاتیـمـە محێدین شاعیـر و رووناکبیری گەورەی کورد پیرەمێرد بووە کە بە فاتیمە خانمی گوتبوو : ئافەرین، هەزار جار ئافەرین ئێوە سەری ئێمەتان بڵند کردووە[١٥].

سەدان سەربازی ونی وەکو فـاتیمە محێدین و گوزیدە خانم و بەهیجە خانم و شەفیقە خانم هەن کە دەبێ رێکخراوانی ژنانی کورد وەبیریان بهێننەوە و کەڵک لە ئەزموونە دەوڵەمەند و پڕ لە شانازییەکانیان وەربگرن.

لە کاتی شەڕی دووەمی جیهانیدا کە قات و قڕی و گرانیی باڵی رەشی بە سەر ژیانی هەژاراندا کێشابوو، ژنانی سلێمانی هەنگاوێکیـان هەڵێنا کە تاقانە بوو لە سەرانسەری عیراقدا. وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی و وەزارەتی نێوخۆ لە ساڵی ١٩٤٢ داوایان لە خەڵک کردبوو کە لە هەمـوو لیواکان کۆمەڵە و رێکخراوی باربوو سازبکەن بۆ یارمەتی و کۆمەکی هەژاران. تەنها لە شاری سلێمانی لێژنەیەکی ژنان بۆ ئەو ئامـانجـە دامـەزرێنرا بە سـەرۆکـایەتی سـەعـدیە خـانمی هاوسـەری مـسـتـەفـا قـەرەداخی کـە ئەو کـاتـە مـوتەسـەریفی شـار بوو. لێـژنەکـە ئەم ژنانەی لە ریزەکـانی خۆیدا کۆکردبۆوە (حەپسـە خـانی نەقیب هاوسـەری حەفـیـدزادە شێخ قـادر، بەهیـیـە خانم هاوسەری حەفیدزادە شێخ مەحمود، زەهرە خانمی هاوسەری عیزەت عوسمان، رەحـمەخـانمی هاوسـەری مـیـرزا فـەتاح، شـوکریە خـانمی هاوسـەری جەمـیل رەشـیـد، سەدیقە خانمی هاوسەری حەمەئاغـای ئەورەحمان ئاغـا، مەلیـحە خانمی هاوسەری عـەبدوڵا نوری، فـاتمەخانمی هاوسەری حاجی مەلا محێدین، فاتمە خانمی هاوسـەری قادر ئاغـای حاجی مەلا سەعید، ئەختەر خانمی هاوسەری حاجی حەمە ساڵح بەگ، فـاتمە خـانمی هاوسـەری حاجی برایم ئاغا، بەهییـە خـانمی کـچی سـەعـید ئەفـەندی عـوسمـان ئاغـا، ئامینە خانمی هاوسەری مستەفا (راستتر ئایشە خانم)، فـاتیـمە خانمی هاوسـەری میرزا کەریمی حاجی شەریف). ئەمانە ژنانی نێوداری شار بوون و تەنها شاریش سلێمـانی بوو کە ژنانی بە دەنگی بانگەوازەکەی وەزارەتی کـاروباری

کۆمەڵایەتییەوە هاتبوون و لە هەموو شارەکانی تری عیراقدا لیژنەکان تەنها لە پیاوان پێکهاتبوون[١٦].

رەوشەن خانمی هاوسەری میر جەلادەت بەدرخانیش جێگەیەکی تایبەتی هەیە لە مێژووی پڕ لە شانازی ژنانی کوردا لە سەدەی بیستەمیندا. رەوشەن بەدرخان لە ١١ تەمموزی ١٩٠٩ لە شاری قەیسەری لە تورکیا هاتۆتە دونیاوە. ئەو کاتە ساڵح بەدرخانی باوکی دوورخرابۆوە بۆ ئەو شارە. چوار ساڵی تەمەنی منداڵی لە ئەستەمول بردۆتە سەر. لە ساڵی ١٩١٣ دا بەدرخانیان جارێکی تر دەکەونە بەر شاڵاوی کاربەدەستانی تورکە لاوەکان و دوور دەخرێنەوە. رەوشەن خانم لەگەڵ باوکیدا لە شام دەگیرسێنەوە و لەوێ باوکی دەیباتە بەر خوێندن و لە دواییدا دەبێ بە یەکێ لە مامۆستا پێشەنگەکانی ژن لە هەموو وڵاتی سوریادا. لە ساڵی ١٩٣٥ دەبێ بە هاوسەری میر جەلادەت بەدرخان و هەڤدە ساڵ پێکەوە ژیانی هاوسەرێتی بەسەر دەبن. لە ساڵی ١٩٥١ جەلادەت بەدرخان کۆچی دوایی دەکا و رەوشەن خانم بە دوو منداڵەوە بەجێ دێڵێ. رەوشەن خانم گەلێ چالاک بووە لە بزاڤی ژناندا و هەوڵی دەدا مافەکانیان بپارێزێ و یەکەمین و تەنها ژنی کورد بوو کە بەشداری لە کۆنفرانسی (دژی کۆڵۆنیالیزم) کرد لە وڵاتی یۆنان لە ساڵی ١٩٥٧، هەرچەندە شەش جێگە بۆ ژنانی کورد تەرخان کرابوون. شۆڤێنیستانی گەلانی سەردەستە لەو کۆنفرانسەدا گەلێ شەڕیان پێ فرۆشت، لێ رەوشەن خانم کەسایەتی خۆی بە سەر هەموو لایەکدا سەپاندبوو و زیرەکانە روو بە روویان دەبووەوە. رەوشەن خان لە بواری نووسین و وەرگێڕانیشدا رۆڵێکی باشی هەبوو بۆ یارمەتیدانی کچان و ژنانی کورد و عەرەب لە سوریا. زیاتر لە دە کتێبی، کە یا بە خۆی نووسیبوونی یا وەریگێڕابوون لە بوارە جیاوازەکانی پەروەردە و ئەدەب و مێژوو و یادداشتدا بڵاوکردۆتەوە[١٧].

یەکێک لە لایەنە لاوازەکانی چالاکی ژنانی کورد بواری رۆژنامەگەرییە. هۆیەکانی ئەم دواکەوتنەی ژنانی کورد لە کاروانی رۆژنامەگەریدا زۆرن. بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری لە نێو ژنانی کورد و دواکەوتوویی کۆمەڵگەی کوردی لایەنێکی ئەم بارە روون دەکەنەوە و لایەنەکەی تریشی پەیوەندی بە رەوتی خودی رۆژنامەگەریی کوردییەوە هەیە. سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە بابەتەکانی یەکسانی ژن و پیاو و مافی ژنان یەکێ لە بابەتە گەرم و پێشینەکانی رۆژنامەگەری کوردی بوونە. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەو نووسینانەی لە سەر مافی ژن و داخوازی یەکسانی لە نێوان ژن و پیاودا و گرنگیدان بە خوێندن و پێشکەوتنی

ژنان کە لە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان بە نێوی کچان و ژنانی کوردەوە بڵاو کراونەتەوە تاوەکو هەفتاکانیش لە لایەن پیاوانی ڕۆشنبیری کوردەوە نووسراون. ئەم نووسەرە پیاوانە بەم کارەیان لە لایەکەوە بەرگرییان لە مافی ژنان دەکرد و لە لایەکی ترەوە بەم کارەیان هانی ژنانیان دەدا بێنە کۆڕی ڕۆژنامەگەری و نووسینەوە. ڕەنگبێ ئەم ڕاستییە وەڵامێکی بەجێ بێ بۆ ئەوانەی بە هۆی بێ ئاگاییەوە لە مێژوو بە گشتی و مێژووی کورد و بزاڤی ژنانی کورد بە تایبەتی، دەیانەوێ خەتێکی ڕەش بێنن بە سەر هەوڵ و خەباتی پیاوانی ڕۆشنبیری کوردا لە پێناوی مافی ژناندا. گەلێ جار ئەو نووسەرە پیاوانە یەکەمین نێوی خوشک و هاوسەرەکانی خۆیانیان دەخستە سەر وتار و نووسینەکانیان. لە پەنجاکاندا نێو و نازناوی وەکو (کچی کورد، خوشکی ڕاستی، دایکی سۆلاف، خونچە موکریانی، صەبریە محەمەد، ئەدیبە عەلی، پرشنگ، زیبا عەبدولواحید و ڕووناک) لە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان بەرچاو دەکەون. لێ وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەکان ئەو ڕاستییەمان بۆ ساغ دەکەنەوە کە تاوەکو کۆتایی شەستەکان ئەوەی بە نێوی ژنانی کوردەوە بڵاوکراونەتەوە بە خامەی نووسەرانی پیاوی کوردی وەکو (فایق هوشیار، قانع، گیوی موکریانی، کاکە مەم بۆتانی، مومتاز حەیدەری، خالید دلێر، مستەفا ساڵح کەریم... تاد) بوونە[١٨].

هەڵبەتە لێرەدا زیاتر باس لە باشووری کوردستان دەکەین چونکە زانیاری و بەڵگەکانی بەر دەستمان زیاتر لە بارەی ئەو بەشەوەیە و باری بەشەکانی تری کوردستان هەندێ جیاوازە.

لە شەستەکان و هەفتاکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەی ژنانی قەڵەم بە دەستی کورد لە هەڵکشاندا بوو. ژمارەیەک لە کچانی کورد دەچنە دەرەوەی وڵات بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا و دوای گەڕانەوەیان بۆ وڵات سەرباری کاری مامۆستایەتی لە زانکۆکاندا گەلێ نووسین و لێکۆڵینەوە بڵاو دەکەنەوە و لە بواری بەرگریکردندا لە مافی ژنان و گەشەکردنی بزاڤی ژناندا جێ پەنجەیان تا ئاستێک دیارە. لە کۆتایی هەشتاکان و بە درێژایی نەوەدەکان لە باشووری کوردستان و تا ئەندازەیەک لە دەرەوەی وڵاتیش بە هۆی پەیدابوونی دەیان ڕۆژنامە و گۆڤار و دەزگای ڕاگەیاندنەوە دەیان و بگرە سەدان نووسەر و ڕۆژنامەوانی ژنی کورد پەیدا بوونە و چالاکانە لە هەموو بوارەکاندا کار دەکەن و لە ڕیزەکانیاندا ژنانی نووسەر و توێژەری بە توانا و چالاک پەیدا بوونە. جێگەی دڵخۆشییە کە ڕێژەی کچانی زانکۆکانی باشووری کوردستان لە گەلێ ناوەندی خوێندندا ڕێژەی کورانی

بەزاندووە. بە سەدان هەزار کچی کورد دەچنە قوتابخانە و بە هەزاران مامۆستا و دوکتۆر و پارێزەر و ئەندازیار و رۆژنامەوان و مافناس ... تاد پەیدا دەبن. هەوەرها دەیان رێکخراوی ژنان دەست بە کارن و هەوڵی پێشخستنی ژنانی کورد و کۆمەڵگەی کوردی دەدەن. بە هەزاران کچان و ژنانی کوردیش لە خەباتی سیاسی گەلەکەیاندا لە دژی داگیرکەران بەشدارییان کردووە و بەشداری دەکەن. سەدان هەزار ژن و کچ و منداڵی کورد بوونە قوربانی سیاسەتەکانی جینۆساید و پاکتاوکردنی نەژادی و وێرانکردنی کوردستان، کە لە لایەن سوپای داگیرکەرانەوە لە هەموو بەشەکانی کوردستان پەیڕەو دەکرێن. بە هەزارانیش لە زیندانە تاریکەکانی ئەو رژێمانە توند کران یا زیندەبەچاڵ کران و سەدان ژن و کچی کورد لە سێدارە دران و دەستدرێژییان کراوەتە سەر. لەم بوارەدا ناکرێ ئاماژە بە لەیلا قاسم و سەدانی وەکو ئەو نەکەین کە ژیانیان لە پێناوی گەلەکەیاندا پێشکەش کرد.

کە باسی ژنی کورد دەکرێ ناکرێ ئاماژە بە لەیلا زانا ناکرێ. پێموایە لەیلا زانا بۆتە سیمبولێکی زیندووی ژنی کورد لەم سەردەمەدا. گەشتی ژیانی لەیلا زانا و ئەزموون و خەباتی لە پێناو کۆمەڵگەیەکی ئازادا ئەوە دەهێنن کە ژنانی کورد لێی ورد ببنەوە. من بۆ خۆم مەزنیی لەیلا زانا نەک تەنها لەوەدا دەبینم کە نێودارترین زیندانیی سیاسی ژنی کوردە، بەڵکو بەلای منەوە ئەو راستییە زۆر گرنگە کە لەیلا زانا وەستایانە ئازادی ژنان و پیاوان و کۆمەڵگەی کوردی پێکەوە گرێدەدا. مەینەتییەکانی ژنی کورد و کۆمەڵگەی کوردیی لە باری سەختی کوردستان و ژێردەستەیی گەلی کوردا دەبینێ. لەیلا پابەندە بە بەها نەتەوەییەکانەوە و ئازادی و سەربەستی خۆی وەکو ژنێکی چەوساوە و زۆرلێکراو بە ئازادی گەلەکەیەوە گرێدەدا. پێموایە ئەم پابەندییە زۆر گرنگە بۆ ئەو ژنانەی دەیانەوێ لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا رۆڵی پێشەنگ ببینن و ژنانی نەخوێندەوار و بێدەرەتان و هەژاری کورد لە گوتار و دروشمەکانیان تێبگەن.

لەیلا زانا هەڵگری هەمان ئاڵای خەباتی لەیلا قاسمە. لەیلا قاسم بەدەستی بەعس لە ١٩٧٤ لە سێدارە درا و بوو بە سیمبۆلی ژنی شۆڕشگێڕی کورد. نێوی هەردوو لەیلا بە سەر زمانی کوردەوەن. لە بەر کۆمەڵێ هۆ کە پەیوەندی بە باری میدیا و شۆڕشی زانیارییەوە هەیە لەیلای یەکەمین، هەرچەندە ژیانیشی بەخت کرد، ئەوەندەی لەیلای دووەمین لە جیهاندا نێوی دەرنەکرد.

لەیلا زانا کچێکی کوردی لادێی بوو وەکو ملیۆنەها کچانی گوندیی کوردستان. لەیلا زانا لە ساڵی ١٩٦١ لە گوندی باخچەی سەر بە دیاربەکر هاتۆتە دونیاوە.

وەکو هەمـوو کـچـانی گـوندێکی دابڕاو لە جیـهـان ژیانی منداڵی بە سـەر بردووە، هەرچەندە لەیلا لە منداڵییەوە بە ئاسانی بە زۆر شت قایل نەبووە. تەنها بۆ نموونە ئەو دژی ئەوە بـوو کە سـەرپۆش و لەچک دابنێ. لێ لە دواییدا لە کاتی هەڵـمـەتی هەڵبژاردنەکاندا پێی گران نەبوو لەچک لە سەر بکا بۆ ئەوەی بتوانێ لە ژنانی کورد لە گوندەکان نزیک ببێتەوە و گوێبیستیان بێ و گوێبیستی بن و خەون و ئاوات و رازەکـانی خۆیانی بۆ بدرکێنن. لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بە شوودرا بە خزمـێکی باوکی کە بیست ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو. هەرچەندە لە دژی ئەو بڕیارەش ڕاپەڕی بەڵام لە دواییدا ناچار کرا ملکەچ بێ چونکە کـچی گـوند و تەنانەت شـاریش لەو کـاتەدا بۆی نەبوو لە دژی بڕیاری باب و برا و خـزمـان راوەسـتێ. مـەهدی زانای هاوسـەری پیـاوێکی سیـاسی بوو و لە سـاڵی ١٩٧٦ لە لایەن خـەڵکی ئامـەدەوە (دیاربەکر) بە سەرۆکی شارەوانی ئەو شارە هەڵبژێردرا. ئەو هاوسەرێتییەی بووە هۆی تێکەڵاوبوونی راستەوخۆی لەگەڵ سیاسەتدا. لە بارەی ئەو شووکردنەوە دەڵێ (لەو بارەیەوە نەکـەس و کـارم و نە هاوسـەرەکـەم تاوانبـار دەکـەم، بەڵکو باری کۆمەڵایەتی و خو و نەریتی کۆمەڵگەکەم تاوانبار دەکەم و رەخنە لەو خوو و نەریتانە دەگـرم و داوای گـۆڕانیـان دەکـەم). بەو شـێـوە دروسـتـە لەیلا دیاردەکـان و نەخۆشییەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری شی دەکاتەوە و هەڵوێستیان لە بەرامبەر دەگرێ و داوای گـۆڕانیـان دەکا. لەیلا دایکی کـوڕ و کـچـێکە بە نێـوی روناهی و رووکەن. کودەتای سەربازی ١٩٨٠ ژیانی لەیلا و هەزارانی تری وەکو ئەوی سەر و بن کرد. کودەتاچییەکان کەوتنە گیانی کورد و هێزە چەپەکان. هاوسەرەکەی گیرا و بە ٣٠ ساڵ زیندانی سزا درا. لەیلای دووگیان بە کوڕێکی پێنج ساڵانەوە بە دووی هاوسەرەکەیدا ئەم شار و ئەو شاری تورکیای دەکرد. خۆی فێری تورکی کرد و هەر بە خۆیشی لە دەرەوەی قـوتابخانە خۆی فێری خوێندن کـرد و پەنای بۆ کـەس و کـار نەبرد و یەکـەمین ژن بـوو کـە لە تاقـیکردنەوەی ناوەندیدا بە بێ ئەوەی بچـێـتـە قـوتابخـانە دەرچێ. هەر لەو کـاتەدا لە نێـو ژناندا بە تایبـەتی کـەس و کـاری زیندانییەکاندا نێوی دەرکرد و تەنانەت بوو بە وتەبێژیان. لە هەمان کاتدا هەمیشە خەریکی خوێندنەوە بوو تا گەیشتە ئەو پلەیەی کە بتوانێ بۆ رۆژنامەکان بنووسێ و ببێتە بەرپرسیاری بیرۆی رۆژنامەی (**Yeni Ülke**) لە دیاربەکر. لە ساڵی ١٩٩١ لە سـەر لیسـتی پارتی دیموکـراتی (**DP**) بۆ پەرلـەمـانی تورکـیا هەڵبـژێردرا. یەکـەمین ئەندام بوو لە مێژووی ئەو پەرلەمانەدا کـە لە سەر پادیۆمـەکەیەوە بە کوردی قسـە بکات. لە سـاڵی ١٩٩٤ لەیلا زانا لە زیندان توند کـرا و بە ١٥ سـاڵ زیندانـی سزا

درا. به هۆی فشاری بیروڕای جیهانییەوە دەسەڵاتدارانی تورک ویستیان بە هۆی باری تەندروستییەوە ئازادی بکەن، لێ لەیلای خاوەن هەڵوێست و ئازا ئەوەی رەت کردەوە و رایگەیاند کە ئەو لە پێناوی دۆزێکی نەتەوەییدا لە زیندانە و بە بێ ئازادکردنی هەڤاڵەکانی و چارەسەرکردنی دۆزی گەلەکەی ئازادی تاکە کەسیی خۆی ناوێ[19].

هیچ گومان لەوەدا نییە کە سەدان و بگرە هەزاران نموونەی ژنی بە ئەمەکی کوردمان لە هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و رۆشنبیری وÖ تاد دا هەیە کە تاوەکو ئێستا ژیان و ئەزموونەکانیان چاوەڕوانی خامەی نووسەرانن بۆ ئەوەی لێیان بکۆڵنەوە و تیشکیان بخەنە سەر بۆ ئەوەی ژنانی ئەوڕۆ پەند لە ئەزموونەکانیان وەربگرن. ئەنجامدانی ئەم کارەش یەکێ لە ئەرکە سەرەکییەکانی رێکخراوەکانی ژنان و ژنە قەڵەم بەدەستەکانی کوردە.

### سەرچاوە و پەراوێزەکان


(١) توماس بوا، تاريخ الأكراد، ترجمة محمد تيسير ميرخان، دمشق ٢٠٠١، ص ٢١

(٢) شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی، هەژار کردوویە بە کوردی، نەجەف ١٩٧٢، ل ١٠٠

(٣) ئێ. ئی. ڤاسیلێیڤا، باشووری رۆژهەڵاتی کوردستان لە سەدەکانی حەڤدە و سەرەتای سەدەی نۆزدە، مۆسکۆ ١٩٩١، ل ١٢ (بە زمانی رووسی).

(٤) شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی، هەمان سەرچاوە، ل ٥٠٣، ٥١٤. : هەروەها بڕوانە: محمد أمين زكي، تاريخ الدول والأمارات الكردية في العهد الأسلامي، عربه وراجعه محمد علي عوني، القاهرة ١٩٤٨، ص ٤٠٥

(٥) ب. ليرخ، دراسات حول الأكراد وأسلافهم الخالديين الشماليين، ترجمة د. عبدي حاجي، حلب ١٩٩٤، ص ٢٤

(٦) سون، رحلة متنكر الي بلاد مابين النهرين و كردستان، نقله الي العربية وحققه وقدم له وعلق عليه فؤاد جميل، الجزء الأول، بغداد ١٩٧٠. ص ٢٨٠ – ٢٨٢

(٧) سي. جي. ادموندز، كرد و ترك و عرب – سياسة ورحلات و بحوث عن الشمال الشرقي من العراق ١٩١٩ – ١٩٢٥، ترجمة جرجيس فتح الله، بغداد ١٩٧١، ص ٥٢.

(٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨، ٨٣.

(٩) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: مەسعوود محەمەد، گەشتی ژیانم، ستۆکهۆڵم ١٩٩٢.

(١٠) رحلة ديللافاليه الي العراق، ترجمة وتحقيق الأب بطرس حداد، بغداد ٢٠٠١. ل ١٠٤.

(١١) ب. ليرخ، المصدر السابق، ص ٣٨.

(١٢) توماس بوا، نفس المصدر، ص ٤٦، ٥٠.

(١٣) ب. ليرخ، نفس المصدر، ص ص ٢٤ – ٢٥،

**(14) Ismail Güldas Kürdistan Teali Cemiyeti, Istanbul 1991, S77-80, 272-278.**

(١٥) دكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی كورد، بەرگی یەكەم، عەلی شێر كردوویەتی بە كرمانجی و پیتی لاتینی، ستۆكهۆڵم ١٩٩١، ل ٢١٦ - ٢٢٢.

(١٦) دكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی كورد، بەرگی دووەم، ئامادەكردنی عەبدوڵا زەنگەنە، هەولێر ٢٠٠١، ل ٣٦٩ - ٣٧٤.

(١٧) سلمان عثمان (كونی رە ش)، الأمیر جلادت بدرخان - حیاته وفكره، تقدیم الأمیرة روشن بدرخان، دمشق، ١٩٩٢. ص ٨٥ -.

(١٨) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د. كوردستان موكریانی، رەنگدانەوەی دۆزی ژن بە نێوی ژنەوە لە نێو رۆژنامەگەری كوردیدا، هێرن فەین ١٩٩٥

(١٩) بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی لەیلا زاناوە بڕوانە: د. جەبار قادر، چەند بابەتێكی مێژووی كورد، سلێمانی ١٩٩٩، ل ١٦١ - ١٧١.

## ملخص بحث

# المرأة الكردية في التاريخ

أ. د. جبار قادر
عضو عامل في الاكاديمية الكردية

تعاني الدراسات التاريخية الكردية من قصور واضح في دراسة وتحليل الجوانب الاقتصادية والاجتماعية والثقافية من تأريخ الشعب الكردي. ويمكننا القول بأن مكانة المرأة ودورها في المجتمع الكردي في مسار هذا التأريخ تشكل إحدي الصفحات الاكثر فقرا في الدراسات التاريخية الكردية. مألة الأهتمام بالتاريخ السياسي علي حساب التاريخ الأقتصادي - الاجتماعي والثقافي ليست حالة خاصة بالكرد وكوردستان، بل يمكننا القول بأنها عامة تسود الدراسات التاريخية الشرقية عموما ، ولكن في الحالة الكردية وبسبب المسار التاريخي المعقد لهذا الشعب وتركيزه علي النضال من أجل حقوقه القومية خلال القرنين التاسع عشر والعشرين، فإن هذه الجوانب قد اهملت تماما في دراساتنا التاريخية.

رغم ذلك كله يمكننا العثور علي نتف تاريخية في ثنايا مؤلفات المؤرخين وكتب الرحالة الأجانب عن نساء كرديات اضطلعن بدور مشهود في تاريخ هذا الشعب علي مر العصور التاريخية. فقد أشار الأمير شرفخان البدليسي الي بعض هؤلاء النساء في مؤلفه الشهير (شرفنامة).

وألقي الرحالة الاجانب الذين زاروا كوردستان خلال القرون الاخيرة الضوء علي مكانة المرأة الكردية في هذا المجتمع الرقي. كما أشاروا الي الشهيرات منهن ودورهن في تأريخ بعض المناطق والقبائل الكردية، وقد أشرنا في متن البحث الي العديد منهن.

مع نهاية الحرب العالمية الاولي بدأت المرأة الكردية تخطو خطواتها الاولي في حقل الحياة العامة. فقد ظهرت أولي التنظيمات النسوية الكردية التي ضمت في صفوفها زوجات الزعماء المتنورين الكرد في أسطنبول.

في المرحلة التي أعبت قمع الانتفاضات الكردية كرست نخبة من الرائدات جهودهن لتعليم البنات وتربيتهن في المدارس واضطلعن بدور مشهود في اعداد أجيال عديدة من المتعلمات، اللواتي تبوأن فيها بعدا مكانة بارزة في مختلف محالات الحيات الأجتماعية والثقافية والسياسية الكردية.

كما شهد النصف الثاني من القرن الماضي ولادة العديد من المنظمات النسوية التي كانت بمثابة واجهات نسوية للأحزاب الكردية. وفي السنوات الاخيرة برزت مجموعة من المنطقات النسوية التي نضطلع اليوم بدورها في الدفاع عن حقوق المرأة ومساعدتها لنيل مكانتها اللائقة في المجتمع الكردي كما برزت ناشطات وسيدات في شتي مناحي الحياة الكردية.

# دیاردەی بەبیابانبوون لە قەزای چەمچەماڵ پۆلێنکردن و دابەشبوونی جوگرافی*

پرۆفیسۆری یاریدەدەر
د. سلیمان عبدالله اسماعیل

مامۆستای یاریدەدەر
هاوڕێ یاسین محمدامین

بەشی جوگرافیا - کۆلێژی ئەدەبیات
زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر

**پێشەکی:**

دیاردەی بەبیابانبوون (Desertification) یەکێکە لە دیاردە سروشتییەکان، بۆتە جێگای سەرنجی توێژەر و لێکۆڵەرەوەکان بەگشتی و جوگرافیناسەکان بەتایبەتی، لەبەر ئەوەی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەژینگەی جوگرافی مرۆڤەوە هەیە.

بەبیابانبوون بریتییە لە تێکچوونی پلەپلە و بەردەوامی زەوی ناوچەی وشك و نیمچە وشك و نیمچە شێدار، کە دەبێتە هۆی دابەزینی توانای بەرهەمی زەوی و پاشان ناگونجێت لەگەڵ حاڵەتی سروشتی و توانای خاکەکەی، لە ئەنجامی چالاکی نادروستی مرۆڤ و هەلومەرجی ئاووهەوایی و نالەباری ژینگەی سروشتی.

بەبیابانبوون وەك کێشەیەکی جیهانی سەیر دەکرێت، وە تایبەت نییە تەنیا بە وڵاتە دواکەوتوو و تازە پێگەیشتووەکان، بەڵکو لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی وەك ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاو ئوسترالیاو ئیسپانیا و پرتوگالیش هەیە. بە گەڕانەوە بۆ پێناسەی بە بیابانبوون و بەپێی ئەو نەخشەیەی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ ئەگەری بەبیابانبوون کێشاویەتی ڕووبەرێك نییە لەسەر زەوی ئەگەری تووشبوونی بەبیابانبوونی نەبێت، بەشێوەیەك لە شێوەکان و بەئاستێکی دیاریکراو، بۆیە گرفتی بەبیابانبوون بۆتە جێگای گرنگی پێدان لەلایەن حکومەت و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و هەرێمییەکانەوە بەتایبەتی ئەو ڕێکخراوانەی پەیوەندیدارن بە کاروباری کشتوکاڵی و ڕووەکی سروشتی و سەرچاوەکانی ئاو.

---

* ڕێککەوتی وەرگرتن ٢٠٠٩/٦/١٤

دیاردەی بەبیابانبوون لە دوای (گۆڕانی ئاووهەواو و کەمبوونی ئاوی شیرین)، بەسێیەم گیروگرفت لەسەر ئاستی جیهان لە سەدەی (٢١) دادەنرێت، بەشێوەیەك لە ڕاپۆرتی نەتەوە یەکگرتوەکان ئاماژە بەوە دەکات کە شەش یەکی (٦/١) ژمارەی دانیشتوانی جیهان و سێ یەکی (٣/١) وشکانی گۆی زەوی کە بە (٥) ملیۆن هیکتار زەوی مەزەندە دەکرێت، لە بەردەم هەڕەشەی بەبیابانبووندایە(١).

وڵاتی عێراق یەکێکە لەو وڵاتانەی دیاردەی بەبیابانبوون هەڕەشەی ڕاستەوخۆیە لەسەری، چونکە ڕووبەری عێراق بەڕێژەی (٩٢٪)ی خاکەکەی بەشێوەیەك لە شێوەکان لەبەردەم مەترسی بەبیابانبووندایە(٢)و ئەم مەترسییەش ساڵ بەساڵ لە زیادبوون و پەرەسەندندایە، ئەم ڕووبەرە فراوانە هەرێمی کوردستان و ناوچەی لێکۆڵینەوەش دەگرێتەوە، هەروەها بەپێی ئەو نەخشەیەی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ کاروباری ژینگە و پەرەپێدان (UNEP) لە نایرۆبی لە ساڵی (١٩٧٧) پێشکەشی کرد ناوچەی لێکۆڵینەوە لەبەردەم هەڕەشەی بەبیابانبووندایە بەپلەی مامناوەندی و بەهێز، لەبەر ئەوەی ئەگەر بەبیاباتبوون بریتی بێت لە تێکچوونی زەوی ناوچەی وشك و نیمچە وشك و نیمچە شێدار، لە ئەنجامی چەند فاکتەرێکی وەك گۆڕانی ئاووهەوا و چالاکی نادروستی مرۆڤ، ئەوا بەدڵنیاییەوە هەرێمی کوردستان بەگشتی و ناوچەی لێکۆڵینەوە بەتایبەتی بە ناوچەیەکی هەستیارو فشەڵ دادەنرێت لەبەردەم دیاردەی بەبیابانبووندایە. لەم ڕووەوە ناوچە نیمچە شاخاوییەکانی هەرێمی کوردستان بەگشتی ئاماژەی ئەوەی لێ دەرکەوتووە کە دیاردەی بەبیابانبوون لەسەری زۆرە بۆیە (قەزای چەمچەماڵ) وەك نموونەیەك لە ناوچە نیمچە شاخاوییەکانی هەرێمی کوردستانمان هەڵبژارد.

## شوێنی جوگرافی ناوچەی لێکۆڵینەوە:

(قەزای چەمچەماڵ) دەکەوێتە بەشی ڕۆژهەڵاتی پارێزگای کەرکوکەوە، بەشێکە لە ناوچەی نیمچە شاخاوییەکان و دەکەوێتە بەشی ڕۆژهەڵاتیەوە، سنووری سروشتی ناوچەی لێکۆڵینەوە لەە ڕۆژهەڵاتەوە زنجیرە شاخەکانی قەرەداخ و سەگرمە و بازیان وەك سنووری سروشتی جیاکەرەوە لە نێوان ناوچەی شاخاوی و ناوچەی نیمچە شاخاوییەکان، لە باکورەوە زێی بچووك و لە ڕۆژئاواوە بەرزاییەکانی خاڵخاڵان و بانی مقان و عمر ئەولیا، لەباشوورەوە لقەکانی خوارووی ئاوەسپی، لە ڕووی فەلەکییەوە ناوچەی لێکۆڵینەوە دەکەوێتە نێوان هەردوو

بازنەی (٣٥:٠٥° - ٣٥:٥٤°) لە باکوور و هەردوو هێڵی درێژی (٤٤:٣٩° - ٤٥:٢٤°) لـە ڕۆژهـەڵات، ڕووبـەری ناوچـەی لێکۆڵینـەوە دەکاتـە (٢٣٠١کـم[٢]) وە نزیکـەی (١١,٣٪)ی ڕووبـــەری پارێزگـــای کـــەرکوك و (٤٪)ی ڕووبـــەری ناوچـــەی نیمـــچە شـــاخاوییەکان پێکدەهێنێت.(نەخشەی ژمارە ١)

## تەوەری یەکەم / دیاردەکانی بەبیابانبوون لە ناوچەی لێکۆڵینەوە:

ئەم تەوەرە تەرخان کراوە بۆ دیاردەکانی بەبیابانبوون و پۆلێنکردنی ئەو دیاردانەی تایبەتە بە ناوچەکەوە و جۆری دیاردەکان و کاریگەرییان بەپێی زۆری و کەمی لەسەر ناوچەکە و بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی توێژەر پێی هەستاوە بەپشت بەستن بەو زانیارییە مەکتەبی و مەیدانیانەی لەسەر ناوچەکە کراوە، پێش ئەوەی باس لە دیاردەکانی بەبیابانبوون بکەین، پێویستە ئامـاژە بەوە بدەین ڕاڕایی لە باران یەکێکە لە سیماکانی بارانی ناوچەکەو کاریگـەریی هەیـە لەسـەر خێراکردنی دیاردەکانی بەبیابانبوون، بۆیە لێرەدا بەدرێژی بـاس لـە ڕاڕایـی بـاران دەکـەم لـە ناوچەی لێکۆڵینەوە.

ڕاڕایی لە هەندێك ڕەگەزی ئاووهەوا، یەکێکە لە سیما دیارەکـانی ئاووهـەوای ناوچـەکە و کاریگەری لەسەر دووبارە بوونەوەی وشکی و وشکەساڵی هەیە، ئەوەی گرنگە لێرەدا ئامـاژەی بۆ بکەین دیاردەی وشکەساڵییە، لەبەر ئەوەی لـەم ناوچـەیە زۆر دووبـارە دەبێتـەوە، وشـکی دیاردەیەکی سروشتی ئاووهەوایی دووبارە بووەوەیە، بەڵام ناتوانرێت پێشبینی کـات و مـاوەی ڕوودانی و توندوتیژییەکـەی بکرێـت، بـەڵام هەمیـشە چاوەڕوان کـراوە، چـونکە پەیوەسـتە بەفاکتەری گەردوونی لەناو بەرگی گاز و ئاووهەوای سەر زەوی، ماوەو درێژی ڕوودانی وشـکی لەسەر کەمی تێکڕای بارانی ساڵانە ونارێکی بارانەکە وەستاوە، لەڕووی دابەشـبوونی کاتـەوە بەبەراورد بەناوەندی ساڵانە و مانگانە، ئەگەر بڕی بارانی هەر ساڵێك بەڕێژەی (٧٥٪) ناوەندی تێکڕای بارانی ساڵانە کەمتر بێت، ئەوا بەوشکەساڵی مەترسیدار ناو دەبرێت، ئەگەری ڕوودانی ئەم دیاردەیە لە هەموو ناوچەیەکدا هەیە، بـەبێ گوێدانـە جـۆری ئاووهەواکـەی[٣]. هـەروەك ئەوەی لە ساڵی کەژیی (٢٠٠٧-٢٠٠٨) لەناوچەی لێکۆڵینەوە بڕی باران گەیشتە (١٢٥ملم)، واتە بڕی باران لەو ساڵەدا (٧٤,٨٪) کەمترە لە تێکڕای بارانی ساڵانە[٤].

کۆمەڵێك پێوەر هەیە زانایانی ئاووهەوایی بۆ دیاریکردنی وشکی دایانڕشـتووە، زۆربـەیان پشت دەبەستێت بەهاوسەنگی ئاوی (Water balance)،

## نەخشەی ژمارە (١)

## شوێنی جوگرافی و ئەسترۆنۆمی ناوچەی لێکۆڵینەوە




سەرچاوە: کاری توێژەر بەپشت بەستن بە

١- جمهورية العراق- وزارة الدفاع- القوات المسلحة العراقية، المساحة العسكرية، خارطة چمچماڵ، سەنگاو - قادر کرم لە یلان، الطبعة الاولى، سنة ١٩٨٨، مقياس ١: ١٠٠٠٠٠

٢- هاشم یاسین حمدامین وآخرون، المصدر السابق، ص١٤-١٥.

بۆ دۆزینەوەی ڕادەی وشك و برنگی (الجفاف والقحولة) جگە لە کـەمی بـڕی بـاران چـەند ڕەگەزێکی تری ئاووهەوایی وەك تیشکی خۆری بەتین و پلـەی گـەرمای بـەرز و کـەمی شـێی ڕێژەیی و بەهەڵمبوونی بەردەوام ڕۆڵی سەرەکییان هەیە، بۆ دۆزینەوەی پلەی وشـك و برنگـی پەنا بۆ ئەو یاسایە دەبەین، کە هەرسێ ڕێکخـراوی (UNESCO – FAO – WHO ) بـۆ دیاریکردنی نەخشەی بەبیابانبوون لە کۆنگرەی نێودەوڵەتی لە نایرۆبی بەکاریان هێنـاوە بـەم شێوەیەی خوارەوەیە[٥] لە خشتەی (١) ڕوون کراوەتەوە:

D = P/ ETP

D = ٤٩٥,١/ ٢٠٩٣

D = ٠,٢٣

D = ئاماژەی وشك و برنگی

P =تێکڕای بارانی ساڵانە (ملم)

ETP = بەهەڵمبوونی ساڵانە (ملم)

**خشتەی (١) یاسای گشتی بۆ دیاریکردنی بەهای وشك و برنگی**

| بەهای وشکوبرنگی | کەمتر لە ٠,٠٣ | ٠,٠٣ تا ٠,٢ | ٠,٢ تا ٠,٥ | ٠,٥ تا ٠,٧ | ٠,٧ تا ١ | زیاتر لە ١ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ناوچەی ئاووهەوایی | زۆر وشك بیابانی بەتین | وشك | نیمچە وشك | نیمچە شێدار | شێدار | تەڕ (مبلله) |
| ئاماژەی وشکوبرنگی | تائەوپەڕی وشکوبرنگی | وشکوبرنگی | نیمچە وشکوبرنگی | کەمتر لەشێدار | شێدار | تەڕ (مبلله) |

سەرچاوە: د. الیاس جبور، المصدر السابق، ص ٤٨

بەپێی ئەنجامی هاوکێشەکە دەردەکەوێت ناوچەی لێکۆڵینەوە ئاووهەوای نیمچە وشـکە و سیفاتی ئاماژەی نیمچە وشکوبرنگی هەیە.

دیاردەی وشکی دابەش دەکرێت بەسەر چوار جۆردا بریتین لە:

١ – وشکی هەمیشەیی. ٢ – وشکی وەرزی. ٣ – وشکی لەناکاو. ٤ – وشکی نەبینراو.

ئەم دوو جۆرەی دواییان لە هەموویان مەترسیدارترن و تایبەتن بەناوچەی نیمـچە وشـك و نیمچە شێدار وە لەکاتی ڕوودانیدا ناتوانرێت قەرەبووی ئاوی باران بەئاودێری بکرێتەوە (چونکە

خۆمان بۆ ئامادە نەکردووە) و هۆکاری ڕاستەوخۆیە بۆ دروستبوونی جۆرێك لە جۆرەکانی بەبیابانبوون[٦]، جگە لە جۆری یەکەم، هەر سێ جۆرەکەی دواییان لە ناوچەی لێکۆڵینەوە بەئاشکرا بوونی هەیە.

پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، ئەو هۆکارانەی یارمەتی زیادبوونی وشکی دەدات بوونی هەوای دابەزی و، لە دوو مەڵبەندی فراوانی پەستانی بەرزی باکووری خولگەی قرژاڵ و باشووری خولگەی کارژۆڵە لە ناوچەکانی بازنەی پانی (٣٠°) لە باکوور و باشوور کە بەمەڵبەندی پەستانی بەرزی نیمچە خولگەیی گەرم دەناسرێت[٧] و ڕێگرە لەبەردەم هەوای سەرکەوتە، بۆیە لەم ناوچەیە ئەگەر ڕادەی شێ زۆریش بێت، بەڵام بڕی باران کەم دەبێت بەهۆی نەبوونی هەوای سەرکەوتە، هەروەها (پاری Parry) دەڵێت مەڵبەندی پەستانی بەرز، تەنیا لە ناوچەی نیمچە خولگەییدا چڕ نەبۆتەوە بەڵکو دەکشێت بۆ ناوچەکانی دەوروبەریش، بۆیە دیاردەی وشکی دەکشێت تا بازنەکانی ناوەڕاست لە نیوەگۆی باکوور ئەمەش کاریگەری هەیە لەسەر ڕاڕایی ڕێژەی بارانی ساڵانە[٨]، ناوچەی لێکۆڵینەوەش دەکەوێتە ئەم سنوورەوە، کەواتە دەکەوێتە ژێر کاریگەری پەستانی بەرزەوە بەتایبەتی لە دوای وەرزی بەهار، کە بڕی باران کەم دەبێتەوە لەبەر:

- کەمبوونەوەی دووبارەبوونەوەی ئەو سایکلۆنانەی (**المنخفضات الجوية**) لە دەریای ناوەڕاستەوە هەڵدەکەنە سەر ناوچەکە.
- کشانی مەڵبەندی پەستانی بەرز (ئازۆری) لە ئۆقیانوسی ئەتڵەسی بەرەو باکوور.
- هێزو تینی سایکلۆنەکانی دەریای ناوەڕاست لە دوای مانگی ئادار کەم دەبێتەوە بەتایبەتی لە ناوچەکانی باشووری هەرێمی کوردستان و عێراق[٩].

بۆیە خاسیەتی ئاووهەوای کیشوەری سەرپەڕ (**متطرف**) و ماوەی وشکی درێژ و ڕاڕایی و کەمی باران، تەنیا پەیوەست نییە بەئاووهەوای ناوچەی لێکۆڵینەوەوە، هەتا ناوچەی ئەوپەڕی باکووری ڕۆژهەڵاتی هەرێمی کوردستانیش (عێراق) دەگرێتەوە ئەگەر چی بەڕێژەیەکی کەم تربێت[١٠].

ئەوەی لەپێشەوە باس کرا کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر دیاردەکانی بەبیابانبوون هەیە، شان بەشانی فاکتەرەکانی تر (سروشتی و مرۆیی)، بۆیە لە خوارەوە گرنگترین دیاردەکانی بەبیابانبوون لە ناوچەی لێکۆڵینەوە باس دەکەین:

### (١) ڕامالینی خاك:

ڕامالین (Erosion) بریتییە لە گواستنەوەی میکانیکی دەنکۆڵەکانی خاك لە ناوچەی دروستبوونی بۆ ناوچەیەکی تر و جێگیربوونی لەشێوەی نیشتوودا [١١] ، ئەم پرۆسەیەش بە سێ قۆناغ دەبێت.

١. لێك جیابوونەوە و هەڵوەشاندنی دەنکۆڵەی خاك.
٢. گواستنەوەی دەنکۆڵەی خاك لە شوێنی دروستبوونی بۆ شوێنێکی تر.
٣. ٣- نیشتنی دەنکۆڵە گواستراوەکان لە شوێنە تازەکە[١٢].

خاکی ناوچەی لێکۆڵینەوە لە ئەنجامی هەردوو هۆکاری ڕامالینی (ئاوی و هەوایی) تووشی ڕامالین بووە و چالاکی هەر یەکە لەم فاکتەرانە جیاوازە بەپێی تواناو خێراییەکەی و ڕووی زەویەکەی و جۆری پێکهاتەی خاك و ڕووپۆشی ڕووەك و چالاکی مرۆڤ لە ناوچەکەدا، ڕووی زەوی ناوچەکە لەبەر ئەوەی کەوتۆتە سنووری ڕۆژهەلاتی ناوچەی نیمچە شاخاوییەکان و زنجیرە چیایاکانی قەرەداخ و سەگرمەو بازیان وەك سنووری جیاکەرەوەیە لەگەڵ ناوچە شاخاوییەکان، وەبەشی ڕۆژئاوای قەزاکەش لە درێژکراوەی بانی کەرکوك پێکهاتووە، هەروەها ڕووی زەوی ناوچەکە وەك لە بەشەکانی پێشەوە باس کرا، بریتییە لە گردۆلکەو بەرزایی (زوورگ)، بۆیە هەر دوو فاکتەری ئاوی و هەوایی کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە، لەسەر ڕامالینی خاك لە ناوچەکەدا، لە خوارەوە دیاردەی ڕامالین بەهەردوو جۆرەکەیەوە بە وردی باس دەکەین:

**یەکەم / ڕامالینی ئاوی (Water Erosion)**: بریتییە لە ڕامالینی بەشی سەرەوەی خاك لە چینی (A)، کە زۆر بەسوودە بۆ کشتوکاڵ، بەنەمانی ئەم چینە ڕەگەزەکانی پیتی خاك و مادە بەسوودەکانی ئاوی زۆر کەم دەبێتەوە و دەگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر، لە کاتی گواستنەوەی بەشە ڕامالراوەکەی، ئەگەر لەسەر زەویی چێندراو بنیشێت دەبێتە هۆی خراپکردن و لە ناوبردنی بەرهەمەکە، ئەگەر نەچێندراو بوو ئەوا مادە ڕامالراوەکە لە هەر ناوچەیەك بنیشێت کار دەکات لە گۆڕینی خاسیەتەکانی خاکی ئەو ناوچەیە[١٣]، کرداری ڕامالینی ئاوی لە ناوچەی لێکۆڵینەوە بەڕێژەیەکی زۆر و ئاشکرا دەردەکەوێت وەکاریگەری بارانی سالانە لەسەر زەوییەکانی ناوچەکە، ڕامالینی قوڕ و لیتە لە ڕێگەی لقە ڕووبارو جۆگاکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ناو ڕووباری ڕووخانە (عوزەیم) وەبڕی نیشتووی ناو ڕووبارەکە لە قوڕ و لیتە سالانە دەکاتە (٠,٤٥ ملم/ساڵ)[١٤]، کرداری ڕامالین لە زەوییە مەیلان و لێژەکان زۆرترە، بەلام لە زەوی تەخت کەمترە.

ڕامالّینی ئاوی لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاّتی ناوچەی لێکۆڵینەوە لە سنووری هەرسێ ناحیـەی سەنتەر و ئاغجەلەر و سەنگاو زۆرە، چونکە تێکڕای ئاستی لێژی خاکەکـەی زۆرە، وەبـەهۆی بەرزی زنجیرە چیاکانی ناوچەکەوە و کەمی ڕووپۆشی ڕووەك بەتایبەتی دارستانی چـڕ ڕێژەکـەی دەکاتە(٥,٤٪)ی دارستانەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە وای کردووە ڕامالّینی بەهێز، لـە شـێوەی کەندرە ڕامالّین (Gully Erosion) لە ئەنجامی ئاوی ڕێکردووی باراناو بەسـەر زەوی و نـاو جۆگەکاندا دروست ببێت، لە ئەنجامی دووبارە بوونەوەی ڕامالّینی بەهێز (شدید) دەبێتە هـۆی دروستبوونی دۆڵی بچووك و لقەکانی وەبەتێپەڕبوونی کات و دووبارەبوونەوەی بارانی بەلێزمەو لە ناکاو، لقەکان جار لە دوای جار پانی و درێژ و ڕووبەرەکەیان زیاد دەکات لەناو دۆڵەکانـەوە بەرەو لاپالّی چیاکان دەکشێت، تادەگاتە حالّەتێك بەکەڵکی کـشتوکالّ نایـەت و لەزەوییـەکی کشتوکالّییەوە دەگۆڕێت بۆ زەوی خراپ (Bad land)[١٥] وە ئەمەش شـێوازێکە لـەدیاردەی بەبیابانبوونی بەهێز.

لە ناوچەی لێژی و لاپالّ و گردۆلکەکان و بەرزایی بانـەکان لـە ئـەنجامی ڕۆیـشتنی ئـاوی باراناو و لافاوی ناوجۆگە وشکەکان بەشێوەی خێراو ناجێگیر بەبڕی زۆر لە ماوەیەکی کورتدا و دابەزینی ئاوی باراناوەکان لە ناوچەی بەرزەوە بۆ ناوچەی نزم لەشێوەی قەڵبەزەدا (شلال صغير) دەبێتە هۆی دروستبوونی ڕامالّین لـەجۆری دووەم بـە ڕامـالّینی خـەتی (Rill Erosion ) دەناسرێت، لەم دۆخەدا ڕامالّینەکە جۆگەلەی بچووك بچووك دروسـت دەکـات. بـەلاّم ئەگـەر لەبـەینی جۆگەلەکانـدا توێژاڵـە ڕامـالّین هـەبێت، ئـەوا پێـی دەوترێـت ڕامـالّینی خـەتی بەینابەین[١٦]. جۆری سێیەم لەو ناوچانەدا ڕوودەدات، کە زەوییەکەیان تاڕادەیەك نزم و تەختـە دەبێتە هۆی ڕامالّینی چینی سـەرەوەی خاکەکـە و بەتوێژاڵـە ڕامـالّین (Sheet Erosion) ناسراوە مەترسی ئەم جۆرەیان لەوەدایە زۆر لەسەرخۆیە و مرۆڤ بەئاسانی هەستی پێ ناکـات، کاتێکیش ڕوودەدات جووتیارەکان وادەزانن پیتی خاکەکەیان کەم بۆتەوە، بۆیـە پەنادەبـەن بـۆ بەکارهێنانی پەین وەئەمەش مەترسییەکە زیاتر دەکات.

ڕامالّینی ئاوی بەهەر سێ جۆرەکەیەوە لە ناوچەی لێکۆڵینەوە بەئاشکرا دەردەکـەوێت[١٧]. جۆری بارانیش کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر ڕامالّین، وەك لە بەشی دووەمدا باس کـرا، بارانی ناوچەکە لە جۆری گەردەلوولە باران و بەرزونزمە بارانە هـەر دووکیـان هۆکـارێکن بـۆ ڕامالّینی خاك، لەبەر ئەوەی ناوچەی لێکۆڵینەوە کەوتۆتە ناوچەی ئاووهەوای نیمچە وشکەوە، بۆیە بارانەکەی لە ماوەی کورت و بەبڕی جیاوازو لەناکاو دەبێت و جاری وا هەیە لـە مـاوەی چەند سەعاتێکدا ئەوەندە باران دەبارێت زیاترە لەوەی لە ماوەی مانگێکدا دەبارێت بۆ نموونـە

بڕی ئەو بارانی لە ڕۆژی (٢١/١٢/٢٠٠٠) باریوە گەیشتە (٨٢,٥ ملم) لە کاتێکدا تێکڕای بارانی مانگی کانوونی دووەم دەکاتــە (٩١ملـم)[١٨]، ئەمــەش هۆکـارێکی ڕاستـەوخۆیە بـۆ دروستبوونی ڕامالێن بەهەرسێ شێوەکەیەوە، سەرەڕای ئەمەش گەورەیی دڵۆپی باران کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر شکاندن و ڕامالێنی گەردەکانی خاك، وەبارانی ئەم ناوچەیەش لەبـەر ئەوەی لە شێوەی گەردەلوولە بارانە، بۆیە لەناکاوە و دڵۆپی گەورەیە.

بڕی باران ئەگەر لایەنێکی پۆزەتیف بێت بۆ زۆربـوونی بەرهـەمی کـشتوکاڵی و ڕووەکـی سروشتی و زۆربوونی ئاوی ژێر زەوی، بەدڵنیاییەوە لایەنی نەگەتیفیشی هەیە، لەوانە ڕامالێن، زۆر جار زەوییەکی کشتوکاڵی لە ئەنجامی ڕامالێنی ئاوییەوە بۆتـە ناوچـەیەکی دامـاڵراو لـە خاك، بۆ دیاریکردنی کاریگەری باران لەسەر ڕامالێن لە ناوچەی لێکۆڵینەوە پەنا دەبەینە بـەر هاوکێشەی فۆرنیە[١٩]، ئەنجامی هاوکێشەکە[*] دەکاتە (٨٣,٩)، کەواتە توانای ڕامالێن بەپێی وێستگەی چەمچەماڵ مامناوەندییە.

لێژی (Slope) یەکێکە لە فاکتەرە سـەرەکی و ڕاسـتەوخۆکانی ڕامـالێن، لێـرەدا ئـەوەی گرنگە ئاماژەی بۆ بکەین لێژی زەوی ناوچەی لێکۆڵینەوەیە و کاریگەرییەکەی لەسەر کـرداری ڕامالێن، بۆ ئەم مەبەستە ئاستی لێـژی چـەند شـاخ و بەرزاییـەکی ناوچـەی لێکۆڵینـەوەمان وەرگرتووە، وەك لە خشتەی (٢) دەردەکەوێت:

**خشتەی (٢) بەرزی و ڕێژەی لێژی چیا و بەرزاییەکان لە ناوچەی لێکۆڵینەوە**

| بەرزاییەکان | بەرزترین خاڵ/م | نزمترین خاڵ/م | دووری نێوانیان/م | % ی لێژی |
|---|---|---|---|---|
| سەگرمە | ١٧٢٧ | ٨٨٥ | ٤٥٠٠ | ١٨,٧ |
| هەنجیرە | ١٣٧٢ | ٨٤٩ | ٥٥٠٠ | ٩,٥ |
| بازیان | ١٤٤١ | ٧٧٥ | ٣٧٠٠ | ٢٠,١ |
| ئاژداخ | ١٣٦٩ | ٨٧٦ | ٤٠٠٠ | ١٢,٢ |
| مەملەحە | ٩٣٦ | ٦٠٨ | ٤١٠٠ | ٨ |
| گردە سوور | ٨٧٦ | ٧٦٦ | ٣٠٠٠ | ٣,٩ |
| باوە ئەلیاس | ٦٨٨ | ٥٨١ | ١٨٥٠ | ٥,٧ |

سەرچاوە: کـاری توێـژەر بەپـشت بەسـتن بـە: ١) الجمهوریـة العراقیـة، وزارة الـدفاع، القـوات المسلحة العراقیة، المساحة العسکریة: جمجمـال،سنکاو،قادرکرم، الطبعـة الاولی، ١٩٨٨، مقیـاس ١: ١٠٠٠٠٠. ٢) ئەنتەرنێت. www. Googleareth. Imag Global

بۆ دۆزینەوەی ڕێژەی لێژی لە هەر یەکەیاندا پشتمان بەستووە بەم یاسایەی خوارەوە[٢٠]:

جیاوازی نێوان دووخاڵی وەرگیراو بەمەتر واتە (بەرزترین خاڵ/م - نزمترین خاڵ/م)
پلەی لێژی = ------------------------------------------ × ١٠٠
دووری نێوان ئەو دوو خاڵە بە مەتر

وە بۆ ناسینەوەی ئاستی لێژی هەر یەکە لەو بەرزاییانە و جیاکردنەوەی سنووری لێژییەکەیان، پشت بەو پێوانەیە بەستراوە، کە لە خشتەی (٣) ڕوون کراوەتەوە، کەواتە شاخی بازیان و سەگرمە بەزەوی لێژ دادەنرێت، چونکە ڕێژەی هەر یەکەیان دەکاتە (١,٢٠٪ – ١٨,٧٪) و شاخی ئاژداخ بەزەوی مامناوەندی لێژ دادەنرێت، چونکە ڕێژەی لێژی دەکاتە (١٢,٢٪) بەڵام شاخی هەنجیرە و مەملەحە بە زەوی مەیلان دادەنرێت، چونکە ڕێژەی هەریەکەیان (٩,٥٪ – ٨٪)، وەناوچەی گردەسوور و باوە ئەلیاس کەم مەیلان دادەنرێت، لەبەر ئەوەی ڕێژەی لێژی دەکاتە (٣,٩٪) و (٥,٧٪).

کاریگەری لێژی هەریەکەیان لەسەر هێزی ڕامالین بەئاشکرا دیارە، لەو ناوچانەی ڕێژەی لێژی زۆرە بڕی ڕامالین زۆرە بەڵام لەناوچە کەم لێژەکان کەمە.

**خشتەی (٣) پێوانەکردنی ڕێژەی سەدی سنووری لێژی و جۆرەکەی**

| پێوانەی لێژی | جۆری لێژی زەوی |
| --- | --- |
| ٠ – ٢ ٪ | زەوی تەخت |
| ٢ – ٧ ٪ | زەوی کەم مەیلان |
| ٧ – ١٢ ٪ | زەوی مەیلان |
| ١٢ – ١٨ ٪ | زەوی مامناوەندی لێژ |
| ١٨ – ٢٤ ٪ | زەوی لێژ |
| زیاتر لە ٢٤ ٪ | زەوی زۆر لێژ |

سەرچاوە: أ ر –لاك، طرق بحث تعرية التربة، ترجمة نبيل ابراهيم لطيف، دار الحكمة، ١٩٩١ ص ١٣٠.

## نەخشەی ژمارە (٢)

هێڵی بەرزی و نزمییە یەکسانەکان لە ناوچەی لێکۆڵینەوە




سەرچاوە: کاری توێژەر بەپشتبەستن بە

١- جمهورية العراق – المساحة العسكرية، المصدر السابق.

# نەخشەی ژمارە (٣)

دابەشبوونی شێوە جیۆمۆرفۆلۆجیەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە




سەرچاوە / کاری توێژەر بە پشت بەستن بە

1-Zoran stevanovic,Ferhad Yousef, FAO coordination in Northern Iraq Draft Map Produced by Ground water Unite

٢- هاشم یاسین حمدامین و اخرون ، المصدر السابق ، ص ٤٠

## قەبارەی ڕامالّینی ئاوی:

بەپێی زۆری و کەمی مادەی هەلّواسراو لەناو جۆگەلەی باراناو و ڕووبارەکان دەتوانین خەملاّندن بۆ قەبارەی ڕامالّین بکەین، وەك لە پێشەوە ئاماژەی بۆ کرا، بەلاّم بەپێی کاریگەری ئەو بارانەی سالاّنە لە ناوچەی لێکۆلّینەوە دەبارێت دەتوانین قەبارەی ڕامالّینەکە بەپێی یاسای (دۆگلاس)[٢٣] دەربهێنین بەچاوپۆشی لەفاکتەرەکانی تر:

$$S = \frac{1.65(0.03937\ P)^{2.3}}{1+ 0.0007\ (0.03937\ P)^{3.3}}$$

S = قەبارەی ڕامالّین بە( م$^3$/کم$^2$/ سالاّنە)

P = بەهای ڕاستەقینەی باران (فاعلیە المگر) بە ملم بەپێی هاوکێشەکەی (پورنپویت)

پاشان ئەنجامی هاوکێشەکەی دۆگلاس دابەش دەکرێت بەسەر (١٠٠٠) دا و بە(٣٦٥) ڕۆژ لێکدەدرێت، بۆ پڕاکتیزە کردنی ئەو هاوکێشەیە بەسەر ناوچەی لێکۆلّینەوەدا و سێ سالّمان وەك نموونە وەرگرتوە، وەك لە خشتەی (٤) دیارە و تیایدا دەردەکەوێت کە تێکرای ڕامالّینی سالاّنە لە ناوچەی لێکۆلّینەوە دەکاتە (١,٢٥ م$^3$/کم$^2$/سالاّنە) وە ئەم بڕی ڕامالّینەش لە سالّێکەوە بۆ سالّێکی تر، بەپێی جیاوازی بڕی باران لەو سالّەدا جیاوازە.

**خشتەی (٤) قەبارەی ڕامالّین بە (م$^3$/کم$^2$/سالاّنە) بەپێی هاوکێشەی (دۆگلاس) لەناوچەی لێکۆلّینەوە**

| ناوەڕۆك | پڕ بارانترین سالّ ٢٠٠٢ | کەم بارانترین سالّ ٢٠٠٧ | تێکڕای بارانی سالاّنە |
|---|---|---|---|
| بڕی بارانی سالاّنە | ٦٨٢,٧ | ٣١٨,٩ | ٤٩٥,١ |
| بەهای ڕاستەقینەی باران | ٤٩,٩٧ | ٢١,٤٥ | ٣٤,٩٧ |
| قەبارەی ڕامالّین | ٢,٨٣ | ٠,٤١ | ١,٢٥ |

سەرچاوە: کاری توێژەر بەپشت بەستن بەهاوکێشەی (دۆگلاس).

خشتەی (٥) تێکرای سەرجەمی بارانی مانگانە و سالآنە لە چەمچەماڵ (٢٠٠٠ – ٢٠٠٧)

| مانگ | وەرزی زستان | | | وەرزی بەهار | | | وەرزی هاوین | | | وەرزی پایز | | | تیکرایی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ك/١ | ك/٢ | شوبات | ئازار | نیسان | مایس | حزیران | تەموز | ئاب | ئەیلول | ت/١ | ت/٢ | |
| ٢٠٠٠ | ١١٦ | ١٣٩ | ٤٣ | ١٤ | ١٨,٧ | ٦ | - | - | - | ٠,٥ | ٢٧,٦ | ٣٠,٦ | ٣٩٥,٤ |
| ٢٠٠١ | ١١١,٣ | ٧٨,١ | ٦٤,٦ | ٧٣,٧ | ٢٠,٧ | ٦ | - | - | - | ١١ | ٥١ | ٢٩,٨ | ٤٤٦,٢ |
| ٢٠٠٢ | ٢٧٢,٧ | ١٦٠,١ | ٤٥,٣ | ١٠٠,٥ | ٧٤,٧ | ٦,٦ | - | - | - | - | ١٦,٨ | ٦ | ٦٨٢,٧ |
| ٢٠٠٣ | ١١٠,٦ | ٧٧,٢ | ٩٨,٢ | ٩٨ | ٢٢,٨ | ١٠,٤ | - | - | - | - | ٩,٩ | ٥٧,٩ | ٤٨٥ |
| ٢٠٠٤ | ٩٩,٨ | ١٧٩,٥ | ٧٨,٥ | ١٦,٥ | ٥٨,١ | ٣١,١ | - | - | - | - | - | ١١٣,٤ | ٥٧٦,٩ |

سەرچاوە : وەزارەتی گواستنەوەو گەیاندن، دەزگای گشتی کەشناسی چەمچەماڵ، بەشی ئاووهەوا ، تۆماری بڵاونەکراوە

خشتەی (٦) دابەشبوونی بەرزترین و نزمترین پلەی گەرمی مانگانە و وەرزانەی لە ویستگەی چەمچەماڵ لە ماوەی نێوان سالآنی (٢٠٠٠ – ٢٠٠٧)

| مانگ | وەرزی زستان | | | وەرزی بەهار | | | وەرزی هاوین | | | وەرزی پایز | | | [illegible] |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ك/١ | ك/٢ | شوبات | ئازار | نیسان | مایس | حزیران | تەموز | اب | ئەیلول | ت/١ | ت/٢ | |
| نزمترین | ٣,٤ | ٢,٣ | ٣,٢ | ٦,٨ | ١٠,٨ | ١٥,٢ | ٢١,٥ | ٢٥,٤ | ٢٥,١ | ٢٠,١ | ١٥ | ٧,٧ | ١٣,١ |
| بەرزترین | ١٣,٤ | ١١,٣ | ١٣ | ١٨,٦ | ٢٢,٥ | ٣٠,١ | ٣٦,٩ | ٤٠,٦ | ٤٠ | ٣٥,٥ | ٢٩ | ١٩,٥ | ٢٥,٩ |
| تیکرایی | ٨,٤ | ٦,٨ | ٨,١ | ١٢,٧ | ١٦,٦ | ٢٢,٨ | ٢٩,٢ | ٣٣ | ٣٢,٥ | ٢٧,٢ | ٢٢ | ١٣,٦ | ١٩,٥ |

**سەرچاوە** / وەزارەتی گواستنەوەو گەیاندن، دەزگای گشتی کەشناسی سلێمانی، بەشی ئاووهەوا ، تۆماری بڵاونەکراوە .

## دووەم/ ڕامالێنی هەوایی ( با ):

ڕامالێنی هەوایی سەرجەم ناوچەکانی لێکۆڵینەوە دەگرێتەوە، بەلآم ناوچەکانی باشوور و ڕۆژئاوا بەپلەی زۆرتر بەتایبەتی لە وەرزی هاوینی وشکی بێ سەوزیدا، چونکە خێرایی و دووبارەبوونەوەی با لەم وەرزەدا لە سەرجەم وەرزەکانی تر زۆرتر و خێراترە.

هەروەها تێکرای سالآنە و وەرزانەی زۆرترین دیاردەی دووبارە بوونەوەی ئاراستەی با لە باشوور و باشووری ڕۆژئاوایە، وەك لەپێشەوە باس کرا کە بەتایبەتی لە ناوچەی

وشك و بیابانییەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراقەوە دێت و دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی پلەی گەرمی و زیادکردنی ڕادەی بەهەڵمبوون ئەمەش هۆکارێکی ڕاستەوخۆیە بۆ دروستبوونی ڕامالێنی هەوایی بەهەر دوو قۆناغەکەیەوە:

١/ لەبەریەك هەڵوەشاندنی دەنکۆڵەکانی خاك.

٢/ گواستنەوەی دەنکۆڵەی خاکە هەڵوەشاوەکان بەیەکێك لەم ڕێگایانە[٢٤]:

(أ) هەڵواسران (Suspension Movement) بۆ ئەو دەنکۆڵانەی تیرەکانیان لە (٠,١ملم) کەمترە و دەگوێزرێنەوە بەهەڵواسراوی لە ناو هەوادا بۆ دووری سەدان تا هەزاران کیلۆمەتر وەك دیاردەی تەپوتۆز لە وەرزی هاویندا لە ناوچەی لێکۆڵینەوە بەئاشکرا هەستی پێدەکەین.

(ب) بازدان (Saltation Movement) ئەو دەنکۆڵانەی تیرەکانیان لە نێوان (٠,١-٠,٥ملم) دایە، با بەپێی خێراییەکەی ئەم دەنکۆڵانە دەداتە پێش خۆی بەشێوەی بازدان.

(ت) تلخواردن یان خشان (Creeping Movements) ئەو دەنکۆڵانەی تیرەکانیان لە نێوان (٠,٥-٢ملم) دایە، لەبەر گەورەیی دەنکۆڵەکان با توانای هەڵگرتن و بازدانی نییە بۆیە لە شێوەی تلۆربوونەوە و خشاندن دەیداتە پێش خۆی.

وەك لە شێوەی (١) دا هاتووە کرداری ڕامالێنی هەوایی لە هەرێمە جیاوازەکانی وەك (دارستان و گژوگیای ستێبس و بیابان) دیاری دەکات، ڕادەی ڕامالێن لە ناوچەی دارستانەکان کەمترین ڕێژەی هەیە دەکاتە (٠,٠٠٢ - ٠,٠١ تەن/هکتار)، دوابەدوای ئەو گژوگیای ستێبسە ڕێژەکەی دەکاتە (٠,٠٢ - ٠,١ تەن/هکتار) و پاشان بیابان ڕێژەکەی زۆر بەرزە (٠,٥ — ١ تەن/هکتار). کەواتە بەشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوچەی لێکۆڵینەوە کەمترین ڕادەی ڕامالێنی هەوایی کاری تێدەکات بەهۆی بوونی دارستانەکانەوە، چونکە زۆربەیان کەوتوونەتە ئەم بەشەوە، بەڵام ناوچەکانی ناوەڕاست و باشوور و ڕۆژئاوا زۆرتر زەوی کشتوکاڵی و لەوەڕگای ستێبسە کرداری ڕامالێنی هەوایی تێدا خێراترە.

مادەی ئەندامی و پێکهاتەی لیتەیی و قوڕی وەك فاکتەرێکی بەهێز وایە بۆ یەکگرتوویی دەنکۆڵەکانی خاك لەبەردەم بای خێرادا[٢٥]، بەڵام ناوچەی لێکۆڵینەوە سەرەڕای ئەوەی جۆری خاکەکەی تێکەڵەی لیتەییە، بەڵام بڕی مادەی ئەندامی لەناو خاکەکەیدا کەمە

و لەنێوان (١-٢,٩٪) دایە و ناوچەکانی باشوور هەژارترە بە مادەی ئەندامی، بۆیە کرداری ڕامالینی هەوایی لەسەر زۆرترە.

**شێوەی (١)_ بڕی ڕامالین بەپێی هەرێمی ڕووەکی سروشتی بە ( ١٠٠٠ کگم/هکتار)**




**سەرچاوە:** د. محمد رضوان خولي، التصحر فی الوطن العربی، الطبعة الثانیة، مرکز دراسات الوحدة العربیة، بیروت، تموز ١٩٩٠، ص، ٧٩.

بۆ دۆزینەوەی توانای ئاووهەوایی لەسەر کرداری ڕامالینی با لە ناوچەی لێکۆڵینەوەبەپێی هاوکێشەکەی (Chepil) بریتییە لە[٢٦]:

$$C = ٣٨٦ \frac{V^{٣}}{(PE)^{٢}}$$

C = توانای ئاووهەوایی بۆ ڕامالینی هەوایی

V = تێکڕای خێرایی با بە (میل/کاتژمێر)

PE = بەهای ڕاستەقینەی باران بەپێی پورنپویت. (القیمه الفعلیه للمگر).

بەهای ڕامالّینی هەوایی لە ناوچەی لێکۆڵینەوە دەکاتە (١٧,٣) واتە کاریگەری ڕامالّینی هەوایی و قابلیەتی ناوچەکە (کەمە) بەپێی پلەی ڕامالّین لە سایەی هاوکێشە و خشتەی شیپیل دیاری کردووە، بەڵام کاریگەری بای باشوور لە هەموو ئاراستەکانی تر بەهۆی زۆر دووبارە بوونەوەی و خێراییەکەی زیاترە، بۆیە بەپێی هەمان هاوکێشە دەکاتە (٤٦,٨٧) واتە کاریگەری ڕامالّین مامناوەندیە. خشتەی (٧)

**خشتەی (٧) بەها و توانای ڕامالّینی هەوایی بەپێی پلەی بەهێزییان**

| توانای ئاووهەوایی بۆ ڕامالّین | پلەی ڕامالّین |
|---|---|
| ٠ – ١٧ | ڕامالّینی زۆر کەم |
| ١٨ – ٣٥ | ڕامالّینی کەم |
| ٣٦ – ٧١ | ڕامالّینی مامناوەندی |
| ٧٢ - ١٥٠ | ڕامالّینی بەهێز (بەرز) |
| زیاتر لە ١٥٠ | ڕامالّینی زۆر بەهێز |

سەرچاوە: د. صباح محمود الراوي، المصدر السابق، ص ٨.

## (٢) تێکچوونی ڕووپۆشی ڕووەك:

ڕووپۆشی ڕووەکی لە ناوچەی لێکۆڵینەوە بۆ دوو جۆری سەرەکی دابەشدەکرێت: (دارستان و گژوگیا). بەگشتی ناوچەکە لە ڕووی دارستانەوە بەپێی دارشتنەکەی هاسل (Hasel)[*] بە ناوچەیەکی هەژار دادەنرێت، چونکە ڕێژەی دارستان دەکاتە (٧,١٪) ی کۆی ڕووبەری ناوچەکە بەگشتی و (٣,٢٪ - ١١,٩٪ - ٥,٥٪) بۆ هەریەکە لە ناحیەکانی سەنتەر و سەنگاو و ئاغجەلەر یەك بەدوای یەك. بەپێی پێوەری (ستانداری) جیهانی بۆ پاراستنی هاوسەنگی ئایکۆلۆجی، دەبێت هەرکەسێك (٠,٨) هکتار لە دارستانی بەربکەوێت[٢٧]، بەڵام ناوچە نیمچە شاخاوییەکان بەگشتی لە دارستانەوە هەژارە و ناوچەی لێکۆڵینەوەش بەشی کەسێك لە دارستان دەکاتە (٠,١٢) هکتار، ئەمەش مانای وایە زۆر هەژارترە لە ستانداری جیهانی.

هەرچەندە ئامارێکی ورد لە بەردەستا نییە بۆ بەراورد کردنی ڕووبەری دارستانی ناوچەکە لە نێوان دوو مێژووی جیاوازدا، بەڵام بەپێی ئەو ڕووپێویەی لە ساڵی (١٩٦٣) کراوە ڕووبەری دارستان لە هەموو هەرێمی کوردستاندا بریتی بووە لە (٧٣٠٤٠٠٠دۆنم)، پاش بیست و پێنج ساڵ لە ڕووپێوییەکی تردا لە ساڵی (١٩٨٨) کەمی کردووە بۆ (٧١١٤٠٠٠ دۆنم) بەواتا ڕووبەری دارستانەکان (١٩٠٠٠٠دۆنم) کەمی کردووە[٢٨]. هەرچەندە ئەم ڕووپێوییە گشتییە بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەو ڕێژەیە لەدارستان، کە لەناوچووە، بەشێکی زۆری بەر ناوچەی نیمچە شاخاوییەکان دەکەوێت و ناوچەی لێکۆڵینەوەش بەشێکە لەو ناوچانە، دارستانی ناوچەی لێکۆڵینەوە یەکێکە لەو دارستانانەی هەرێمی کوردستان، بەپلەی یەکەم دێت، کە تووشی لەناوچوون بووە، بەهۆی بڕینەوەی هەڕەمەکی و سووتاندنی لەلایەن ڕژێمی بەغدا و گوێ پێ نەدانی لەلایەن خەڵکەوە[٢٩]. بەدڵنیاییەوە ڕێژەی دارستان لەم ساڵانەی دوایدا لەوەش کەمتری کردووە بەهۆی سیاسەتی دوژمنکارانەی ڕژێمی بەغداوە کە گەمارۆی ئابووری و سووتەمەنی لەسەر هەرێمی کوردستان دانابوو و ناچاربوونی خەڵکی کوردستان بۆ بڕینەوەی دارەکان و بەکارهێنانی وەك سووتەمەنی بۆ چێشت لێنان و خۆ گەرمکردنەوە لەسەرمای زستان لەماوەی ساڵانی (١٩٩١-٢٠٠٣). لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەسەلمێنن، کە سوود وەرگرتن لە دار بۆ مەبەستی خۆ گەرمکردنەوەو خۆراك دروستکردن و پێویستییەکانی تری ناوماڵ، بۆ خێزانێکی (٥-٦) کەسی هەفتانە پێویستی بە (٥٠ کگم) دارو تەختە دەبێت[٣٠]، کە دەکاتە ئەوەندەی یەك درەختی مامناوەندی، جگە لەوەی خانووەکانیش بەقوڕ و دار دروست کراوە و پێویستە هەر (٦-٧) ساڵ جارێك دارەکانی نوێ بکرێنەوە کەواتە هەر خێزانێك لە گوندەکانی ناوچەکە ساڵانە پێویستی بە بڕینەوەی (٢٠٠) دار دەبێت.

کەوتنەوەی ئاگر، بەتایبەتی لە وەرزی وشك و گەرمی هاویندا، زۆربەی کات بەدەستی ئەنقەست لەلایەن سوپای عێراقەوە ئاگریان تێ بەردەدرا، هەندێك جاریش بەدەستی ئەنقەست لەلایەن گوندنشینانەوە بەمەبەستی فراوانکردنی زەوی کشتوکاڵی، کە دەبێتە هۆی سووتانی هەزاران داری گەوور و بچووکی دارستانەکان ئەمەش دەبێتە هۆی ڕووتبوونەوەی ناوچەکە لە ڕووپۆشی ڕووەك و کاریگەری لەسەر زیادبوونی لافاو و ڕامالین هەیە[٣١]، کە هۆکارێکە بۆ زیادبوونی بەبیابانبوون.

جگە لە دارستان گژوگیاش وەك سەرچاوەی ڕووەکی سروشتی ناوچەی لێکۆڵینەوە تووشی تێکچوون بووە بەهۆی لەوەڕاندنی بێ سەرپەرشتەوە، بەتایبەتی زیادبوونی ژمارە ئاژەڵەکان

بەبێ گوێدانە توانای لەخۆگرتنی لەوەڕگاکان بۆ ئەو ژمارە زۆرەی ئـاژەڵ، بەتایبـەتی لـەدوای جێبەجێکردنی بڕیاری (٩٨٦) ی نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆمـەکی ڕێکخـراوی (FAO) بـۆ جووتیارەکانی هەرێمی کوردستان، ژمارەی ئاژەڵـەکان بەڕێژەیـەکی چـاوەڕوان نـەکراو زیـادی کردووە و لەتوانای لەوەڕگاکاندا نییە، بـۆ نموونـە لـەماوەی نێـوان سـاڵانی (١٩٩٧-١٩٩٩) ڕێـژەی مـەڕ لـە هـەرێمی کوردسـتان (٣٠٠٪) و بـزن (٢٢٠٪) و مانگـا (٢٥٠٪) زیـادی کردووە[٣٢]. وە ئەم زیاد بوونەش هەر بەردەوام بووە، تا سـاڵی (٢٠٠٢)، ژمـارەی ئاژەڵـەکان بەهەرسێ جۆرەکەیەوە لەزیادبووندایەو لەهەندێك ناوچە لەو یەکەی پێوانەییە زیاترە کە نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری لێداوە، سـەرەڕای ئـەوەی ژمارەیـەکی زۆر لـە ئـاژەڵی بـزن لەناوچـەی لێکۆڵینەوە بەخێو دەکرێت، کە دەکاتە (٣٠,٨٪) ئاژەڵی وردەی ناوچەکە بەپێی ئاماری ساڵی (٢٠٠٢)، ئەمەش هۆکارێکی خێرایە بـۆ لـەناوبردنی لـەوەڕگاکان، چـونکە بـزن بـەدوژمنی لەوەڕگا دادەنرێت و بە (کوللەی ڕەش) ناودەبرێت، لەکاتێکدا لەوەڕگاکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە تەنیا بۆ ماوەی چەند مانگێك توانای بەخێوکردنی ئەو ئاژەڵانەیان هەیە.

ئەم فشارە زۆرە لەسەر لەوەڕگاکانی ناوچەکە، بۆتە هۆی تێکـچوونی ڕووەکـی سروشـتی و کەمبوونەوەی لە ڕووی چەندی و چۆنییەوە، لەناوچوون یان کەمبوونەوەی ژمارەیـەکی زۆر لـە ڕووەکی باش و پەسەند بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکان، وەك (پێکوڵە، قنگرباج، لەرزانـە، خرنـوك، زەرنۆکە، گوێبەرخە، گەنمۆکە، جۆکێویلە، قازیاخە، سێپەڕە)، سەرهەڵدان و زۆربوونی گژوگیای خراپ و ناپەسەند لـە جێگایـان وەك (تـەروو، ژاڵـە، سـورنانگ ، گوژاڵـك، بـایف، بەلـەك، شیرخرشك، کاروش)[٣٢] کە دەبێتە هۆی سـەرهەڵدانی بـەبیابانبوونی لاواز و سـەرەتایەکە بـۆ دروستبوونی بەبیابانبوونی مامناوەندی و بەهێز، چونکە ئەگەر ئەم بارودۆخـە بـەردەوام بێـت لەوەڕگاکان بەتەواوی لەناودەچن و دەبێتە بیابان، ڕاڕایش لەبارانی ساڵانە کردارەکـە خێراتـر و توندتر دەکات بەتایبەتی لەو ساڵانەدا، کە بڕی باران کەمترە لەتێکڕای بارانی ساڵانە، ئەمەش دەبێتە هۆی کەمی ڕواندنی گژوگیای سروشتی و کێشەیەکی تر بەدوای خۆیدا دێنێتـە ئـاراوە، ئەویش ئەوەیە ڕووەکەکان پێش تەواو کردنی خولی ژیانیـان لەلایـەن ئاژەڵەکانـەوە دەخـورێن، ئەمـەش پێی دەوترێت لەوەڕاندنی پێش وەخت، وەفرسەتی ڕواندنەوەی بـۆ سـاڵی ئاینـدە کـەم دەبێتەوەو ئەگەر چەند ساڵێك ئەمـە دووبارەبێتـەوە بەتـەواوی ڕووەکـە بـاش و پەسـەندەکان لەناودەچن و زەوییەکە ڕووت دەبێتەوە لە ڕووەکی پەسەند و ڕووەکی ناپەسەند زەرەرمەند جێی دەگرێتەوەو ئەمەش شێوازێکە لەشێوازەکانی دیاردەی بەبیابانبوون.

ڕووبەرێکی فراوانیش لە لەوەڕگا و زەوییە کشتوکاڵییەکان لەلایەن ڕژێمی پێشووی بەغدا بە مین چێنراون دەکاتە (١٧٧٠٠ دۆنم)[٣٤] کە وای کردووە جووتیار و شوانکارەکان نەتوانن سوود لەم زەوییانە وەربگرن.

بەکارهێنانی زەوی لەوەڕگا بۆ کشتوکاڵ و بڕینەوەی دارەکانی ناوچەکە بەمەبەستی ئامادەکردنی زەوی کشتوکاڵی بەتایبەتی لەدوای ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)، بەهۆی گەمارۆی ئابووری نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر عێراق و گەمارۆی ڕژێمی بەغدا لەسەر هەرێمی کوردستان و گرانی بەرووبوومی خۆراکی، بەتایبەتی گەنم زۆر لە جووتیارەکانی هاندا زەوی لەوەڕگا و زەوییە پەراوێزەکان بەکاربهێنن بۆ چاندنی کشتوکاڵی دانەوێڵە ئەمەش لە سەرەتادا بۆ چەند ساڵێك سوودی کەمی لێ بینرا، بەڵام لەدواییدا هەم بەرهەمەکەی کەم بوو هەم لەوەڕگاکانیش لەناوچوون ئەمەش بەئاشکرا لە ناحیەی سەنتەر و ناحیەی سەنگاو دەبینرێت[٣٥].

## هەڵسەنگاندنی پۆشاکی ڕووەك لە ناوچەی لێکۆڵینەوە:

بۆ دیاریکردنی پێوەرێك بۆ هەڵسەنگاندنی ڕووپۆشی ڕووەك لە هەر ناوچەیەك و پلەی کاریگەری بەبیابانبوون لەسەری و ئاستی هەستیاری ناوچەکە پێویستە ئاماژە بۆ ئەم سێ خاڵە بکەین[٣٦]:

(١) بارودۆخی ڕووەك: پێویستە توێژینەوەی ورد لەسەر بارودۆخی ڕووپۆشی ڕووەك و جۆرەکانی بەپێی تەمەنیان (هەمیشەیی و وەرزانە) و چڕییان و ڕێژەی سەوزییان، جۆری گیاکان بەپێی (پەسەندییان و ناپەسەندییان) بکرێت، و دابەش دەکرێن بۆ ( زۆر هەژار، هەژار، مامناوەند، باش).

(٢) ڕێژەو توانای سوود وەرگرتن لە ڕووپۆشی ڕووەك: چۆنیەتی سوود وەرگرتن لە ڕووپۆشی ڕووەك بەپێی کات و شوێن و ماوەی لەوەڕاندن و ژمارەی ئاژەڵەکان و توانای لەخۆگرتنی لەوەڕگاکان و زیادبوونی ڕووەکی ناپەسەند، ئەمانە هەموویان لە هۆکارە سەرەکییەکانی گۆڕانی ڕووپۆشی ڕووەك و سەرهەڵدانی بەبیابانبوونە، بەپێی ئەم جۆرانەی سەرەوە دابەش دەکرێن بۆ چوار گروپ ( کەم، مامناوەند، زۆر، زۆر زۆر).

(٣) توانای نوێبوونەوەی ڕووپۆشی ڕووەك: بەپێی هەلومەرجی سروشتی و مرۆیی ڕووپۆشی ڕووەك و توانای نوێبوونەوەی ڕووەکەکان کاریگەری لەسەر کەمکردنەوە یان زیادکردنی دیاردەی بەبیابانبوون دەبێت.

بۆ پیادەکردنی ئەم سێ خاڵەی سەرەوە دیاریکردنی پێوەرێك بۆ هەڵسەنگاندنی پۆشاکی ڕووەك و کاریگەری بەبیابانبوون لەسەری لە هەر ناوچەیەك.

**خشتەی (٨) دیاریکردنی نیشانە و پێوەر بۆ هەڵسەنگاندنی پۆشاکی ڕووەك و کاریگەری بەبیابانبوون لە سەری**

| دۆخی ڕووەك | کاریگەری بەبیابانبوون | | | |
|---|---|---|---|---|
| | (١) کەمە | (٢) مامناوەندە | (٣) زۆرە | (٤) زۆر زۆرە |
| بارودۆخی ڕووپۆشی ڕووەك | بوونی ڕووەکی ناپەسەند (٥٪)کەمترە | بوونی ڕووەکی ناپەسەند(٥–٢٠٪)ە | بوونی ڕووەکی ناپەسەند(٢٠–٥٠٪) | بوونی ڕووەکی ناپەسەند(٥٠٪) زیاترە |
| | ڕووەکی وەرزانەلە(٢٥٪) پێکدەهێنێت | ڕووەکی وەرزانەلە(٢٥–٥٠٪) پێکدەهێنێت | ڕووەکی وەرزانەلە(٥٠–٧٥٪) پێکدەهێنێت | هەموو ناوچەکە لەڕووەکی وەرزانە پێکهاتووە |
| | ڕووپۆشی ڕووەکی هەمیشەیی (٣٠٪)ە | پۆشاکی ڕووەکی هەمیشەیی(١٥–٣٠٪)ە | پۆشاکی ڕووەکی هەمیشەیی(٥–١٥٪)ە | پۆشاکی ڕووەکی هەمیشەیی(٥٪)کەمترە |
| سود وەرگرتن لەڕووپۆشی ڕووەك | شوێنەواری ڕیشە کێشکردنی ڕووپۆشی ڕووەك هەست پێ ناکرێت | بڕینەوەی دارو دەوەنی زیاترە لەتوانای بایەلۆجی ناوچەکە | بڕینەوەی دارودرخت ودەوەن بەتەواوی هەستی پێدەکرێت | بڕینەوەی بێسەرەبەری دارودرخت و دەوەن لە ماوەیەکی پێوانەیی کورتدا |
| | هاوسەنگی لەنێوان توانای لەوەڕگاکان و ژمارەی ئاژەڵەکاندا هەیە | یەکەی ئاژەڵەکان لە(٢٥٪) زیاترە لەتوانای لەخۆگرتنی لەوەرگاکان | یەکەی ئاژەڵەکان لەنێوان(٢٥–٥٠٪) زیاترە لەتوانای لەخۆگرتنی لەوەرگاکان | یەکەی ئاژەڵەکان زیاترەلە(٥٠٪) توانای لەخۆگرتنی لەوەرگاکان |
| توانای نوێبوونەوەی ڕووپۆشی ڕووەك | نوێبوونەوەی ژیانی پۆشاکی ڕووەك بەشێوەی سروشتی ڕوودەدات | نوێبوونەوەی ژیانی پۆشاکی ڕووەك پێویستی بەتێچوونی کەم هەیە | توانای نوێبوونەوەی ژیانی ڕووەکی پێویستی بە تێچوونێکی زۆر هەیە | توانای نوێبوونەوەی ژیانی ڕووەکی زۆرگرانە یان ئەستە بەشێوەیەکی ئیکۆلۆجی–ئابووری بێت |
| | پێویستی بەکرداری چاکسازی و ڕواندنەوەی ڕووەك ناکات | کرداری چاکسازی و ژیانەوەی ڕووەك سەرکەوتوودەبێت | کرداری چاکسازی و ژیانەوەی ڕووەك تارادەیەك سەرکەوتووە | کرداری چاکسازی و ژیانەوەی پۆشاکی ڕووەك تارادەیەکی زۆر سەرکەوتونابێت |

سەرچاوە/ کاری توێژەر بەپشت بەستن: د. حسین آزرنیوند، محمد علی زارع چاهوکی، معرفی شاخص های معیاری پوشش گیاهی برای ارزیابی شدت بیابان زایی مطالعة موردی– منطقة شرق اصفهان، مجله جنگل و مراتع، شماره ٧٨، تهران، بهار ١٣٨٧، ص ١٥.

بەسوود وەرگرتن لەو خشتەیەی سەرەوە و پراکتیککردنی ئەم یاسایە[٣٧]:

$$VI = \sqrt[3]{CI \times EI \times RI}$$

VI = باری پێوانەیی پۆشاکی گیایی

CI = یەکەی پێوانەیی بارودۆخی پۆشاکی ڕووەك

EI = یەکەی پێوانەیی سوود وەرگرتن لەپۆشاکی ڕووەك

RI = یەکەی پێوانەیی توانای نوێبوونەوەی پۆشاکی ڕووەك

دەتوانین ئاستی ڕووپۆشی ڕووەك لە ناوچەی نیمچە شاخاوییەکان بەگشتی و ناوچەی لێکۆڵینەوە بەتایبەتی هەڵسەنگێنین و بەپێی ئەو پێوەرانەی لە خشتەکەدا هاتوون کاریگەری بەبیابانبوون لەسەر ناوچەکە دیاری بکەین، دوای هەڵسەنگاندنی هەریەکە لەو سێ خاڵەی لەپێشەوە باس کرا و پراکتیزە کردنی بەسەر هەرسێ ناحیەی ناوچەی لێکۆڵینەوەدا، وەك لەخشتەی (٩) دیارە، ئەوا یەکێك لەم چوار ئەنجامەمان بۆ دەردەکەوێت:

- ئەگەر ئەنجامەکەی ژمارە (١) دەرچوو، ئەوا نیشانەی ئەوەیە کاریگەری بەبیابانبوون کەمە.
- ئەگەر ئەنجامەکەی ژمارە (٢) دەرچوو، ئەوا نیشانەی ئەوەیە کاریگەری بەبیابانبوون مامناوەندییە.
- ئەگەر ئەنجامەکەی ژمارە (٣) دەرچوو، ئەوا نیشانەی ئەوەیە کاریگەری بەبیابانبوون بەهێزە.
- ئەگەر ئەنجامەکەی ژمارە (٤) دەرچوو، ئەوا نیشانەی ئەوەیە کاریگەری بەبیابانبوون زۆر بەهێزە.

**خشتەی (٩) هەڵسەنگاندنی پۆشاکی ڕووەك لە ناوچەی لێکۆڵینەوە**

| یەکەی کارگێڕی | یەکەی پێوانەیی پۆشاکی ڕووەك | | | ئەنجامی کۆتایی هەڵسەنگاندن |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| | بارودۆخی پۆشاك | سوود وەرگرتن لێی | تواناى نوێبوونەوەی | |
| سەنتەر | ٢ | ٤ | ٢ | - |
| | ٣ | ٢ | ٣ | - |
| | ٤ | - | - | - |
| | ٣ | ٣ | ٢,٥ | ٢,٨ |
| سەنگاو | ٣ | ٤ | ٣ | - |
| | ٣ | ٣ | ٣ | - |
| | ٤ | - | - | - |
| | ٣,٣ | ٣,٥ | ٣ | ٣,٢ |
| ئاغجەلەر | ٢ | ٣ | ٢ | - |
| | ٣ | ٢ | ٢ | - |
| | ٣ | - | - | - |
| | ٢,٦ | ٢,٥ | ٢ | ٢,٣ |

**سەرچاوە / کاری توێژەر بەپشت بەستن:**

**١) بەو داتاو سەرچاوانەی لەسەر پۆشاکی ڕووەکی ناوچەی لێکۆڵینەوە هەیە.**

**٢) بەسوود وەرگرتن لە لێکۆڵینەوەی مەیدانی کە توێژەر پێی هەستاوە.**

**٣) بەسوود وەرگرتن لە خشتەی (٨)**

بەپێی هەڵسەنگاندنی هەرسێ پێوەری ( یەکەی بارودۆخی ڕووپۆشی ڕووەك و توانای سوود لێوەرگرتنی و ئاستی نوێبوونەوەی ژیانی ڕووپۆشی ڕووەك) لە هەریەکە لە ناحیەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە، ئەنجامێکی جیا دەدات بەدەستەوە، لە هیچ یەکێکیاندا لەژمارە (٢) کەمتر و ژمارە (٤) زیاتر نییە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە، کاریگەری بەبیابانبوونی بەپلەی (کەم و زۆر بەهێز) لە ناوچەی لێکۆڵینەوە بوونی نییە، وەڕێژەی

کاریگەرییەکە لە هەریەکە لە ناحیەکان جیاوازە، بۆ نموونە لە ناحیەی ئاغجەلەر (٢,٣)ە واتە کاریگـەری مامناوەندییـە و لـە ناحیـەی سـەنتەر (٢,٨)ە، واتـە کاریگـەری بـەبیابانبوون مامناوەندییە و نزیکە لە بەهێزەوە، ناحیەی سەنگاو دەکاتە (٣,٢)ە کاریگەریگەری بـەهێزە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە سەرجەم ناوچەی نیمچە شاخاوییەکان بەگشتی و ناوچەی لێکۆڵینەوە بەتایبەتی کاریگەری بەبیابانبوون لەسەر ڕووپۆشی ڕووەك وەك سـەرجەم دیاردەکـانی تـر وەك یەك نییە، بۆیە چاودێریکردن و چارەسەرکردنیـشیان بـەپێی جیـاوازی پلـەی بـەبیابانبوونیان جیاوازە.

## (٣) دابەزینی ئاستی ئاوی ژێر زەوی:

بە بۆچوونی پسپۆرانی هایـدرۆلۆجی سـەرەتاکانی دەرکـەوتنی کورتهێنـانی ئـاوی (عجـز المائی) سـەرەتایەکە بـۆ سـەرهەڵدانی دیـاردەی بـەبیابانبوون و دەبێتـە هـۆی کەمبوونـەوەی سەرچاوەی ئاو و بڕی ئاوی هەڵقوڵاو لەکانی و کارێز و بیرەکان یـان وشـکبوونی کانیاوەکـان و دابـەزینی ئاسـتی ئـاوی ژێـر زەوی و سـەرهەڵدانی گیروگرفتـی کـەم ئـاوی بـۆ پڕکردنـەوەی پێویستییەکانی مرۆڤ لـە بوارەکـانی کـشتوکاڵ و پیـشەسازی و ئـاژەڵ و کاروبـاری ناومـاڵ، وەئەمەش تەنیا کار لە بڕی ئاوەکە ناکات، بەڵکو کاریگەری خراپی لە ڕووی جۆریشەوە هەیـە بە بەرزبوونەوەی ڕادەی خوێ و مادە زیان بەخشەکانی ناوی.

کەمبوونەوەی سەرچاوەی ئاوی لـە ناوچـەی لێکۆڵینـەوە، هـەموو سەرچـاوە ئاوییـەکانی گرتۆتەوە بەتایبەتی لەو ساڵانەدا، کە ڕادەی باران کـەمترە لـە تێکـڕای بـارانی سـاڵانە و بـە وشکەساڵ ناودەبرێت، وەك لە ساڵی (٢٠٠٠) ڕوویداوە، بەپێی ئـەو ڕووپێوییـەی لـە ناوچـەی لێکۆڵینەوە کرا ژمارەیەکی زۆر لە کـانی و کـارێز و بیرەکـان وشـکیان کـرد، کـە بەگـشتی (٧٥٪)ی کانییـەکان و (٦٤٪)ی کارێزەکـان و (٤٥,٥٪)[٣٨]ی بـیرە تەنکـەکان، ئەمـەش شێوەیەکی ئاشکرایە لە سەرهەڵدانی دیاردەی بەبیابانبوون. جگە لـەوەی سـێ بـیری قـووڵیش وشکی کردووە، لە ناوچەی لێکۆڵینەوە.

کەمبوونەوەی ئاوی ژێر زەوی و وشکبوونی بیر و کانییەکان تەنیا لەو ساڵانەدا نەبووە کـە بڕی باران کەم بووە وەك لەپێشەوە باس کرا، بەڵکو دیارە کەمبوونەوەی ئاستی ئاوی ژێر زەوی لەناو بیرە قووڵەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە لە ماوەیەکی دیاریکراودا لەنێوان ساڵی (١٩٧٦ تـا ٢٠٠٥) وەك لەخشتەی (١٠) دیارە بەئاشکرا هەستی پێدەکرێت، ئەگەر بەراوردێك بکەین لە

نێوان قووڵی هەندێك لەو بیرانەی لە ساڵانی حەفتاكان و هەشتاكانی سەدەی ڕابردوودا لێدراون و ئەوانەی لە ساڵانی نەوەدەكانی سەدەی رابـردوو و ئـەم سـاڵانەی دواییـدا لێـدراون گـۆڕانی ئاشكرا لە قووڵییەكاندا دەردەكەوێت. ئەمەش بەڵگەی ئاشكرایە لەسەر دەركەوتنی دیـاردەی بەبیابانبوون ، ئەمەش بە هۆی دووبارەبوونەوەی كەم بارانی و زیادبوونی ژمارەی دانیـشتوان و زێدەڕۆیی لە بەكارهێنانی ئاو لە ناوچەكەدا.

**خشتەی (١٠) قووڵی هەندێك لە بیرەكانی ناوچەی لێكۆڵینەوە لە ماوەی ساڵانی (١٩٧٦ تا ٢٠٠٥ )**

| بیر | ساڵ | قووڵی/ م | بیر | ساڵ | قووڵی/م |
|---|---|---|---|---|---|
| شارەوانی چەمچەماڵ | ١٩٧٦ | ٦١ | شارەوانی چەمچەماڵ | ٢٠٠١ | ١٦٠ |
| دارستانی بانی مەقان | ١٩٨٠ | ١٥٠ | دارستانی بانی مەقان | ٢٠٠٥ | ١٧٧ |
| بنگرد/ چەمچەماڵ | ١٩٨٢ | ١٠١ | بنگرد/ چەمچەماڵ | ١٩٨٩ | ١٥٠ |
| شۆڕش سەنتەر | ١٩٧٦ | ١١٢ | شۆڕش سەنتەر | ٢٠٠٤ | ١٨٠ |
| تەكیەی كاكەمەند | ١٩٨٨ | ٨٥ | تەكیەی كاكەمەند | ٢٠٠١ | ١٨٠ |
| بانی مەقان / ئنتصار | ١٩٨٧ | ١٥٠ | بانی مەقان/ ئنتصار | ٢٠٠٥ | ١٧٢ |
| چەمچەماڵ / سەنتەر | ١٩٧٦ | ١١٢ | چەمچەماڵ/ سەنتەر | ١٩٩٠ | ١٩٠ |
| كریچنە / سەنگاو | ١٩٧٦ | ١٠٠ | كریچنە/ سەنگاو | ١٩٨٢ | ١٢٠ |
| كریچنە / سەنگاو | ١٩٧٩ | ٨٠ | كریچنە / سەنگاو | ١٩٩٩ | ١٠٥ |
| سەرقەڵا / سەنگاو | ١٩٩٥ | ٩٤ | سەرقەڵا / سەنگاو | ٢٠٠١ | ١٢٥ |
| سەنگاو | ١٩٧٩ | ١٢٠ | سەنگاو | ٢٠٠١ | ١٩٠ |
| شۆڕش / ئۆردگا | ١٩٨٨ | ١٨٥ | شۆڕش / ئۆردگا | ١٩٩٦ | ٢٠٠ |
| گەورەدێ/ ئاغجەلەر | ١٩٨٤ | ٤٥ | گەورەدێ/ ئاغجەلەر | ٢٠٠٥ | ٨٧ |

سەرچاوە:

١ )Gara Bureau , Hydrogelogical Assessment of northern Iraq, investion of Chamchmal basin ,A study presented to FAW: main report, Sulaymanyah:Feb٢٠٠٢ ,Appendix (VI).

٢) بەڕێوەبەرایەتی سەرچاوە ئاوییەكان، بەڕێوەبەرایەتی ئاوی ژێرزەوی، بەشی لێدانی بیری قووڵ، تۆماری بڵاونەكراوە.

**( ٤ ) تێکچوونی تایبه تمەندی خاك:**

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی لە بەشی دووەمدا لەسەر خاکی ناوچەی لێکۆڵینەوە باس کـران، خاکی ناوچەکە لە چوار جۆری سەرەکی پێکهاتووە، یەکەمیان خاکی قـاوەیی سـوور بـاوە لـە ناوچەی تەخت و شەپۆلاوییەکان دەردەکەوێت قووڵاییەکەی کەمــە و لــە پێکهاتــەی کلـسی و گەچی دروست بووە و لە مادەی ئەندامیـدا هـەژارە، کـە دەکاتـە ڕێـژەی (٠,٥٪) وەتوانـای کۆکردنەوەی ڕادەی شێی زۆر کەمە.

جۆری دووەم بریتییە لــە خـاکی قـاوەیی ســەر پێکهاتــەی بــەختیاری زۆرتـرین ڕووبـەری ناوچەکەی پێکهێناوەو قووڵییەکەی زۆر کەمە و ڕێژەی مادەی ئەندامی (١-٢٪) ە.

جۆری سێیەم تەنکە بەردینە خاکە بەخاکی ناکامڵ ناودەبرێت لە ژێر تەنکە چینی (A)دا ڕاستەوخۆ چینی (C) دێت و چینی (B) بەدەگمەن نەبێت بەدی ناکرێـت، ئەمــەش نیـشانەی ئەوەیە، ئەگەر خاکی ئەم ناوچەیە تووشی توێژاڵە ڕماڵین بوو، لەناو دەچێت و دەبێتە خاکێکی بێ بەرهەم و بەبیاباتبوو. جۆری چوارەم خاکی بەردینە قووڵییەکەی مامناوەندییە و لە دامێنی چیاکان دروست بووە.

خاکی ئەم ناوچەیە لەبەر ئەوەی قووڵییەکەی کەمە و لە ئەنجامی پەیڕەوی کردنــی کێڵانــی (وشکە وەرد ، لە هەندێك ساڵدا بەمەبەستی ئامادەکردنی زەوی بۆ کشتوکاڵی گەنم و جـۆ بـۆ ساڵی ئایندە دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی خاکەکە و کاتێك بارانی پەڵە دوابکەوێت بە ئاسانی دەکەوێتە بەر کاریگەری ڕماڵینی هەوایی و دەکەوێتە بەر ڕماڵینی ئاوی لەگەڵ یەکەم بارانی ئەو ساڵەدا بەتایبەتی ئەگەر بارانی لێزمە و لـەناکاو بێـت، چـونکە خاکەکـە بـۆ ماوەیـەکی دوورودرێژ وشك و بێ باران بووە، لەگەڵ کێڵانەکەشدا دەنکۆڵەکانی لەبـەر یـەك هەڵوەشـاوە و دەبێتە هۆی ڕماڵینی مادەی ئەندامی ناو خاکەکە، کە یارمەتیدەرە بۆ پیتــی و یــەکگرتووی خاکەکە.

کەواتە خاکی ناوچەی لێکۆڵینەوە لەو جۆرە خاکانەیە، پێویستە بە وردی چاودێری بکرێـت و بەباشی بەڕێوە ببرێت، ئەگەر نا زۆر بەخێرایی یەکەی توانای بەرهەمی دادەبەزێت و دیاردەی

بەبیابانبوون لەسەری دەردەکەوێت، چونکە کشتوکاڵ کردن لەسەر زەوی تەنکی سەر پێکهاتەی جیری ئەگەری دابەزینی توانای بەرهەمی زۆر خێرایە، کە دەبێتە هۆی دروستبوونی دیاردەی بەبیابانبوون، باشتر وایە ئەم خاکانە بۆ لەوەڕگای سروشتی بەجێ بهێڵدرێت، ئەم جۆرە خاکە زۆر بەئاسانی دەناسرێتەوە و ڕەنگێکی کراوەی سپییە.

پەیڕەوی نەکردنی خولی کشتوکاڵی و چاندنی زەوی بەیەك جۆر بەروبووم بەتایبەتی دانەوێڵە زۆرترین ڕووبەری ناوچەکەی پێکهێناوە، بەپێی ئەو ڕووپێوییەی ڕێکخراوی (فاو) کردوویەتی لە ناحیەی سەنتەر (١٤٥١٨٥دۆنم) و ناحیەی سەنگاو (٨١٣٠٨دۆنم) و ناحیەی ئاغجەلەر (٦٥٠٧٩ دۆنم)[٣٩]، هۆکارێکیشە بۆ دابەزینی توانای بەرهەم و کەمبوونەوەی بەپیتی خاك، چونکە دانەوێڵە یەکێکە لەو بەروبوومانەی ئەگەر خولی کشتوکاڵی لەگەڵ پەیڕەوی نەکرێت بۆ ماوەی چەند ساڵێك دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی پیتی خاکەکە، بەڵام جووتیارانی ناوچەکە لەجیاتی پەیڕەوی کردنی خولی کشتوکاڵی سیاسەتی زەوی بەیار پەیڕەوی دەکەن، یارمەتیدەرە بۆ سەرهەڵدانی دیاردەی بەبیابانبوون. ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی زەوی کێڵراو بە دانەوێڵە. خشتەی (١١)

زۆرترین ڕووبەری زەوی کشتوکاڵی لە ناوچەی لێکۆڵینەوە زەوی دێمییە، کە دەکاتە (٣٦٣٩٨٥ دۆنم)، نزیکەی لە (٨٠٪)ی ئەم ڕووبەرەش دەکرێت بە گەنم و جۆ، لەبەر ئەوەی توانای بەرگەگرتنی بۆ بارودۆخی ئاووهەوایی و خاك لە بەرهەمەکانی تر زۆرترە، پەیڕەوی کردنی ڕواندنی یەك جۆر بەرهەم دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ڕەگەزە خۆراکییەکانی ناو خاك، جگە لەوەی خاکیش لە بەرامبەر کرداری ڕامالێن و داخوران لاواز دەبێت، شێوەیەکە لە شێوەکانی ڕامالێن. زۆربەی لێکۆڵینەوەکان دەیسەلمێنن پەیڕەوی کردنی یەك جۆر بەروبووم بۆ ماوەی (١٠) ساڵ لەسەر زەوییەك دەبێتە هۆی ماندووکردنی خاك و لەناوچوونی پێکهاتەکەی و سەرهەڵدانی دیاردەی بەبیابانبوون.

**خشتەی (١١)   ڕووبەری چێنراوە بە گەنم و جۆ و بڕی بڕشت و بەرهەم لە ناوچەی لێکۆڵینەوە**

| ساڵ | گەنم/دۆنم | بڕشت/کغم | بەرهەم/تەن | جۆ/دۆنم | بڕشت/کغم | بەرهەم/تەن |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٩٠-١٩٩١ | ٣٢٨٤٦٥ | ٢٢٥ | -- | ١٠٤٥٦ | ١٩٢ | -- |
| ١٩٩١-١٩٩٢ | ١٧٧٠٠٠ | ٢٢٠ | -- | ٤٥٣٠٠ | ١٧٠ | -- |
| ١٩٩٢-١٩٩٣ | ١٧٠٠٠٠ | ١٩٠ | ٣٠٤٠٠ | ٥٢٠٠٠ | ١٥٠ | ٧,٨٠٠ |
| ٢٠٠١-٢٠٠٢ | ١٦١٠٠٠ | ٢٢٥,٥ | ٣٦,٣٠٦ | ١٤٢٠٠٠ | ٢٩٢ | ٤١,٤٠٧ |
| ٢٠٠٢-٢٠٠٣ | ١٥٩٠٠٠ | ١٨٥,٤ | ٢٩,٤٧٩ | ١٣٢٠٠٠ | ١٤٨ | ١٩,٥٣٦ |
| ٢٠٠٣-٢٠٠٤ | ١٤٤٠٠٠ | ٢٠٧ | ٢٩,٨٠٨ | ١٠١٠٠٠ | ١٤١ | ١٤,٣٤١ |
| ٢٠٠٦-٢٠٠٧ | ١٠٥٠٠٠ | -- | -- | ٨٤٠٠٠ | -- | -- |

**سەرچاوە/** ئامادەکردنی توێژەر بەپشت بەستن بە: ١) بەڕێوەبەرایەتی ئاماری سلێمانی، بەشی ئاماری کشتوکاڵی، تۆماری بڵاونەکراوە.

٢) وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری، بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی سلێمانی، بەشی پلانادنان و بەدواداچوون، بەشی ئامار، تۆماری بڵاونەکراوە.

٣) وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری، بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان، لقی چەمچەماڵ، تۆماری بڵاونەکراوەی.

٤) دڵشاد تاڵەبانی، واقعی کشتوکاڵ، فاکتەرەکانی پێشخستن لە گەرمیان، گۆڤاری ئابووری، ژمارە (٢) بەهاری ١٩٩٩، ل ٢١.

## ( ٥ ) شۆرەکات ( بەخوێبوونی خاك ):

شۆرەکات یەکێکە لەو فاکتەرانەی کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر سنووردارکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی و کەمکردنەوەو لەناوبردنی بەرهەم لە کاتی زۆری کەڵەکەبوونی بڕی خوێی نیشتوو لەسەر خاك و گۆڕینی بۆ خاکی شۆر، ئەمەش یەکێکە لە گرفتە گەورەکانی کەمبوونەوەی بەرهەمی ڕووەك لە ئەنجامی کەمبوونەوەی توانای یەکەی بەرهەمی خاك[٤٠].

زیادبوونی خوێی ناو خاك لەناو زەوییە بەراوەکاندا لە ئەنجامی چەند هۆکارێکەوە دەبێت، وەك بەرزی ڕێژەی بەهەڵمبوونی ساڵانە بەتایبەتی لەو زەوییە بەراوانەی، کە ئاوی ڕووبار و سەرچاوەو بیرەکانی بەکاردەهێنرێت بۆ ئاودێری ڕێژەیەکی مامناوەندی یان بەرز لە خوێی تواوەی تێدایە، هەروەها پەیڕەویکردنی شێوازی خراپ و نادروست لە ئاودێری، جگە لەوەی تەختی ڕووی زەوی و نەبوونی ئاوداشتنیش هۆکارە بۆ کەڵەکەبوونی خوێ لەناو خاکدا.

دیاردەی شۆرەکات بەشێوەیەکی بەرفراوان شوێنەواری گەورەو کاریگەری لەسەر خاکی ناوچەی لێکۆڵینەوە نییە، وەك ئەوەی لە ناوچەکانی باشوور و ناوەڕاستی عێراق هەیە، بەڵکو تەنیا لە چەند ناوچەیەك بەشێوەی پەڵەی بچووك و پلەی کەم دەردەکەوێت[٤١].

زیادبوونی ڕێژەی خوێ لە خاکدا کاریگەری هەیە لەسەر کەمکردنەوەی توانای بەرهەم، ئەگەر خاك ڕێژەیەکی کەمیش لە خوێی تێدا کەڵەکە ببێت کار لە دابەزینی توانای بەرهەم دەکات، بەم شێوەیە (بەرهەمی لۆکە بەڕێژەی ٥٠-٦٠٪ و بەرهەمی جۆ ٣٠-٤٠٪ و گەنمەشامی ٤٠-٥٠٪ و بەرهەمی گەنم ٥٠-٦٠٪ )[٤٢].

دیاریکردنی پلەی شۆری خاك بەپێی ڕێژەی کەڵەکەبوونی خوێ لەناویدا بەم جۆرەیە:

١- ناوچەی بەبیابانبوون بەپلەی زۆر بەرز ڕێژەی خوێی ناو خاك تێیدا زیاترە لە (١٥ ملیموز/سم).

٢- ناوچەی بەبیابانبوون بەپلەی بەرز ڕێژەی خوێ لە نێوان (٨-١٥ ملیموز/سم).

٣- ناوچەی بەبیابانبوون بەپلەی مامناوەندی ڕێژەی خوێی ناو خاك لە نێوان (٤-٨ملیموز/سم).

٤- ناوچەی بەبیابانبوون بەپلەی لاواز ڕێژەی خوێ تێدا کەمترە لە (٤ ملیموز/سم)[٤٣].

ڕێژەی خوێ و گەیاندنی کارەبایی (التوصیل الکهربائی) لە ئەنجامی زۆری ژمارەی ساڵەکانی بەکارهێنانی زەوی بەراو بە ئاوی ئەو ڕووبارو سەرچاوانەی ڕێژەی خوێی تواوەی تێدا

زۆره زیاد دەکات، ناوچەی لێکۆڵینەوە ژمارەیەك چەم و ڕووباری تێدایە، ڕێژەی خوێی تـواوەی زۆرترە، لە ڕێژەی گونجاو بۆ ئاودێری، وەك ڕووباری سەفیە خنکاو لە قرخ ڕێژەی خوێی تواوەی ئاوی دەگاتە (ppm/٢٠١٠) و ڕووباری دەرزیلە، کـە دەڕژێتـە ئـاوە سـپییەوە ڕێـژەی خـوێ دەگاتە (ppm/٣٠٠٠) بەپێی پێوەری جیهانی نەگونجاوە و ڕووبارەکانی تەکێی بـایز و فـەقێ حاجی و عەلی مەنسوور، کە ڕێژەی خوێی تواوە لە هەر یەکەیاندا دەکاتـە (٨٨٠ – ٨١٠ – ٨٠٠ /ppm)[٤٤]، کـە بـەپێی پێـوەری جیهـانی ڕێژەکـەی بـەرزە، وەك لـە خـشتەی (١٢) دەردەکەوێت.

**خشتەی (١٢) ڕێژەی گونجانی ئاو بۆ ئاودێری بەپێی پێوەری لوکس و پێوەری جیهانی**

| جۆری ئاو | ڕێژەی خوێی تواوەTDS Mg/L | گەیاندنی کارەبایی Ec | ڕێژەی سۆدیوم ppm |
|---|---|---|---|
| زۆرباش | ٥٠٠ کەمتر | کەمتر لە ٢٥٠ | کەمتر لە ٢٠ |
| باش | ٥٠٠ – ١٠٠٠ | ٢٥٠ – ٧٥٠ | ٢٠ – ٤٠ |
| ڕێپێدراو(مامناوەنجی) | ١٠٠٠ – ١٥٠٠ | ٧٥٠ – ٢٠٠٠ | ٤٠ – ٦٠ |
| نیگەران | ١٥٠٠ – ٢٠٠٠ | ٢٠٠٠ – ٣٠٠٠ | ٦٠ – ٨٠ |
| خراپ | ٢٠٠٠ زیاتر | زیاتر لە ٣٠٠٠ | زیاتر لە ٨٠ |

سەرچاوە:١) د. مقدادحسن علی و آخرون، السمات الأساسية للبيئات المائية، دار النشر للشؤون الثقافة العامة، الطبعة الاولى، بغداد ١٩٩٩، ص٢٣٥

٢) د. نضير الأنصاري، مبادىء الهيدرولوجي، مطبعة كلية العلوم، جامعة بغداد ١٩٧٩، ص ١٧٧

٣ ) د. محمد ابراهيم حسن، الأرض والموارد والانتـاج دراسـة تحليليـة مقارنـة، مؤسسة شباب الجامعة اسكندرية ٢٠٠٤، ص ٤٨

وەك پێشتر باسمان کرد، کەڵەکەبوونی خوێ تەنیا لەسەر ڕێژەی خوێی ناو ئـاو نەوەسـتاوە، بەڵکو زۆری کرداری بەهەڵمبوون لە ناوچەی لێکۆڵینەوە، دەکاتە (٢٠٩٣,٣ملم)، ئەم ڕێژەیـە هەرچەندە زۆر زۆر بەرز نییە بەڵام کاریگەری هەیە لەسەر کرداری بەهەڵمبوون و کۆبوونـەوەی خوێ لەسەر زەوییە بەراوەکان بەتایبـەتی لـە وەرزی هاوینـدا، کاریگەریـشی لەسـەر وشـکی

فزیولوجی هەیە، واتە نەبوونی یان کەمبوونەوەی توانای ڕووەك بۆ مژینی ئاو، کەمبوونەوەی ڕەگەزە خۆراکییەکان بەهۆی شۆرەکاتەوە.

پەیڕەویکردنی شێوازی دواکەوتوو لەئاودێری و نەبوونی بەڕێوەبردنێکی گونجاو و چالاك لەناوچەی لێکۆڵینەوە، دەبێتە هۆی لەدەستدانی بڕێکی زۆر لە ئاوی سەرزەوی لە ئەنجامی کرداری بەهەڵمبوون و ڕۆچوونە ناو خاکەوە، هەروەك لێکۆڵینەوە زانستییەکان سەلماندوویانە ڕێژەی لەدەستچوونی ئاوی سەر زەوی لە ناوچەی نیمچە وشك دەگاتە (٦٠٪) ئەگەر بەشێوازی کۆن بێت، بەڵام ئەگەر بەپرژاندن بێت ڕێژەی لەدەستچوونی ئاو (١٥٪) یە، ئەگەر بەڕێگای دڵۆپاندن بێت لە (٥٪) کەمترە[٤٥].

کەواتە ئەگەر ڕووبارێك ڕێژەی خوێیەکەشی کەم بێت، بەڵام بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بۆ ئاودێری زەوی بەراو بەکاربهێنرێت بەبێ ڕەچاوکردنی شێوازی دروست و گونجاو لە ئاودێری و ئاوداشتن، ئەوا بۆ ماوەی چەندین ساڵ ڕێژەیەکی زۆر خوێی تێدا کۆدەبێتەوە بۆ نموونە:

١ - ئەگەر ڕووبارێك ڕێژەی خوێی تواوەی (ppm/٣٠٠) بێت واتە (٣٠٠ملگرام/لیتر)

٢ - ئەگەر بڕی ئاودان لە ماوەی ساڵێکدا بۆ هەر یەکەیەکی ڕووبەر (١٠٠٠لیتر/م²) = ١٠٠٠ملم.

٣ - بڕی خوێ لەناو یەکەی ڕووبەر لە ماوەی ساڵێکدا دەکاتە (٣٠٠گرام/م²).

٤ - دوای پەنجا ساڵ (١٥کغم/م²). "ئەگەر باران زیاد نەکات و فاکتەرەکان بەردەوام بن"

٥ - ڕێژەی سەدی بەخوێبوون دوای پەنجا ساڵ لە پانە بڕگە خاکێکدا، کە ئەستوورییەکەی (١م) بێت دەکاتە (١٪)، ئەم ڕێژەیەش لە دەرەوەی سنووری بەرهەمی کشتوکاڵی دەژمێردرێت[٤٦].

## ( ٦ ) گەردەلوولی لماوی ( العواصف الغبارية ):

گەردەی خاك بەزەوییەوە نووساون و هێزی پێوەلکانیان ون نابێت، ئەگەر هۆکارێکی دەرەکی نەبێت، وەك هەڵکردنی با، هەتا خێرایی با زۆرتر بێت زەوی توانای گرتنەخۆی گەردەی خاکی کەمتر دەبێت ، گەر پۆشاکی ڕووەکی نەبێت[٤٧]. وە ئەگەر بایەکە لەوەرزی

وشك و ناوچەی وشكەوە بێت و خێراییەكەی چەند زۆرتـر بێـت، ئەوەنـدە توانـای هـەڵگرتن و گواستنەوەی گەردوتۆزی زۆرترە بەهۆی فشەڵی خاكەوە.

بەدرێژایی ساڵ با هەڵدەكاتە سەر ناوچەی لێكۆڵینەوە، بەڵام زۆرتـرین دووبـارە بوونـەوەی ئاراستەكەی لە باشوور و باشووری ڕۆژئاوایە، بەگشتی گەرم و وشك و تەپوتۆزاوییە بەتایبەتی لە وەرزی هاویندا ئەمەش هۆكارێكە بۆ دروسـتبوونی گـەردەلوولی لمـاوی، وەك یەكێكـە لـە دیاردەكانی بەبیابانبوون، ئەگەر سەیرێكی خشتەی (١٣) بكەین ناوچەی لێكۆڵینـەوە سـاڵانە نزیكەی (٤٥) ڕۆژ خۆڵبارانی هەیە بەڕێژەی جیاواز وە زۆرترینیان لە مانگەكانی هاویندایـە و كەمترینیان لە مانگەكانی زستاندایە.

**خشتەی (١٣) ژمارەی ڕۆژەكانی گەردەلوولی لماوی و بڕی تۆزوغوبار و تێكڕای مانگانە بە(گم/م$^2$) لە ناوچەی لێكۆڵینەوە**

| مانگ | ك/٢ | شبات | مارت | نيسان | مايس | حزيران | تەموز | ئاب | ئەيلول | ت/١ | ت/٢ | ك/١ | تێكڕای |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| گەردەلوولی لماوی | ٠,٢ | ٠,٣ | ٠,٣ | ٠,٥ | ٠,٩ | ٠,٤ | ٠,٣ | ٠,٤ | ٠,٣ | ٠,٧ | ٠,٣ | ٠,١ | ٤,٧ |
| تۆزوغوبار/ ڕۆژ | ١,٧ | ١,٢ | ٣,٢ | ٤,١ | ٥ | ٦,٩ | ٨,٩ | ٥,٣ | ٤,١ | ٣,٥ | ١,٣ | ٠,٨ | ٤٥ |
| تووزوغوبار گم/م$^2$ | ١٥ | ١٢,٧ | ١٧,٢ | ١٩,٤ | ١٩,٨ | ٢٥,٣ | ٢٦,٨ | ٣٤,٤ | ٣١,٧ | ٢٧,٧ | ٣٢ | ٢٩,٥ | ٢٥,٩ |

سەرچاوە/ كاری توێژەر بەپشتبەستن بە: ١) سليمان عبدالله اسماعيل، العواصف الغبارية والترابية في العراق، تصنيفها وتحليلها، مجلة الجمعية الجغرافية العراقية، العدد ٣٩، حزيران ١٩٩٩، المصدر السابق، ص ١٢٥-١٢٧.
٢) جمهورية العراق، وزارة البيئة، دائرة التخطيط والمتابعة الفنية، تقرير حالة البيئة فی العراق لعام ٢٠٠٥، تموز٢٠٠٦، ص ٢١.

سەرەڕای ئەوەش تێكڕای ساڵانەی ئـەو گەردەلوولـە لماوییـەی هەڵدەكاتـە سـەر ناوچـەكە دەگاتە (٤,٧) جار، لە ئەنجامی ئەو گەردەلوول و تۆزو غوبارەی ناو هـەوا تێكـڕای مانگانـە گەردوتۆزی باریو لە ناوچەكە دەكاتە (٢٥,٩گم/م$^2$) لە مانگێكدا. وەنزمترین ڕادەی خۆڵبـاران لە مانگی شوباتدا دەكاتە (١٢,٧گم/م$^2$) و بەرزترین ڕادەش لەمانگی ئابدایە دەكاتە (٣٤,٤ گم/م$^2$).

ڕووی زەوی و جیۆمۆرفولوجیای ناوچەی لێکۆڵینەوەش یارمەتیدەرە بۆ دروستبوونی گەردەلوولی لماوی بەتایبەتی لە ناوچەکانی باشوور و ڕۆژئاوا، چونکە بەگشتی بەرزایی کەمەو لە شێوەی دۆڵێکی فراواندایە و کەوتۆتە نێوان زنجیرە چیاکانی قەرەداغ و سەگرمە و بازیان لە ڕۆژهەڵات و بانی گەورەی کەرکوك لە ڕۆژئاوا. هەروەها کەمبوونەوەی ڕووەکی سروشتی و ڕووبەری کشتوکاڵی و بەجێهێشتنی زەوییەکان بەشێوەی بەیار یارمەتیدەرە بۆ دروستبوونی گەردوتۆزی هەڵواسراو لەناو هەوادا و ڕوودانی گێژەڵووکە، وەك شێوەیەکە لە شێوەکانی دیاردەی بەبیابانبوون.

## تەوەری دووەم/

## پۆلێنکردن و دابەشبوونی جوگرافی بەبیابانبوون لە قەزای چەمچەماڵ:

لە باسی پێشوودا باسمان لە شێوە و دیاردەکانی بەبیابانبوون کرد، ئەم باسەش بۆ پۆلێنکردن و دابەشبوونی جوگرافی دیاردەی بەبیابانبوون لە ناوچەی لێکۆڵینەوە و هۆکاری دروستبوونی بەپێی جیاوازی پلەیان لە ناوچەکە تەرخان کراوە، بۆ ئەم مەبەستەش سوود لە لێکۆڵینەوەی مەیدانی وەرگیراوە، کە توێژەر پێی هەڵساوە لەگەڵ شیکاری ئەو داتایانەی لە ناوچەکە لەسەر ئاووهەواو بەروبوومە کشتوکاڵییەکان دەستکەوتووە و پرسیارکردن لە پسپۆران و جووتیارانی ناوچەکە.

پێش ئەوەی بچینە ناو باسەکەمانەوە بەپێویستی دەزانم ئاماژە بۆ ئەوە بکەم توێژەران و پسپۆرانی جوگرافی دوو بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەسەر کاریگەری پلەی بەبیابانبوون لە ناوچە جیاوازەکانی جیهان. بۆچوونی یەکەمیان پێیوایە فاکتەری وشکی کاریگەری زۆرتری هەیە لەسەر ئەم دیاردەیە، لەبەر ئەوە هەتا ئاووهەوای ناوچەکە وشکی زۆر تربێت پلەی سەرهەڵدانی دیاردەی بەبیابانبوون بەرزترە، بەڵام پلەی بەبیابانبوون کەم دەکات لەگەڵ کەمبوونەوەی ڕادەی وشکی واتە تاوەکو بەرەو ناوچەی شێدار بڕۆین، ئەمە زیاتر بۆچوونی ئەوانەن، کە پێیان وایە بەبیابانبوون دیاردەیەکی سرووشتییە و لەسەر ئەم بنەمایەش ناوچەکان دابەش دەکەن بۆ چوار پلە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

(١) پلەی بەبیابانبوونی زۆر بەرز لەو ناوچانەی ئاووهەوا زۆر وشك و برنگە (قاحل).

(٢) پلەی بەبیابانبوونی بەرز لە ناوچەی وشك.

(٣) پلەی بەبیابانبوونی مامناوەندی لەناوچەی نیمچە وشك و نیمچە شێدار.

(٤) پلەی بەبیابانبوونی نزم لەناوچەی شێدار. ڕێکخراوی (FAO) پشتگیری لەم بۆچوونە کردووە و پێشنیاری دروستکردنی نەخشەیەك لەسەر بنەمای ناوچە بەبیابانبووەکان لەجیهاندا کرد و پێشکەش بەکۆنگرەی نێودەوڵەتی بۆ بەبیابانبوون لە نایرۆبی کرا[٤٨].

بۆچوونی دووەم پێیوایە پلەی بەبیابانبوون لەسەر کاریگەری و فشاری مرۆڤ لەسەر سەرچاوەکانی زەوی وەستاوە، لەبەر ئەوەی چڕی دانیشتوان لە ناوچە وشکەکان کەمە، بۆیە کاریگەری مرۆڤ لە ناوچە وشکەکان کەمە و تاوەکو بەرەو ناوچەی شێدار بڕۆین زۆر دەبێت لە ئەنجامی زۆربوونی چالاکی مرۆڤ بەتایبەتی (کشتوکاڵی و لەوەڕاندن)، بۆیە پێیان وایە ناوجەرگەی بیابانەکان کەمترین کاریگەری بەبیابانبوونی لەسەرە، بەڵام تاوەکو بەرەو ناوچەی نیمچە وشك و شێدارەکان بڕۆین کاریگەرییەکە لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان و چالاکییەکانی زیاد دەکات، ئەمانە پێیان وایە بەبیابانبوون هۆکارێکی مرۆییە و بۆیە پێی دەڵێن (بیابانی مرۆڤکرد Mans desert)[٤٩].

لەسەر ئەم بنەمایەش ناوچەکانی جیهان دابەش دەکەن بۆ چوار پلە بەم شێوەیەی خوارەوە:

(١) پلەی بەبیابانبوونی لاوازە لە ناوچەی زۆر وشك و برنگ (قاحل).
(٢) پلەی بەبیابانبوونی مامناوەندی لە ناوچەی وشك.
(٣) پلەی بەبیابانبوونی بەرزە لە ناوچەی نیمچە وشك و نیمچە شێدار.
(٤) پلەی بەبیابانبوونی زۆربەرزە لە ناوچەی شێدار.

بەڵام بۆچوونی ڕاست و دروست ئەوەیە، کە هەردوو بۆچوونەکە بەپلەی جیاواز کاریگەری جیاوازیان لە ناوچەکاندا هەیە، بۆنموونە کاریگەری سروشتی لە ناوچەی وشك و نیمچە وشك زۆرترە لەکاریگەری مرۆیی، بەڵام لە ناوچەی شێدار و نیمچە شێدار کاریگەری مرۆیی زۆرترە لە کاریگەری سروشتی، بۆ زانیاری وردتر و زیاتر لەسەر دابەشبوونی پلەی بەبیابانبوون لە جیهاندا لەسەر بنەمای پۆلێنی ئاووهەوایی وەکاریگەری فاکتەری مرۆیی و سروشتی (وشکی) بڕوانە شێوەی ژمارە (٢).

**شێوەی (٢) کاریگەری سروشتی و مرۆیی لەسەر دیاردەی بە بیابانبوون بە پێی هەرێمە ئاووهەواییەکان**

کاریگەری وشکی

| | | |
|---|---|---|
| زۆر بەرز | وشك وبرنگ | لاواز |
| بە رز | وشك | مام ناوەندی |
| مام ناوەندی | نیمچە وشك و نیمچە شێدار | بەرز |
| لاواز | شێدار | زۆر بەرز |

کاریگەری مرۆیی

سەرچاوە: کاری توێژەر بە پشتبەستن بە پێشنیازەکەی رێکخراوی فاو.

هەروەها دوو هۆکار پلەی مەترسیداری سەرهەڵدانی دیاردەی بەبیابانبوون لەهەر ژینگەیەکدا دیاری دەکات کە بریتین لە:

**یەکەم/** هەستیاری ژینگە بەواتا ئایا ژینگەکە لاوازە یان بەهێزە لەبەردەم دیاردەکەدا و پلەی بەرگەگرتنی لەسەر سروشتی ئایکۆلۆجی چەندە ؟ ئایا ڕەگەزە سروشتییە زیندەو نازیندووەکان فشەڵە یا نا؟ بۆ ناسینەوەی فشەڵی خاك لە ناوچەی لێکۆڵینەوە سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین ناوچەی ئاووهەوای وشك و نیمچە وشك بەژینگەی فشەڵ دادەنرێت لە ڕووی ئاووهەوایی و تۆبۆگرافییەوە لەبەر ئەم هۆیانە[٥٠]:

١) لە ئەنجامی کەمی بارانی ناوچەکە و هەژاری بەڕووپۆشی ڕووەکی هەمیشەیی.

٢) کۆبوونەوەی کرداری دابارین لەچەند وەرزێکدا دەبێتە هۆی گەشەکردنی ڕووەکی سروشتی لە وەرزی باران و وشکبوونی لە وەرزی بێبارانـدا، ئەمەش کاریگەری لەسەر وشکبوونەوەی خاك لەبەرامبەر بای وشکدا هەیە.

٣) دووبارە بوونەوەی وشکەساڵی لە ناوچەی نیمچەوشك کاریگەری نەگەتیف و ڕاستەوخۆی لەسەر خاك و ڕووپۆشی ڕووەك و ئاوی ژێرزەوی دەبێت.

٤) هەژاری خاك بە مادەی ئەندامی.

٥) بەرزایی شاخ و لاپاڵ و گردۆڵکەکان و پلەی لێژییان بەناوچەی فشەڵ دادەنرێت، بەتایبەتی ئەگەر ناوچەکە هەژار بێت لەرووی ڕووپۆشی ڕووەك بەگشتی و دارستان بەتایبەتی، لەبەر ئەوەی ڕێکردنی ئاوی باران و ئاوی سەرزەوی دەبێتە هۆی ڕامالینی خاك و لەناوچوونی.

**دووەم/** پلەی فشاری مرۆڤ و ئاژەڵ لەسەر سەرچاوەکانی ژینگە[٥١] ، بەپێی ئەو شێوەیەی پێشەوە ناوچەی لێکۆڵینەوە، لەبەر ئەوەی کەوتۆتە ناوچەی نیمچە وشکەوە کاریگەری وشکی لەسەر پلەی بەبیابانبوون مامناوەندییە، بەلام کاریگەری مرۆیی لەسەر دیاردەی بەبیابانبوون بەرزە، وەئەمەش زەنگێکی مەترسیدارە، ئەگەر بێت و بەشێوەیەکی ژیرانە و زانستییانە هەڵسوکەوت، لەگەڵ سەرچاوە سروشتییەکانی ئەو ناوچەیە نەکەین.

کاریگەری مرۆیی لەهەر ناوچەیەك لە هەرێمی کوردستان و ناوچەی لێکۆڵینەوەش وەستاوە لەسەر زیادبوونی دانیشتوان و چالاکییەکانیان لە بواری کشتوکاڵ و لەوەڕاندن و دار بڕین بەشێوازی ژیرانە و زانستییانە، کە بگونجێت لەگەڵ هەلومەرجی سروشتی ناوچەکەدا و لەم سێ خاڵەدا کۆی دەکەینەوە[٥٢]:

١/ بەکەرخستنی (استغلال) چروپڕ و بەڕێوەبردنی نارێکوپێکی ڕووەکی سروشتی و زەوی کشتوکاڵی دێم.

٢/ خراپ بەکەرخستن و بەڕێوەبردنی زەوی بەگشتی.

٣/ خراپ بەڕێوەبردنی سەرچاوەکانی ئاو.

بۆیە زۆر لەو توێژەر و زانایانەی بەشدارییان لە کۆنگرەی نێودەوڵەتی نایرۆبی کرد، پێیان وابوو بەبیابانبوون کردارێکی مرۆییە زیاتر لەوەی ئاووهەوایی بێت.

ناوچەی لێکۆڵینەوە لەبەر ئەوەی یەکەم ناوچەیە لەجیهاندا مرۆڤ لەسەری نیشتەجێ بووە و یەکەم چالاکی کشتوکاڵ و لەوەڕاندن لەم ناوچەیە پراکتیزە کراوە، کەواتە دەکرێت بڵێین بۆ یەکەمین جار لە جیهاندا کاریگەری مرۆڤ لەسەر زەوی کشتوکاڵی لەم ناوچەیە بووە.

ئەمڕۆش کاریگەری مرۆڤ لە ناوچەکە بەپێی ژمارە و چالاکییەکانی هەڵدەسەنگێنین. چڕی دانیشتوان لە قەزای چەمچەماڵ لە ساڵی (٢٠٠٢) دەکاتە (٦٢ کەس/کم$^{٢}$)، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە چڕی دانیشتوان سێ ئەوەندە زیاترە لەو ڕێژەیەی، کە نەتەوەیەکگرتووەکان کردوویانە بەپێوەر بۆ چڕی دانیشتوان لە ناوچەی نیمچە وشك، کە دەکاتە (٢٠ کەس/کم$^{٢}$)[٥٣].

وەئەم زیادبوونەش لە ماوەیەکی پێوانەی کورتدا بووە، لە ساڵی (١٩٥٧) چڕی دانیشتوان بریتی بووە لە (١٤,٤کەس/کم$^{2}$)، واتە لەماوەی (٤٥) ساڵدا (٤,٣) ئەوەندە زیادی کردووە، ئەمەش بەڵگەی زۆری فشاری دانیشتوانە لەسەر زەوی کشتوکاڵی و سەرچاوەکانی ئاو.

چڕی دانیشتوان بەپێی ناحیەکانیش لە زیادبووندا بووە، بەڵام بەرێژەی جیاوازو نایەکسان بۆ نموونە ناحیەی سەنتەر لە ساڵی (٢٠٠٢)دا چڕییەکەی نزیکەی دوو ئەوەندەی چڕی قەزاکەیە، کە دەکاتە (١١٢,٥کەس/کم$^{2}$) ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری ڕاگوێزانی هەموو گوندەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە، لەگەڵ هەردوو ناحیەی سەنگاو و ئاغجەلەر لە ساڵی (١٩٨٨) بۆ ئۆردوگای شۆڕشی سەر بەناحیەی سەنتەر، کەواتە لەم ناحیەیە چڕی دانیشتوان لە پێنج ئەوەندە و نیوی ئەو ژمارەیەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دیاری کردووە زیاترە. ناحیەی ئاغجەلەریش چڕییەکەی دەکاتە (٢٣,١کەس/ کم$^{2}$)، کە دەتوانین بڵێین گونجاوە لەگەڵ پێوەری نەتەوە یەکگرتوەکان، بەڵام ناحیەی سەنگاو چڕییەکەی کەمترە لەپێوەری نەتەوە یەکگرتوەکان دەکاتە (١٣,٥ کەس/کم$^{2}$) کەواتە بەگشتی فشاری دانیشتوان لە ناحیەی سەنتەر زۆر زۆرە و لە ناحیەی ئاغجەلەر مامناوەندییە، بەڵام لە ناحیەی سەنگاو کەمە.

لە خوارەوە دابەشبوونی جوگرافی ناوچە بەبیابانبووەکانی سنووری ناوچەی لێکۆڵینەوە باس دەکەین بەپێی هۆکارەکانیان:

**یەکەم / ناوچەی بەبیابانبوون بەهۆی ڕامالینی خاکەوە:**

وەك پێشتر باسمان کرد ناوچەی لێکۆڵینەوە بەگشتی دەکەوێتە بەر فاکتەری (ئاوی و هەوایی) بەشێوەیەك لەشێوەکان یان هەردووکیان پێکەوە. کرداری بەبیابانبوون لە ئەنجامی ڕامالینەوە دروست دەبێت لە شێوەی بەهێز یان زۆر بەهێز، ئەگەر ڕێژەی (٧٥٪)ی خاکەکەی وەك لە ناوچە زۆر لێژەکاندا ڕوودەدات، ڕامالرێت. ناوچەی لێکۆڵینەوە دەناڵێنێت بەدەست کرداری ڕامالینی ئاوییەوە بەپلەی جیاواز بەپێی جۆری خاك و چینەکانی ناوەوەی، پێکهاتەی بەختیاری خواروو (مقدادیة) و فارسی سەروو (ئینجانە) لە ناوچەی لێکۆڵینەوە تووشی ڕامالینی قووڵ بووە لە جۆری کەندرە ڕامالین[٥٤].

بەپلەی یەکەم دیاردەی ڕامالینی ئاوی لە بەشەکانی ڕۆژهەلاتی ناوچەی لێکۆڵینەوەدا دەردەکەوێت، ئەویش بەهۆی زۆر لێژی خاکەکەو کەمبوونەوی ڕووپۆشی ڕووەکەوە، لە ئەنجامی سووتاندن و بڕینەوەی دارەکان بەشێوەی هەڕەمەکی و بڕی بارانی زۆر بە بەراورد بەبەشەکانی

تری ناوچەکە لە ئەنجامی بەرزی لەئاستی ڕووی دەریاوە، چونکە هەروەك دەزانین هەر (۳۳م) بەرز بینەوە لەئاستی ڕووی دەریا بڕی باران بەڕێژەی (۱-٥٪) زیاد دەکات[٥٥].

سێ هۆکار دیاردەی ڕامالینی ئاوی خێراتر دەکات بریتییە لە:

۱- **باران بەشێوەی گەردەلوولی توند و بەلێزمە.**

۲- **زۆری بڕی ئاوی ڕێکردوو لەسەر خاك.**

۳- **درێژی ماوەی لێژییەکە.**

قەبارەی ڕامالینی ئاوی لەسەر قەبارەی دلۆپی بارانەکە وەستاوە، لەبەرئەوەی دلۆپی گەورەی باران توانای هەلۆەشاندنی خاکی زیاترە، چونکە لەگەل گەورەیی دلۆپەکان و چڕی بارانەکە کاریگەرییەکەی زیاد دەکات، ئەگەر توانای دلۆپە بارانێك تیرەکەی (٤,٥ ملم) بێت، توانای ڕامالینی (۵۰۰ جار زیاترە لە دلۆپێك کە تیرەکەی (۱ملم) بێت[٥٦].

دیاردەی ڕامالینی ئاوی بەپلەی یەکەم دەوروبەری ئەو گوندانە دەگرێتەوە، کە دەکەونە نزیك ناوچە بەرزاییەکانَ وەك گوندەکانی{بانی مۆرد، کێلەبەرزە، حسن کەنۆشی خواروو، هەزارکانی، ژالە، کربچنە، کانی خاکی، گۆمەزەرد، تەپەسوورە، تەپەسوورەی حەمەڕەزا }، لە ناحیەی سەنگاو ڕووبەرەکەیان دەکاتە (۷۸۳۳۱) دۆنم. گوندەکانی{ژالەی دەربەند، سۆفی حەسەن، کانی مستەفا، ماولە، خوامراد، کانی چنارە، تەکیەی کاك عەبدولا، کانی بناو}، لە ناحیەی سەنتەر ڕووبەرەکەیان دەکاتە (٤٢٤٨٥) دۆنم. گوندەکانی {شێخ وەیس، خربندەلو، گەورەدێ، کانی بی، قوجلەر، سوتکە، خرج خرج، بولکین }، لە ناحیەی ئاغجەلەر ڕووبەرەکەی دەکاتە (٤٩٦٩٦) دۆنم[٥٧].

لە بەشی ناوەڕاست بەلای باشووری ڕۆژئاوای ناوچەی لێکۆلینەوەش چەند بەرزاییەکی لێیە، کە بەرزییەکەیان لە هەزار مەتر زیاترە و یارمەتیدەرە بۆ دروستبوونی دیاردەی ڕامالین بەپلەی بەهێز، لەبەرئەوەی ئەو ناوچانە هەژارە بە ڕووپۆشی ڕووەکی بەتایبەتی هیچ دارستانێکی لێ نییە، وەك بەرزاییەکانی ئاژداخ (۱۲٦٤م) لە باشوور و ناوەڕاستی ناحیەی سەنگاو لەم گوندانە پێکهاتووە{پێنج ئەنگوستی سەروو و خواروو، جامڕێز}، کە ڕووبەرەکەیان دەکاتە (۱۲٥۰۱) دۆنم. چیای قەرە وەیسیش دەکەوێتە ڕۆژئاوای ناحیەی سەنگاوەوە پێکهاتووە لە گوندەکانی (کێلان، عزەت ئاوا، سەرقەلا)، ڕووبەرەکەی دەکاتە

(١٣٠٦٩) دۆنم، تێکڕای ڕووبەری داماڵراو لە ناوچە جیاجیاکـانی ناحیـەی سـەنگاو دەکاتـە (١٠٣٩٠١) دۆنم.

کەواتە دیاردەی ڕاماڵینی ئـاوی بەپلـەی جیـاواز لـە هەرسـێ ناحیـەی سـەر بەناوچـەی لێکۆڵینەوە دەردەکەوێت، کە بریتییـە لـە (١٢,١٪) لـە ناحیـەی سـەنتەر و (٢٧,٦٪) لـە ناحیەی سەنگاو و (١٨,٣٪) لە ناحیەی ئاغجەلەر، بەگـشتی ڕووبـەری ڕامـاڵینی ئـاوی لـە قەزای چەمچەماڵ دەکاتە (١٩,٦٪).

ناوچەی لێکۆڵینەوە کاریگەری ڕاماڵینی هەواییشی لەسەرە، بـەڵام بەپلـەی کـەمتر و لـە ڕووبەرێکی بچووکتر لەو ناوچانەی کرداری ڕاماڵینی ئاوی لەسەرە، بەهۆی نـەبوونی ڕووپۆشـی ڕووەك بەتایبەتی لە وەرزی وشکی هاوین و تەنکی خاکی ناوچەکە و کەمی مـادەی ئەنـدامی (کە هۆکارێکە بۆ یەکگرتووی دەنکۆڵەکانی ناو خاك) و تەختی ڕووی زەوییەکە بەبـەراورد بـە ناوچەکانی تر و خێرایی با، دەبێتە هـۆی هەڵوەشـاندنەوەی گـەردەکانی خـاك و گواسـتنەوەی بـەهۆی بـاوە و دەرکـەوتنی تاوێرەکـان و چـینی ژێـرەوەی خـاك بەشـێوەیەکی بەرچـاو لـە سنوورەکانی باشوورو ڕۆژئاوای هەر دوو ناحیەی سەنگاو و سەنتەر بەتایبـەتی لـە گونـدەکانی {مەسۆیی ڕەحیم، تەپەی عەرەب، درۆزنـە، مەسـۆیی بـچووك، مەسـۆیی بەرگـەچ، دەرواری خواروو، کانی بـەکتاش، داربـەڕوو }[٥٨] سـەر بەناحیـەی سـەنگاون و ڕووبەرەکـەی دەکاتـە (٤٠٧٧٤) دۆنم و گوندەکانی { بنگرد، پیریادی، مزەفەرە، فەیزاوا، عوسمان غەزال، سـوزگە، تەپەدێ } لە ناحیەی سەنتەرن و ڕووبەرەکەی دەکاتە (٤٩١٩٨) دۆنم (بەڵام مانای وانییە ئەم ناوچانە کاریگەری ڕاماڵینی ئاوی لەسەر نییە)، بەم جۆرە ڕێژەی ڕاماڵینی هەوایی لەناوچـەی لێکۆڵینەوە دەکاتە (٩,١٪) بۆ هەریەك لـە ناحیـەی سـەنتەر و سـەنگاو بەڕێـژەی (١٤٪) و (١٠,٨٪) یەك بەدوای یەك، بەڵام ناحیـەی ئاغجەلـەر زۆر کەمـە. وە بـاقی ناوچـەکانی تـر کاریگەری هـەردوو کـرداری ڕامـاڵینی (ئـاوی و هـەوایی) لەسـەرە بەڕێـژەی (٧١,٣٪) بـۆ سەرجەمی ڕووبەری قەزاکە، ناحیەی سەنتەر دەکاتە (٧٣,٩٪) و ناحیەی سـەنگاو (٦١,٦٪) و ناحیەی ئاغجەلەر (٨١,٧٪). (نەخشەی ٤)

# نەخشەی ژمارە (٤)

کرداری راماڵین ناوچەی لێکۆڵینەوە




سەرچاوە: کاری توێژەر بەپشتبەستن بە

١- د. رعد جورج میخا، خارطة اصناف الارض وقابلية الارض للزراعة، خارطة غير منشورة.

٢- لێکۆڵینەوەی مەیدانی لە سنووری ناوچەی لێکۆڵینەوە.

**دووەم / ناوچەی بەبیابانبوون بەهۆی تێکچوونی ڕووپۆشی ڕووەکەوە:**

تێکچوونی ڕووپۆشی ڕووەك بە هەردوو جۆرەکەیەوە (دارستان و گژوگیا) لە ناوچەی لێکۆڵینەوە دەگەڕێتەوە بۆ خراپ بەکارهێنانی لەلایەن مرۆڤەوە بەپلەی یەکەم و دووبارە بوونەوەی وشکەساڵی بەپلەی دووەم، نەمانی ڕووپۆشی ڕووەك لە هەر ناوچەیەك یان گۆڕانی لە شێوەی باشەوە بۆ شێوەی خراپ یان کەمبوونەوەی لەڕووی چڕییەوە بەدیاردەی بەبیابانبوون دادەنرێت، وەك لە نەخشەی (٤) دا دیارە، تێکچوونی ڕووپۆشی ڕووەك لەم چەند دەیەی دواییدا بەئاشکرا هەستی پێدەکرێت، هۆکاری تێکچوونی هەر یەکە لە دارستان و گژوگیا جیاوازە، بۆیە پێویستە هەریەکەیان بەجیا باس بکەین:

**(١) ناوچەی بەبیابانبوون بەهۆی لەوەڕاندنی بێ سەرپەرشتەوە:**

لەوەڕاندن یەکێکە لە چالاکییە بەرفراوانەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە و بەیەکێك لە فاکتەرە مرۆییەکان دادەنرێت، کە دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە سەرچاوە سروشتییەکان و بەتایبەتی زەوی.

تێکچوونی لەوەڕگا لە ئەنجامی لەوەڕاندنی ستەمکار (جائر) و پێشوەخت و زۆری ژمارەی ئاژەڵەکانی ناو لەوەڕگاکان بۆ ماوەیەکی درێژ، کە لەتوانای لەوەڕگاکان زۆرترە و سووڕانەوە و لێخوڕینی ئاژەڵەکان لەناو ئەو لەوەڕگایانەی گژوگیای لێ نەماوە و بردنیان بۆ سەر لەوەڕگا دوورەکان دەبێتە هۆی تێکچوونی چینی سەرەوەی خاکەکە لە وەرزی وشکدا و بەباکردنی خۆڵەکەی، لە وەرزی شێداریشدا دەبێتە هۆی پەستانەوەی ڕووی زەویەکەو توانای داچۆڕانی ئاوی کەم دەبێتەوە، ئەمە دیاردەیەکە ڕۆژانە و ساڵانە لە ناوچە نیمچە شاخاوییەکان بەگشتی و ناوچەی لێکۆڵینەوە بەتایبەتی دووبارە دەبێتەوە.

زۆربوونی ژمارەی ئاژەڵەکان بەڕێژەیەکی بەرچاو وەك لەپێشوو باسمان کرد، کە نزیکەی (٢,٦) جار زیادی کردووە لە ماوەی نۆ ساڵدا ئەمەش زۆر لە توانای لەخۆگرتنی لەوەڕگاکان زۆرترە، لە کاتێکدا ئەگەر بزانین توانای پشتبەستن بە لەوەڕگای سروشتی لە ناوچەی لێکۆڵینەوە دەکاتە (٤٢,٥٦٪)، ئەم ڕووبەرە و تواناکەی بۆ ئەو ژمارە ئاژەڵە زۆر کەمە و بەپێی ناحیەکانیش جیاوازە لە کاتێکدا ناحیەی سەنگاو توانای پشتبەستن بە لەوەڕگای سروشتی زۆر کەمترە لە دوو ناحیەکەی تر و دەکاتە (٢٨,٢٪) بەڵام ژمارەی مەڕ تێدا لە ساڵی (٢٠٠٨) زیاتر بووە لە هەردوو ناحیەکەی تر و دەکاتە (٢٠٦٧٩٦) سەر، هەروەها یەکەی ئاژەڵی لە ناحیەی سەنگاو لە ساڵی (٢٠٠٠)دا زۆر زیاتر بووە لەو ڕێژەیەی نەتەوەیە کگرتووەکان دایناوە، بریتییە لە (١,٣) یەکە، واتە لە باشترین حاڵەتدا ڕێژەی لە (٣٠٪)

زیاتر بووە لەو پێوەرەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ یەکەی ئاژەڵی ناوچەی نیمچە وشکی دانــاوە، لە ناحیەی سەنتەر لە ساڵی (٢٠٠٢)دا گەیشتۆتە (١,٤) ئەم ژمارە زۆرەی ئاژەڵ لە ناوچەکە بووەتە هۆی تێکچوونی خێرایــی ڕووپۆشــی ڕووەك و هۆکارێکــە بــۆ ئاســانی ڕامــاڵین و کەمبوونــەوەی توانــای ژینگــەیی و ســەرئەنجام ســەرهەڵدانی دیــاردەی بــەبیابانبوونی بەهێز[٥٩].

## نەخشەی ژمارە (٥)

ناوچەکانی بەبیابانبوون بەهۆی تێکچوونی رووپۆشی رووەك لەناوچەی لێکۆڵینەوە.




سەرچاوە: کاری توێژەر بەپشتبەستن بە

١- لێکۆڵینەوەی مەیدانی کە توێژەر پێی هەستاوە.

٢- عبد محور نجم الرحانی (المصدر السابق) ص٩٨.

هەر بۆیە لە ئەنجامدا، بۆتە هۆی زیان گەیاندن بە لەوەڕگاکان و کەمبوونەوەی ڕووەکی پەسەند و جووتیارەکانیشی ناچار کردووە ئاژەڵەکانیان هەرزانفرۆش بکەن، بۆ، یەکەی ئاژەڵی لە هەرسێ ناحیەکە لەو سەرژمێرییانەی بۆ ئاژەڵەکانی ناوچەکە کراوە لە سیانی یەکەمدا زیادی کردووە، بەڵام لە چوارەمدا کەمی کردووە، لە دوا سەرژمێری ساڵی (٢٠٠٨) دووبارە زیادی کردووە لەگەڵ ئەوەی ئەم ساڵە بە وشکەساڵ دانراو توانای لەوەڕگاکان و ڕێژەی سەوزبوونیان لە ناحیەی سەنتەر و ئاغجەلەر بریتی بووە لە (١٥٪) بۆ هەریەکەیان و لە (١٠٪) بۆ ناحیەی سەنگاو[٦٠]. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ڕێکخستن لەلایەن جووتیار و شوانکارەکان لە نێوان ژمارەی ئاژەڵ و توانای لەوەڕگاکان، ئەمەش کاریگەرییە خراپەکەی بەئاشکرا هەست پێدەکرێت لەسەر لەوەڕگاکان.

دووبارەبوونەوەی دیاردەی وشکەساڵی لەم چەند دەیەیەی دواییدا بۆتە هۆی کەمبوونەوەی گژوگیا لە ناوچەکە و کەمبوونەوەی ڕووبەری لەوەڕگاکان لە ڕووی چەندیی و چۆنییەوە، سەرەڕای زیادبوونی ژمارەی ئاژەڵەکان، بۆیە جووتیارەکانی ناچار کردووە پەنا ببەنە بەر لەوەڕاندنی پێشوەخت، کە بریتییە لە بەرەڵاکردنی ئاژەڵەکان لەناو لەوەڕگاکاندا پێش گەشەکردنی گژوگیاکان، کە دەبێتە هۆی تەواو نەکردنی خولی ژیانی ڕووەکەکان و فڕێدانی تۆوەکانیان و لەناوچوونی گژوگیا و دەوەنەکان، بەمەش ئەگەری دووبارە ڕواندنەوەیان لە ساڵی داهاتوودا کەم دەبێتەوەو ئەگەر ئەمەش چەند ساڵێك لەسەر یەك دووبارە بێتەوە بەدیاردەیەکی مەترسیدار دادەنرێت بۆ لەناوچوونی لەوەڕگاکان و سەرهەڵدانی دیاردەی بەبیابانبوون، باشترین کات بۆ لەوەڕاندن لە ناوچەی لێکۆڵینەوە سەرەتای مانگی ئادار تا ناوەڕاستی مانگی حوزەیرانە بەڵام بەهۆی کەمی باران و دواکەوتنی گەشەی ڕووەکەکان شوانکارەکان ناچار دەکات لە مانگەکانی پێشترەوە ئاژەڵەکان بخەنە ناو لەوەڕگاکان بەم کردارەش تەمەنی لەوەڕگاکان کورت دەبێت. ئەمانەی لەپێشەوە باسمان کرد بۆمان دەردەخات، کە دیاردەی بەبیابانبوون لە ناوچەی لێکۆڵینەوە بەگشتی بەهۆی لەوەڕاندنی بێ سەرپەرشتەوە زۆرە و بەپلەی یەکەم لە ناحیەی سەنگاو و دواتر لە ناحیەی سەنتەر و پاشان لە ناحیەی ئاغجەلەر.

**ناوچەی بەبیابانبوون بەهۆی نەمانی دارستانەکانەوە:**

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی کراوە لەسەر مێژووی نیشتەجێبوون و دارستان لە ناوچەکەدا، ئەوە دەسەلمێنێت، کە ئەم ناوچەیە هەزاران ساڵ پێش ئێستاو بەتایبەتی لە سەرەتای نیشتەجێبوونی مرۆڤ لە ناوچەکەدا پەنایان بردۆتە بەر کشتوکاڵ، وە ناوچەکە زۆر دەوڵەمەند بووە بەدارستان بەڵام لە ئەنجامی بڕینەوەی دارەکان ئامادەکردنی زەوی بۆ کشتوکاڵ لە دوای

کەمبوونەوەی پیتی خاکەکە و گواستنەوەیان بۆ سەر پارچە زەوییەکی تر، وای کردووە بەشێکی زۆر لە دارستانەکان لەناوبچن[٦١]. وەئەمڕۆ ڕووبەرێکی کەم لەو دارستانانە ماوەتەوە، دەکاتە (٧,١٪) ڕووبەری گشتی ناوچەکە، ئەم ڕێژە کەمەش بەپێی چڕییان جیاوازە دابەش دەکرێن بۆ دارستانی (چڕ و مامناوەندی و کراوە ) وەکەمترین ڕووبەر بریتییە لە دارستانی چڕ و زۆرترین ڕووبەر بریتییە لە دارستانی کراوە و ئەم ڕێژەیەش ساڵ بەساڵ لە گۆڕاندایە بەرەو کەمبوونەوە، لە ئەنجامی پلان و بەرنامەڕێژی ڕژێمی پێشووی بەغداو بڕینەوەی داری دارستانەکان لەلایەن گوندنشینەکانەوە بۆ خۆپاراستن لە سەرمای زستان و پێویستی ناوماڵ، ئەم سیاسەتە تائێستا بەردەوامە، بەهۆی کەمی نەوت لە هەرێمی کوردستان بەگشتی و نەگەیاندنی بەگوندنشینەکان بەتایبەتی، لە ساڵانی ڕابردوودا ڕێژەیەکی زۆر لە دارستانەکانی کوردستان بەمەبەستی سیاسی و سەربازی سووتاوە، بۆنموونە تەنیا لەساڵی (١٩٧٦-١٩٧٧)دا ڕووبەری ئەو دارستانانەی لە هەرێمی کوردستان سووتاوە، دەگاتە (٥٤٨٨٢) دۆنم[٦٢]، کە بەشێکی زۆری لە ناوچە نیمچە شاخاوییەکان بووە.

ڕووبەری دارستانەکان بەپێی ناحیەکانیش هەر لە کەمبوونەوەدایە، بۆ نموونە ڕووبەری دارستانی چڕ لە ناحیەی ئاغجەلەر هەر بەتەواوی نەماوەو دارستانە چڕەکان گۆڕاون بۆ دارستانی مامناوەندی و دارستانی مامناوەندی گۆڕاون بۆ دارستانی کراوە، دارستانە کراوەکانیش بەشێکی زۆری نەماوە بەتایبەتی لەدوای ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)، بەهۆی پێویستی بەخۆراك و دانەوێڵە، دارستانەکانی پێدەشت و قەدپاڵەکان بڕدرانەوەو دارەکان بەکارهێنران وەك سووتەمەنی و زەوییەکانیش بەکارهێنران بۆ کشتوکاڵ و لەبەر کەمی توانای بەرهەم وازیان لێ هێنان، لە ئەنجامدا کرداری ڕامالین لەسەری خێرا بوو، بووەتە هۆی سەرهەڵدانی دیاردەی بەبیابان، وەك لە بەشی دووەم باسمان کرد لە هەر دوو ناحیەی سەتتەر و سەنگاویش ڕووبەرێکی زۆر کەم لە دارستانی چڕی ماوەتەوە، کە ساڵ بەساڵیش دارستانە کراوەکان کەم دەبنەوەو دارستانی مامناوەندیش لەسەر حسابی دارستانی چڕ زیاد دەکات.

بۆ چارەسەری کەمبوونەوەی دارستان لە ناوچەکە وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری پەنای بردووە بۆ دروستکردنی دارستانی دەستکرد، چەند ڕووبەرێکی بەرفراوانیان تەرخان کردووە بۆ دارستان و باخ، بەڵام بەشێکی زۆری لەو دارستانانەش لەناوچوون، دیارە تەنیا لە باخی ناوچەی بانی مەقان، کە ڕووبەرەکەی (٧٥٠ دۆنمە) ڕێژەی (٧٥٪) دارەکانی فەوتاوە، لە باخی ناوچەی شیوە سوور ڕێژەی (٢٥٪)ی دارەکانی فەوتاوە[٦٣]، زۆرتر لە ئەنجامی کەمتەرخەمی و وشکەساڵییەوە بووە، ڕووبەری (٧٠) دۆنم لە دارستانی دەستکرد (سنەوبەری) لە باکووری

ڕۆژئاوای شاری سەنگاو دامەزراوە، بەڵام ڕێژەی (٥٠٪)ی فەوتاوە بەهۆی کاری سەربازی و سەربازگەکان لەو ناوچەیە لە ساڵی (١٩٨٨)[٦٤]، ڕێژەی ئەو دارستانە دەستکردانەی لە ناوچەکە چاندراوە، دەکاتە (٢٧٣٨) دۆنم زۆر لەوەکەمترە بتوانێت قەرەبووی ئەو دارستانە لەناوچووانە بکاتەوە.

**سێیەم/ ناوچەی بەبیابانبوون بەهۆی شۆرەکاتەوە:**

شۆرەکات یەکێکە لە شێوە مەترسیدارەکانی دیاردەی بەبیابانبوون، بەڵام ئەم شێوەیە لە ناوچەی لێکۆڵینەوە زۆر کەمەو تەنیا لە چەند ناوچەیەکی بچووك و سنووردار بەپلەی لاواز و مامناوەندی دەردەکەوێت، بەهۆی کەمی خوێی تواوەی ناو ڕووبارەکان هەلومەرجی ئاووهەوایی و ڕووی زەوی یارمەتیدەرە بۆ کەمی کەڵەکەبوونی خوێ لەناو زەوییە کشتوکاڵییەکاندا.

لە ئەنجامی پەیڕەویکردنی شێوازی ئاودێری کۆن و تەقلیدی لە ناوچەکە بە ڕژاندنی بڕێکی زۆر لە ئاو بۆ ناو زەوییە بەراوەکان و نەبوونی ئاوداشتنی باش دەبێتە هۆی تێکچوونی هاوسەنگی زەوی، بەردانەوەی ئاوی زۆر لە ناوچەی نیمچە وشکدا بەهۆی زۆری کرداری بەهەڵمبوون بەتایبەتی لە وەرزی هاویندا لەناو کێڵگەکاندا دەبێتە هۆی مانەوەی خوێ لەناو خاکدا.

زۆربوونی خوێی سۆدیوم بەتایبەتی لە زەوییەکدا کە ڕەگەزی کالیسیومی کەم بێت، دەبێتە هۆی تفتی (قلویە) خاك کاریگەری لەسەر پێکهاتەی خاك و کەمبوونەوەی کونیلەداری (نفاذیة) هەیە[٦٥].

ئەو مەترسی ژینگەییانەی پەیوەستە بەئاودێری و ئاوداشتن لەگەڵ دابەزینی جۆری ئەو ئاوەی بۆ ئاودێری بەکاردەهێنرێت زیاد دەکات، بەتایبەتی ئەو ڕووبارانەی ڕێژەی خوێی تواوەی لە (ppm/٢٠٠٠) زیاترە، بەپلەی یەکەم وەك ڕووبارەکانی سەفیە خنکاو و دەرزیلە، ئەو ڕووبارانەی ڕێژەی خوێی لە (ppm/٨٠٠) زیاترە بەپلەی دووەم وەك ڕووبارەکانی (چەمی بایز و عەلی مەنسوورو فەقێ حاجی).(نەخشەی ٤)

گرنگترین ئەو ناوچانەی، کە دیاردەی شۆرەکاتی لێیە زیاتر ئەو زەوییە بەراوانە دەگرێتەوە، کە بەئاوی ئەو ڕووبارانە ئاو دەدرێت، کە ڕێژەی خوێی تواوەیان زۆرە وەك:

١- ئەو زەوییە بەراوانەی کەوتۆتە بەر ئاوی ڕووباری سەفیە خنکاو، دەکاتە (٢٠٠٠) دۆنم.

٢- زەوییە بەراوەکانی بەر ڕووباری دەرزیلە، دەکاتە (٧٥٠) دۆنم.

